پراتاپ چاترچی



# عێراق وەك كۆمپانیاێكی وەبەرهێنان، داگیركردنێكی قازانج بەخش

وەرگێڕانی

ئەیاد خالید

پراتاپ چاترچی

# عێراق وەك كۆمپانیایەكی وەبەرهێنان، داگیركردنێكی قازانج بەخش

وەرگێڕانی
ئەیاد خالد



حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی ڕۆشنبیری

بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێران

xaneywergeran@hotmail.com

- ناوی کتێب: عێراق وەک کۆمپانیایەکی وەبەرهێنان، داگیرکردنێکی قازانج بەخش
- نووسەر: پراتاپ چاترجی
- وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە: ئەمیاد خالد
- بابەت: سیاسی
- پیتچنین: ئەمیاد خالد
- هەڵەبڕی: تریفە محەممەد
- دیزاینی ناوەڕۆک: زانا کەمال
- بەرگ: ئارام عەلی
- تیراژ: ٧٥٠
- زنجیرە: ٢٦١
- چاپخانە: سەردەم
- چاپ: چاپی یەکەم
- ژمارەی سپاردن: (١٨٦١) ساڵی (٢٠٠٩)

# پێڕست

# پێشەکی

لەوەتەی مرۆڤ هەیە، شەڕو ململانێ لە سەر بەدەستهێنانی بەرژەوەندیەکانو سەپاندنی بیروڕا هەبووە. بە زانینی ئەوەشی کە ئاکامی ئەو شەڕە، لادان و رووخاندنی درندەترینو داپلۆسێنەرترین رژێمو دەسەلات بووە لە مێژووی هاوچەرخدا، بەلام ئەوەی لەو کتێبەدا باسی لێوە دەکرێت، دەکەوێتە خانەی شەڕ لە پێناو بەرژەوەندییەکان.

بێگومان ناونیشانی سەرەکی شەڕەکە بە دروشمی قەبەو داکۆکیکار لە بەرژەوەندیو مافەکانی میللەتانی عێراق دەستی پێکرد وەکو ئامادەکارییەك بۆ گردکردنەوەو راکێشانی لایەنگیری بۆ جەنگو پێدانی شەرعیەت. ئەوە ئەو دیوەیەتی کە رەنگبێ زۆربەی خەلکی عێراق باوەڕیان پێی هێنابووبێو پشتگیریان کردبێ بەوەی لە ژێر دەسەلاتو چنگی رژێمێکی سەرکوتکاری وەك رژێمی بەعس رزگاریان دەبێت.

ئێمەش لە کوردستان چ لەسەر ئاستی سەرکردایەتی یا لەسەر ئاستی میللی، رەنگبێ پشتگیرییەکی سەد دەر سەدی پرۆسەکەمان کردبێت. بەلام لەگەڵ دیوە رووکەشو رزگاریکارەکانی شەڕەکە، دیوێکی تریش هەبووە کە پالنەری سەرەکی ئەمریکا بوو بۆ ئەنجامدانی شەڕێك لە دووری هەزارەها میل لە خۆیەوە. ئەویش زامنکردنی بەرژەوەندییەکانێتی. لێرە لەڕێی ئەو کتێبەوە دەچینە نێو قوولایی وردەکارییەکان، ئەوەش لەرێگای لێکۆلینەوەیەکی رۆژنامەوانی بۆ بەدواداچوونی ئەو هۆکار و فاکتەرانەی وایان لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد راستەوخۆ بێتە ناو ئەو

ململانێیه. بۆیه هەر كه ئەو كتێبەم بینی لەلای كاك رێبین رەسوڵ نووسەر و رۆژنامەوان، كه ئەو كۆپییەی له شاری هەولێر دوو ساڵ لەمەوبەر لەلای خودی نووسەری كتێبكەوە پێشكەشكرابوو لە میانەی چاوپێكەوتنێكی لەگەڵیدا، كە نووسەر بە ئەركێكی تایبەتی بەدواداچوونو لێكۆڵینەوەی رۆژنامەوانی له بارودۆخ و هەلومەرجی سیاسی و ئابووری هەرێم، سەردانی كوردستانی كردبوو، گوایە بە نیازە لەو بارەیەوەش كتێبێك دەربكات، هەستمكرد پێویستە ئەو كتێبە وەربگێڕدرێتە سەر زمانی كوردی، بۆ ئەوەی بەلانی كەم خوێنەری كورد دیوەكەی تری ئەو پرسەش ببینێت كە ئەمریكا لەو شەڕەدا هەوڵی بۆ داوە.

ناوەڕۆكی كتێبەكە باسی نزیكەی ساڵو نیوێك دوای شەڕەكە دەكات، بۆیە ئەمڕۆ هەلومەرجەكە گۆڕانكارییەكی زۆری بەسەردا هاتووە، چ لە رووی سیاسی، چ ئابووری، چ كۆمەڵایەتی، هەروەها لەڕووی ئەمنیشەوە بە بەراورد لەگەڵ ئەو كاتە گۆڕانی گەورە هەیە، بەڵام لە كۆتاییدا راستی ئەو بەسەرهاتانەی كتێبەكە لەخۆی گرتوون واقعێكن  روویانداوە، بۆیە پێم وایە پێویستە بیانزانینو بەسەریان دابچینەوە بۆ ئەوەی گەر هیچ نەبێت ئەوا لێیان فێربین كە سیاسەت رەهەندی دوورتری هەیە لەوەی لە رووكەشدا دەردەكەوێ و گەمەیەكە بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەكان، زیاتر لەوەی هەوڵ بێت بۆ پاراستنی مافەكان.

تێگەیشتن لەو پرەنسیپە بۆ ئێمەی كورد پێویستە، چونكە بە درێژایی مێژوو بەردەوام دۆڕاوی ئەو گەمە سیاسییانە بووینو ئێستاكەش هەستێكی گشتی هەیە بەوەی كورد بەتایبەتی لەسەر ئاستە سیاسییەكەی هێشتا فێری ئەو گەمەیە نەبووە.

**ئەیاد خالد – هەولێر**

**٢٠٠٩/١/١٢**

# دەروازە

رۆژی ٩ی نیسانی ساڵی ٢٠٠٤ە، لەسەر هەر منارەیەك نیشانگرێك هەیە، لەسەری هەرکۆلانێك کە دەچوو بۆ مزگەوتەکە چەکدارێك وەستاوە، لەسەری هەر کۆلانێکی نزیك شیراتۆنیش تانکێکی لێیە. لە یەکەم ساڵڕۆژی ئازاد کردنی عێراقدا شەقامەکان چۆڵن، چوار گەڕەکی شاری بەغداش، شەڕو پێکدادانی توونــدی تێدایــە، مارینزەکــان چــوار دەورەی فەللوجــەیان داوەو سوپاکەی موقتەدا سەدریش چەند شارێکی باشووری عێراقیان کۆنتڕۆڵ کردووە.

بە نێو پێچو پەنای ناوچەی هۆتێلەکەداو بە ناو ئەو تەلە دڕکاویە لولانەدا کە بە سێ ریز دانرابوون تێپەڕیم، هامفیەکانیش بە کەناری دیجلەدا بە خێرایی دەهاتن دەچوون. لە تەنیشتی ڕێگەکەش کۆمەڵێك سەربازی ئەمەریکی بە ماتەمات بە سەر گیای قەراغ ڕێگەکەدا دەڕۆیشتن، وەك بڵێی لەفلیمێکی جەنگیەوە فێری شەڕ بووبن. هەر لەگەڵ گەیشتنم بۆ مزگەوتەکە، چوومە ریزی دوورو درێژی نوێژکەرەکان کە بۆ پشکنین وەستابوون، لێرە دوو ئەوەندەی هەر خاڵێکی تری ئەمریکیەکان پشکنینی ووردتر ئەنجام دەدرا. لە ناکاو ئۆتۆمبێلێك دەرکەوت و ئەو کۆمەڵە نوێژکەرەی کە بۆ نوێژی جومعە کۆببوونەوەو منیشی تیابوو کەوتینە بەشی دواوەی قەرەباڵغیەکە. هاوارمان کرد"ڕۆژنامەنووسین، ڕۆژنامەنووس" ئەو وشە سیحریەی وای لە سیماکان دەکرد بە زەردەخەنەوە پێشوازیت لێبکەن.

جگە لە پەیامنێرەکانی هەردوو کەناڵی ناوداری عەرەبی، ئەلجەزیرەو

ئەلعەرەبیەو منیش رۆژنامەنووسی تری لێنەبوو. نە CNN و نە BBC تەنیا وێنەگرێکی سپی پێست نەبێت. بە نارەحەت، شوێنێکم دۆزیەوە لەسەر دیوارێك لە بەردەم گۆماوێکدا، ترسی ئەوەشم هەبوو کەخۆم و کامێراو کەلوپەلەکانم بکەوینە نێو ئاوی سەوزهەڵگراوی گۆماوەکە.

هەر کە ئیمامەکە تەواو بوو، دەیان هەزار لە نوێژکەر لە مزگەوتی ئوم قورا (ام القرى)، کە گەورەترین مزگەوتی سوونەکانە لە شاری بەغدا هاتنە دەرەوەو منیش خۆم خزاندە دەرەوەی ئاپۆڕای خەڵکەکەو بە سەر ئۆتۆمبێلێکدا هەڵگرام بە جۆرێك تەواوی دەروازەی مزگەوتەکەم لێ دیاربوو- لەوەش دەچوو باشترین شوێنی بینین بووبێ بۆ ئەو دەوروبەرە. سێ هەرزەکار پێچکە (ستاند)ـی کامێراکەیان بۆ گرتبووم و یەکێکی دیکەش مایکرۆفۆنەکەی بە دەستەوە بوو.

لە بەردەممدا ئاڵایەکی ئەمەریکی بەدەرکەوت و هاوارێك لە ناو خەڵکەکە بەرز بۆوە، کە دواتر فلیمەکەم لێدایەوە، دیمەنەکە لە شەڕی نێوان شەقاوەکان دەچوو. کۆمەڵێك لاوی هەڵچوو ئاڵاکەیان دەدڕاندو دوایش گڕیان تێبەردا. هاوکاتیش بە مەبەستی تۆقاندنی سەربازە ئەمەریکاییەکان هاواریان دەکرد "بژی بژی موقتەدا". لەم مزگەوتەدا کە هی سوونەکان بوو، هەموویان بە دەنگی بەرز هوتافیان بۆ سەرکردە ئایینیە توندڕەوەکەی شیعە دەکێشا.

لە هەر لایەکی ئاپۆڕاکە، گەنجێك دەردەکەوت و بۆ خەڵکەکە هاواری دەکرد " جیهاد، جیهاد" و ئەوانیش وەڵامی هوتافەکەیان دەدایەوە. خواردن و نەوت و ئاو لە گشت لایەکی مزگەوتەکەدا کۆکرابوونەوە بە مەبەستی ناردنیان بۆ موجاهیدەکان و لە دەروازەی مزگەوتەکەشدا توورەگەی سپی پڕ لە پارە کەڵەکە کرابوو تا بۆ بەرگریکارەکان بنێردرێت، یەکێك لە چاودێرەکان وتی: " ڕاپەڕینی عێراقیەکان دەستی پێکرد" ١.

دواتر گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم کە لە نهۆمی شەشەمی هۆتێلی فەنار دابوو. سێ ژوور لەولای منەوە گەنجێك بە ناوی "نیکۆلاس بێرگ" لەسەر مێزێکی خڕی شوشەیی لەگەڵ هاوسێکەم "ئەندریۆ رۆبەرت دیوك" بە یەکەوە دانیشتبوون و بیرەیان دەخواردەوە. نیکۆلاس بەیانی رۆژی دواتر هۆتێلەکەی جێهێشت و رۆیشت. ناوبراو رۆژێك بەر لە من گەیشتبووە ئەوێ و وەکو منیش لە باکوورەوە هاتبوو. ئەو کە رۆیشت، هێشتا چوار رۆژی لە هۆتێلەکەدا تەواو نەکردبوو، ئیتر جارێکی تر کەس بە زندوویی نەیبینیەوە. پاش مانگێك، تەرمەکەی بە سەربڕاوەیی لەسەر ڕێگایەکی دەرەکی دۆزرایەوە. ٢

بێرگ بە هەموو پێوەرەکان کەسێکی نموونەیی بوو، خوازیار بوو یارمەتی عێراقیەکان بداتو لەو میانەیەشدا هەندێك پارە وەلاوە بنێت. بەلاّم بەداخەوە ئەو لە کاتێکی نەگونجا و شوێنێکی نەگونجاو بوو، بەشێکی سەربوردەکەشی هاوشێوەی سەربوردەی ئەو هەزارەها ئەمریکاییە جدییانەیە کە ئێستا لە عێراقدا دەژین، هەروەها وەك هی ئەو دەیان هەزار سەربازەش کە بێ ویستی خۆیان فرمانیان پێکراوە پاسەوانییان بکەن، لە کاتێکدا کاربەدەستانی واشنتۆن گرەویان لەسەر سەرگرتنی ئەو ئەزموونە ئابووری و سیاسیە دەکرد، لە ئەنجامیشدا سەرکەوتوو نەبوون لە بەدیهێنانی ئەو بەڵێنانەی کە دابوویان. بێگومان بە هۆی بڕواپێکردنی نەخشەداڕێژەکانی پلانەکەش قسەو بەڵێنی زۆریان دابوو. بێ گوێدانە نارەزایی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، بڕیاری بەرپاکردنی شەڕ درا، ئیدارەی ئەمریکیش پەیمانی دا هەموو رەخنەو دیدو بۆچوونی عێراقیەکان لەمەڕ داگیرکردنی وڵاتەکەیان، بگۆڕێ بۆ چەمکی ئازادکردن.

دوو هەفتە بەر لە یەکەم یادکردنەوەی ئازادی عێراق، پۆل برێمەر وتارێکی پیاهەڵگوتنی لە بەردەم ئەنجوومەنی پارێزگای بەغدا سەبارەت بە

**باردۆخی وڵاتەکە خوێندەوە:**

**"لە کاتی ئازاد کردنیدا، ئەم وڵاتە مەزنە روو لە داڕمان بوو، نەوەك بەهۆی شەڕ یان داگیرکردن، بەڵکو بە هۆی چل ساڵ لەچڵێسی و زەبری دەسەڵاتدارەکانیەوە. سەدام و دارو دەستەکەی لە بری کارکردن بۆ ئاوەدانکرنەوەو بووژاندنەوەی عێراق، سامانە نەتەوەییەکەیان دەدزی و بەفیڕۆدەدا. سەدام لە جیاتی خزمەتکردنی گەلەکەی، بێبەشی دەکردن لە خزمەتگوزاریە سەرەکیەکان. لە سەروبەندی ئازادکردنیدا، کارەباو ئاوو ئاوەڕۆکان و قوتابخانەو خزمەتگوزاریەکانیش هەموو وێران بوون، تەنانەت پۆلیسێکیش لەسەر کارەکەی نەمابوو، سوپاش بوونی نەما.**

**بەڵام دوای تێپەڕبوونی ساڵێك لە پرۆسەی ئازاد کردن، با بزانین چ جۆرە گۆڕانکاریەك بەدی هاتووە:**

- ***ئەمرۆ زیاتر لە ۲۰۰۰۰۰ کەس لە نێو هێزەکانی ئاسایشدا لە پێناو پاراستنی عێراق و گەلەکەی و ژێرخانە ئابووریەکەیدا خزمەت دەکەن.***
- ***ئەمرۆ عێراق توانای بەرهەمهێنانی کارەبای زیاتری هەیە وەکو بەر لە ئازادکردنەکە. زیاتریش بە رێوەیە.***
- ***هێزی هاوپەیمانەکان زیاتر لە ۲۵۰۰ قوتابخانەیان نۆژەن کردۆتەوە.***
- ***زیاتر لە ۳۰۰۰۰۰۰ منداڵی عێراقی خوار تەمەنی پێنج ساڵی لە دژی ئیفلیجی منداڵ و نەخۆشیەکانی دیکە کوتراون.***
- ***هێزی هاوپەیمانەکان خەرجی چاودێری تەندروستی زیادکردووە بۆ سی جار ئەوەندەی پێشوترو زیاتریش دەکات.***
- ***لە مانگی ئایارەوە، لەسەرتاسەری عێراقدا، هێزی هاوپەیمانەکان نزیکەی هەژدەهەزار پرۆژەی بچووکیان بۆ خەڵکی ئەنجامداوە.***
- ***ئاستی ئابووری لە گەشەکردن دایەو پێوەرەکانیش ئاماژە بەوە دەدەن کەوا رادەی بێکاری نزمتر بۆتەوە بۆ نیوەی رێژەکەی لە کاتی***

*پرۆسەی ئازادیکردن و ڕەنگە زۆر نزمتریش بێت بە بەراورد لەگەڵ پێش شەڕەکەدا.*

- *بەهای دراوی تازەی عێراقی بە ڕێژەی ٢٩٪ بەرزبۆتەوە لە ماوەی ئەو چەند مانگە کەمەدا کە تێیدا لە چاپ دراوە.*
- *ئەمڕۆ زیاتر لە یەك ملیۆن عێراقی سوود لە خزمەتگوزاری تەلەفون وەردەگرن و زیاتریشە بە بەراورد لەگەڵ کاتی پێش شەڕ. ئەم ژمارەیەش لە زیادبوونە بە ڕاددەی ١٥٠٠٠ لە هەفتەیەکدا.*
- *عێراق دووبارە ئەندامێتی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بۆ گەڕایەوە و بە شێوەیەکی ڕۆتینیش بوویەوە ئەندام لە یەکێتی وڵاتانی عەرەبیو نەتەوە یەکگرتووەکانو بانکی نێودەوڵەتی و هەروەها سندوقی دراوی نێودەوڵەتیش.*
- *لەوەش زیاترو لەو بوارەشی کە بەخۆشحاڵیەوە ڕایدەگەیەنم ئەوەیە، دوای ئەنجامدانی زیاتر لە ٥٠٠ هەڵبژاردن لە نێو یانە وەرزشیەکان لەسەرتاسەری وڵاتدا، عێراق دووبارە گەڕایەوە بۆ ئەندامێتی لیژنەی ئۆلۆمپی نێودەوڵەتی، هاوینی ئەمساڵیش وەرزشوانە عێراقیەکان لە ژێر ئاڵای عێراقداو لە ئەتینای پایتەختی یۆنان، بشداری لە یاریەکانی ئۆلۆمپیدا دەکەن.*

بەلاَم گرنگترینو دیارترینی دەسکەوتەکان، لە بواری سیاسی دایە، ئەویش بریتیە لە هاتنەدی سیستەمێکی دیموکراسی لە چوارچێوەی نیشتمانێکی یەکگرتوو و ئاشتیخواز لەگەڵ وڵاتانی دراوسێی. ٣

لەناو شەقامەکانی بەغداشدا، کە بەرۆژ لەبەر نەبوونی پۆلیسی هاتوچۆ، تووشی قەرەباڵغی و خنکاندن دەبنەوە، بەشەویش لەبەر نەبوونی کارەبا دەکەونە نێو تاریکایی. بەردەوامیش خۆڵ و خاشاك گشت شوێنێکی داپۆشیوە، بۆیە بەلامەوە سەیر بوو کە چۆن دەکرێت جیاوازیەکی ئاوا

بنەڕەتی هەبێت لە نێوان دیدی منو برێمەر بۆ بارودۆخی عێراق.

هەر کەسێك بە ووردی سەیری شتەکان بکات یاخود چاوێك بە شەقامەکان دا بخشێنێت، ئەوا تێبینی کرچ و کاڵی لە گوتاری کاربەدەستانی هێزی داگیرکەردا دەکات. بە پێی راپۆرتە فەرمیەکان، ئیدارەکە هەرەسی هێناوە لەبەر کەم و کوڕی ئیلتیزاماتە دیاریکراوەکانی کەوا برێمەر لە بەردەم ئەنجومەنی پارێزگای بەغدا دەیگوتنەوە. لە دانیشتنێکی گوێگرتنی ئەنجام دراو لەلایەن لێژنەی یاسادانانی دیاریکردنی تێچوەکان House Appropriations Committee لە کۆتایی نیسانی ٢٠٠٤دا، دەرکەوت لە کۆی ١٨,٤ ملیار دۆلار لە بودجەی تەرخانکراوی ساڵی ٢٠٠٣دا بۆ دووبارە ئاوەدانکردنەوەی عێراق، تەنیا کەمتر لە ٥٪ ئەو بڕە پارەیە خەرج کراوە. (کاتێکیش قسەم لەگەڵ "لوك زەهنار" کاربەدەستێکی دەزگای ولاتە یەکگرتووەکان بۆ پەرەپێدانی نێودەوڵەتیUSAID کرد، ناوبراو راپۆرتەکەی بەدرۆخستەوەو گوتی هەر تەنیا دەزگاکەی ئەو بڕی ١,٥ ملیار دۆلاری خەرج کردووە – کە دەکاتە کەمتر لە ٨٪ کۆی پارەی ئاماژە پێکراو لەسەرەوە). لە کۆی ٢,٣ ملیار دۆلاری تەرخان کراو بۆ پرۆژەکان لەوەتەی ٢٤ ئاداری ٢٠٠٤دا، تەنیا یەك ملیار دۆلار خەرج کرا. ٤

وردەکاری شەرم ئاوەرتریش هەبوون: کاربەدەستانی داگیرکەر دەسکاری بڕی ١٨٤ ملیۆن دۆلاریان کرد، کە لە بنەڕەتدا بۆ پرۆژەکانی ئاوی خواردنەوە تەرخان کرابوو، خەرج کرا بۆ کار و چالاکیەکانی باڵیۆزخانە نوێیەکەی ولاتە یەکگرتووەکان، لە کاتێکدا ٢٩ ملیۆن دۆلار لە پارەی پرۆژەکانی وەك "بلاوکردنەوەی دیموکراسیەت" راکێشرا بۆ تێچووەکانی کارگێڕی.

لەو ٢٧٩ ملیۆن دۆلارەش کە تەرخان کرابوو بۆ پرۆژەکانی وەك ئاودێری، هیچی خەرج نەکرا، هەروەها ئەو ١٥٢ ملیۆن دۆلارەش کە تەرخان کرابوو بۆ چاککردنەوەو دروستکردنی بەنداوەکان. دەسەلاتی داگیرکەریش

بـڕی ٢٤٠ ملیـۆن دۆلاری وەلاوەنـا بـۆ چـاك کردنـەوەی ڕێگاوبـان و پردەکـان، کەچی تەنیا ٢٠ ملیۆن دۆلاری لێ خەرج کرا. ٥

لە ڕاپۆرتێکی تری نووسینگەی بـەڕێوەبردنی پرۆگرامـەکانی پێنتـاگۆن لە بەغدا، کە لە ناوەڕاستی ئاياری ٢٠٠٤دا دەرچووە، هـاتووە کـە تـەنیا ٢٤,١٧٩ عێراقـی لەسـەر پرۆژەکـانی ئاوەدانکردنـەوە دامـەزرێنراون، ئـەم ڕێژەیـەش کەمترە لە ١٪ هێـزی کـاری عێراقـی کـەخۆی لـە حـەوت ملیـۆن کـەس دەدات. هـەروەها تـەنیا یـەك لەسـەر چواری کارمەنـدەکانی کۆمپانیـای هـالیبێرتۆن عێراقین، کە ژمارەیان دەگاتە بیست‌وچوار هـەزار کارمەنـد. لـە نووسـینێکی "مات کێلی" پەیامنێری ئاسیۆشیەتد پرێسدا هاتووە: "عێراقیـەکان دووجـار بە خۆیان دادەچنەوە بەرلەوەی بیرلە کارکردن لەلای ئەمریکیەکان بکەنەوە، بە هۆی ئەو توندوتیژیەی کە هەیە. چونکە ئەو توندو تیژیە تەنیا سەربازە ئەمریکاییەکانی نەگرتۆتـەوە بـەڵکو ئـەو عێراقیانەشـی کـەوا کاریـان لەگـەڵ دەکەن. شەڕو پێکدادانەکانی ئەو دواییانەش، کۆسپیان تەنیا لەبەردەم پرۆژە هەنووکەییـەکان دروسـت نـەکردووە، بـەڵکو ڕێگـریش بـوون لەبـەردەم هەوڵـەکانی ئاینـدە، بـەوەی بوونەتـە هـۆی دواکـەوتنی گەیـشتنی کەلوپـەل و توانا مرۆییەکانی هاوپەیمانان." ٦

بەڵام دەسەڵاتدارانی داگیرکـەر هـەر سورن لەسـەر خستنەڕووی هەواڵـە پۆزەتیڤـەکانی وەك ئامـارە بـەرزو بـێ وێنـەکانی بەگەڕخـستنی هێـزی کـار. "تۆمـاس فـۆلی" دەسـتەی کارمەنـدانی برێمـەر، بـەر لـەوەی دەسـتی لـەکار بکێـشێتەوە گوتبـووی: "وەزارەتـی پلانـدانانی عێراقـی ڕایگەیانـدبوو کـەوا ڕێـژەی بێکـاری لـە عێـراق دەگاتـە ٢٨٪، ئـەو ڕێژەیـەش هاوڕێکـە لەگـەڵ دوو ڕێژەی تری ڕاگەینراو لەلایەن دەسەڵاتە کاتیەکەی هاوپەیمانەکان CPA کە گوایە ڕاددەی بێکاری بە ٢٠-٢٩٪ دەخەمڵێنێت. ئەگەر چی ئەم ڕێژەیە هێشتا هەر بەرزە، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوودا باشترە. لەوەش دەچێت بەرەو

ئاڕاستەیەکی باشتریش بڕوات." ٧ گەر بێتوو ئەو ڕێژمیە بەراورد بکەین لەگەڵ ڕێژەیەکی تری راگەیەنراو بەر لە شەش مانگ لەلایەن وەزارەتی کاری عێراقییەوە، ئەوا ڕێژەی بێکاری ئەو کاتە لە نێو خەڵکی عێراقدا گەیشتبووە ٧٠٪.٨ ئەی باشە سەرچاوەی ئەو ئیش‌و کارە تازەو شاراوانەی کەوا فۆڵی ئاماژەی بە ڕێژەکەی دەکات لە کوێ بەدەرکەوتن، کاتێک کە هێزەکانی داگیرکەر سەرچاوەیەکی سەرەکی بەکارخستنی عێراقیەکان نین؟

"نیتا لۆیی" کاربەدەستێکی پایەبەرزی دیموکراتەکانە لە لقەلیژنەی یاسادانانی دیاریکردنی تێچووەکانی کردەو چالاکیە بیانییەکان، گوتی:" دەکرێ زیادبوونی ژمارەی ئەو عێراقیانەی کەوا باوەڕیان بە نیازە باشەکانی ئێمە نەماوە، وەکو پێوەرێك سەیر بکرێت لەسەر کەمی ڕێژەی ئەو عێراقیانەی سوودمەندن لە کارەکانی ئاوەدانکردنەوە. بۆیە پێویستە ژمارەیەکی زۆرتری هاوڵاتی عێراقی سوودمەند بن لە هەوڵەکانی ئاوەدانکردنەوە." ٩

باشە هەڵەکە لە کوێدایە؟

لە سێ ساڵی ڕابردوودا چوار جار سەردانی ناوچەکەم کردووە، تەنیا بۆ ئەوەی بگەمە راستیەکان.

هەر دوای چەند رۆژێك لە داگیرکردنی بەغدا، هەزارەها بەڵێندەری ناوخۆیی و بیانی ئەوانەی بۆ کۆمپانیا نێودەوڵەتیەکان ئیش دەکەن، گرێبەستیان لەگەڵدا کرا بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکەو دامەزراندنی سیستەمێکی دیموکراسی وەکو دەسکەوت، کە ئەگەرێکی زۆر هەیە نرخەکەی لە سامانە نەوتیە زۆرو زەوەندەکەی عێراق بدرێت.

بەڵام نەوتیش وەکو چۆن پێشبینی دەکرا بە ئاسانی دەسەبەر ناکرێت، هەروەها کۆمپانیاکانیش سەرکەوتوو نەبوون لە بەجێگەیاندنی بەڵێنەکانیان، بۆیە لە ماوەی چەند مانگێکدا تێکچوونێکی خراپی باری

ئەمنی لێ کەوتەوە، کە بووە هۆی چاو تێبڕینی جۆرێکی تر لە بەرژەوەندی خوازەکان: کۆمپانیا ئەمنیە تایبەتیەکان، کە بە رادەیەکی زۆر بەرچاو دەکەوتن، لە میانەی دابینکردنیان بۆ خزمەتگوزاری ئەمنی بۆ خاوەن کارە تۆقیوەکان. لە هەمان کاتیشدا حکومەت و سوپای ئەمەریکی لە ترسی دابەزینی ورەی سەربازەکانیان، دەستیان کرد بە بەکرێگرتنی کۆمپانیای تایبەت بە دابینکردنی بەردەستو خزمەتگوزار بۆ ئەنجامدانی گشت کارە ئاست نزمەکان لە پاککردنەوەی تەوالیتەکانەوە بگرە تا پاسەوانیش، بەمەش توڕەیی‌و قینەی عێراقیەکان زیادی کرد، کە سێ لەسەر چواریان بێکاربوون.

کە قسەم لەگەڵ عێراقیەکان دەکرد، ئەو رۆژانەم دەهاتنەوە یاد، کە سەرقاڵی کۆکردنەوەو تۆمارکردنی ئەو دۆکیۆمێنتانە بووم کە باسیان لە کاریگەریی هەڵمەتەکەی ساڵی ١٨٤٩ی گەڕان بە دوای زێڕدا لە کالیفۆرنیا دەکرد بە سەر دانیشتوانە ئەسڵیەکانی ئەمریکا، هەروەها سەردانەکانم بۆ دارستانەکانی ئەمەزۆن و فلپین لە رۆژگاری ئێستاماندا کە هاوشێوەی ئەو سەردەمە بوو. هەستم کرد هەمان هەوەس مێشکی خەڵکی داگیر کردووە لە عێراق؛ لێرە گشت پێوەرەکان بۆ ئەو هەلپەرستانە رەخساوە کە نەخشەرێژی دەکەن بۆ بەدەست هێنانی سامان بە خێرایی، لە بەرانبەر خەمخۆریەکی کەمتر بۆ چارەنووسی خەڵك‌و ئایندەی وڵاتەکەش. لەگەڵ ئەوەش ئەمە تەنها لێکچوون نەبوو کە دەهات بە مێشکدا. چونکە کاتێك سەردانی بێرۆکراتە ئەمریکیەکانم کرد، لە کۆشکەکانی پێشووی سەدام‌و وەزارەتەکان‌و هۆتێلەکاندا، دەتگوت سەیری راپۆرتە هەواڵە سینەماییە کۆنەکانی تایبەت بە کۆلۆنیالیکەی هیندی بەریتانی دەکەم. هەر رۆژێکیش کە چاوم بە سەربازە ئەمریکاییەکان دەکەوت بە نێو شاردا دەسوڕانەوە بە سواری هامفیە پڕ چەککراوەکانیان بە نوێترین چەك‌و تەقەمەنی‌و تەکنۆلۆژیاوە، وامدەزانی لە ڤێتنامەکەی نیکسۆن دام.

بــە دوور لــە لێکــچوونە مێژوویــەکان، پــێم وایــە بــارودۆخی عێــراق حاڵەتێکی ناوازەیە بڕیاری ئەوەشی کە ئاخۆ لە کام لەو رووداوە هاوشێوانەی مێژوو دەچێت، بۆ ئێوەی خوێنەری جێ دەهێڵم.

# بەشی یەکەم
# ئۆپەراسیۆنی هەلقۆستنەوە لە عێراق

لـە یەکـەم رۆژی مـانگی ئایـاری سـاڵی ٢٠٠٣دا، جـۆرج بۆشـی سـەرۆکی ئـەمریکا، بـە فڕۆکەیـەك گەیـشتە سـەر کەشـتی USS Abraham Lincoln کە لە کەناری سان دیاگۆدا لەنگەری گرتبوو، بۆ پێشکەشکردنی وتارێك لەبـەردەم کۆمـەڵێك لـە ئامادەبووانـدا کـە لـە پشتیانەوە لافیتەیـەك هەڵواسـرابوو، لەسـەری نووسـرابوو (ئەرکەکـە بـەجێ گـەیەنرا Mission Accomplished). دوای سێ هەفتە، ئەندازیارو کاربەدەستانی کۆمپانیای بەکتل لە سان فرانسیسکۆ (کە یەکێکە لە گەورەترین کۆمپانیاکانی بیناسازی لە جیهاندا)، دەستیان کرد بـە رێگاخۆشـکردن لەبـەردەم ئـەو کۆمپانیایانـەی ئارەزوومەنـدی بەدەسـتهێنانی گرێبەسـتی قـازانج بەخـشن لـە کارەکـانی ئاوەدانکردنەوەی عێراق.

بۆ ئەو مەبەستەش سێ کۆبوونەوە ئەنجام درا، یەکەمیان بریتی بوو لە بەستنی کۆنفرانسی ئاوەدانکردنەوەی عێراق، لە ٢١ ئایار ٢٠٠٣دا لە باڵاخانەی رۆناڵد رێگان کە تەنیا شەقامێك لە کۆشکی سپی دوور بـوو. دوو رۆژ دواتـر، بـۆ هـەمان مەبەسـت کۆبوونـەوەی دووەم ئـەنجام درا، لـە ژێـر سەرپەرشـتی وەزارەتـی بازرگـانیو پیـشەسازی بـەریتانیا، لـە هـۆتێلی "نۆڤۆتێـل" لـە هامەرسمێس کە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای لەنـدەن. دوا کۆبوونـەوەش لە ٢٨ی هەمان مانگدا لە هۆتێلی شیراتۆن لە کوێت ئەنجام درا.

لە ماوەی سـاڵێکدا، واتـە لـە دەسـتپێکردنی ئـەو کۆبوونەوانـە تـا یەکـەم

یادکردنــــەوەی ســـاڵرۆژی رزگـــارکردنی عێـــراق، بـــەهای گرێبەســـتەکانی ئاوەدانکردنەوەی ئەو وڵاتە گەیشتە دەیەها ملیار دۆلار – ئەو چیرۆکەی کـە لــە پایتەختــەکانی بــەریتانیاو وڵاتــە یــەکگرتووەکانی ئــەمریکا دوورم دەخاتەوە، دەمبات بەرەو شەقامەکانی کەرکوك و بەغداو بەسرە.

سـێبەرە سـوورەکانی سـەر لمـی بیابـانی خـوارووی عێـراق شـەپۆلیان دەخــواردو دوکــەڵێکی رەنــگ خۆڵەمێــشیش تێکــەڵ بــە ئــاگرە رەنــگ پرتەقاڵیەکانی ئەو دوازدە دووکەڵکێشە لوولەییە دەبۆوە. دەنگیشی لە دەنگی مەکینەی فرۆکەیەکی گەورە دەچوو کە هەر سەد پێیەك لێتەوە دووربێت، هەرکـە چاویـشم دەبرِیـە گـرەی ئاگرەکـان هەسـتم دەکـرد پێـستی لەشـم دەسوتێ. بۆیە بەرەو دواوە گەرامەوەو دڵم بە رەنگی ئاسمان و کپی ئـەو نـاوە ئـارام بـۆوەو دەرفـەتێکیش بـوو بـۆ چاوەکانم تـاکو پـشوو بدەن بـەر لـەوەی دووبارە سەیری گرە سەرنج راکێشەکان بکەمەوە.

دواتـر لەگـەڵ "حامـد میـالا"، سەرپەرشـتی کۆمپانیـای نـەوتی باشـوور گەرامەوە. حامد ماوەی ٢٧ ساڵە لێرە لە کێڵگە نەوتیەکانی زوبێر کاردەکات. ئەو زۆر دڵخۆشە بەوەی لەسـەر کارەکـەی ماوەتـەوە دوای ئـەوەی رژێمەکـەی سەددام حوسێن لەلایەن سوپای ئـەمریکاوە لەسـەرەتای بـەهاری سـاڵی ٢٠٠٣دا رووخێنرا. لە دوای  داگیرکردنی عێراقیش مووچەی نـاوبراو زیـادی کـردووە بۆ نزیکەی ٢٠٠ دۆلار لە مانگێکدا، واتە پێنج ئەوەندەی ئەو مووچـەیەی کـە لەسەردەمی رژێمی بەعسدا وەری دەگرت.

ئەو ٢٠٠ دۆلارەی مووچەکەی بە یەکێك لەو مووچە بەرزانـە دادەنرێـت کـە بـە کارمەنـدێکی لۆکـاڵی دەدرێـت، ئـەوەش لـە ئـەنجامی ئـەو هـەوڵ و ململانێیـە دوورو درێژانـەدابوو کـە یـەکێتی کرێکـارانی عێـراق دابـووی، لـە پێنـاو هێـشتنەوەی کارمەنـدە عێراقیـەکان لەسـەر کارەکانیـان، چـونکە دەسەڵاتدارانی داگیرکەر بە کارخستنی کرێکاری بێگانەیان بە لاوە باشتر بوو،

سەرەڕای بەرزی کرێکانیان.

لەسەردانێکیشمدا بۆ ئەو تۆڕبینانەی کە نەوتیان لە بیرەکانەوە دەنارد بۆ بەندەری بەسرا، چاوم بە سێ کرێکاری هیندیو پاکستانی کەوت. بەدڵەکانیان رەنگی شینو دروشمی کۆمپانیای ئەلخەرافی لەسەر بوو، "ئەلخەرافی" کە کۆمپانیایێکی کوێتیەو گرێبەستی لاوەکی هەیە لەگەڵ کۆمپانیای " کیلۆگ براون ئەند روت KBR"، کە ئەویش سەر بە کۆمپانیای هالیبێرتۆنە. هالیبێرتۆن لە ساڵی ٢٠٠٣دا زنجیرەیەك گرێبەستی بەدەست هێنا هەر لە ئامادەکردنی خواردنو گەیاندنی پۆستەو دامەزراندنی بنکەی سەربازییەوە تا دەگات بە چاککردنەوەی پیشەسازی نەوتی لە عێراق، کۆی بەهای ئەو گرێبەستانە لەو ساڵەدا گەیشتە زیاتر لە ٨ ملیار دۆلار.

یەکێك لەو سێ کەسە ناوی"عبدالحکیم"بوو، کە شۆفێری کرێن بوو، لە شاری لاهوری پاکستانەوە هاتبوو، پێش دووانەکەی تر بۆ کارکردن هاتبووە کەنداوی فارسی. دوای دە ساڵ کارکردن لەوێ، ئینجا خۆیو هاوکارەکانی دەیانتوانی مانگی نزیکەی ١٥٠٠دۆلار پەیدا بکەن، واتە حەوت ئەوەندەی مووچەی کارمەندێکی عێراقی، ئەو دەڵێت:" کۆمپانیا شوێنی خەوتنو خواردنی دابین کردووەو هەموو رۆژێکیش لەو دیوی سنوورەوە دەمانگەیەنێتە ئێرە، هەموو ساڵێکیش دەتوانم سەردانی خێزانەکەم بکەم لەلاهوور. بۆیە ئەمە کارێکی زۆر باشە."

کە خەریکی قسەکردن بووین، دوو کرێکاری تری هیندیش هاتنە لامان، " سەنجای سینگ" و" ئیمان حەسان". ئەو دووانە، تەنها دوو ساڵ بوو لە کەنداو کاریان دەکرد و مانگانەکەیان ٥٥٠ دۆلار بوو. کاتی خۆی ئەمانە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری تەکنیکاری کارامە لە باشووری ئاسیاوە هێنرابوون بۆ رۆژهەلاتی ناوەڕاست. سەنجای دەڵێت:"زۆربەمان خەڵکی هیندستانینو رەنگە ژمارەمان لە کوێت بگاتە دە هەزار کەس، بەلام کرێکاری پاکستانیو

بەنگلادێشیو سریلانکیشمان لەگەڵ دایە."

دواتـر کێڵگـە نەوتیـەکانم جێهێـشت و چووم بـەرەو بەسـرا بـۆ بینینـی "حەسەن جومعە" سەرۆکی یەکێتی کۆمپانیای نەوتی باشوور. کاتێکیش کـە گەیشتمە گەڕەکی جمهوریە لەبەردەم خانوێکی دارماوی کۆن وەستام، بینـیم زبـڵو خاشـاکێکی زۆر لەسـەر شـەقامەکەی بـەردەم خانووەکـە کەڵەکـەی کردبوو. کە چوومە ژوورەوە زۆر تاریك بوو. ئەمە حاڵەتێکی ئاسایی بوو لـە عێراقێکی داگیرکراودا کە بـەکتل هـەوڵی گێڕانـەوەی وزەی تـەواوی دەدا بـۆ تۆڕەکانی کارەبا.

جومعە لای سەیر بوو کاتێ کە پێم وت چاوم بـە ژمارەیـەك کرێکاری ئاسـیایی کـەوتووە، چـونکە چـەند مانگێـك لەمـەو بـەر، یەکێتیەکـەی مانگرتنێکی فراوانی ئـەنجام دابـوو بـۆ دەرکردنـی کرێکارە بیانیـەکان. وەکو چۆن خۆی دەڵێت:" رەتکردنەوەی کرێکاری بیانی سیاسەتی کۆمپانیاکەمانە، چونکە پێمان باشترە هێزی کاری عێراقی بـەکار بخـەین. بۆیـە هـالیبرتۆنیش رازی بوو لەسەر هێنـانی ژمارەیـەکی کـەمی ئـەو تـەکنیك کارانـەی کـەوا زۆر پێویستیمان پێیانە. بەڵام کرێکارەکان گشتیان عێراقین."

کـاتێکیش کـە پـێم وت ئـەو کرێکـارە بیانیانـە مانگانەکـەیان چـەندە، جومعە سەری راوەشاند و گوتی: "ئەمـە یەکێکـە لـەو هۆکارانـەی کـە وامـان لێدەکات کرێکاری بیانی رەت بکەینەوە. چونکە کرێکارە عێراقیەکان هەست بە ناڕەوایی دەکەن لەو جیاوازیەی کە لە نێوان مووچەکانی ئەوانو کرێکـارە بیانیەکاندا هەیە".

لەم سەردانەماندا بۆ ماڵی جومعە، خاتوو " ئیوا جازوێك" لەگەڵدا بوو، کە یەکێکە لە کارمەندە کاتیەکانی بنکەی چاودێری داگیرکەر، کە بنکەکەیان لە بەغدایە. ناوبراو ماوەی سێ مانگە لە عێراقە، خەریکی هاوکاری کـردن و یارمەتیـدانی یـەکێتی کۆمپانیـای نـەوتی باشـوورە بـۆ رێکخـستنەوەی

کرێکارەکانی. کە بێگومان ئەرکێکی قورس بوو.

ئەو دەڵێت: "زۆربەی ئەو کرێکارانەی کە تا ئێستا چاومان پێیان کەوتووە، زانیاریان دەربارەی "یەکێتی"ـیەکە نەبوو، نەشیاندەزانی بۆچی دەبێ ببنە ئەندام تیایدا. لەوەش زیاتر بێ ئاگابوون لە پێکهاتەی یەکێتیەکە، مافی مانگرتن، خواستی بە ئەندام بوون، مساوەمەکردنی دەستەجەمعی بۆ داواکاریەکانو گرتنەبەری رێو شوێنی گونجاو بۆ چۆنیەتی رووبەڕوو بوونەوەی بەرپرسەکان بۆ داواکردنی مافەکانیان." ١٠

سەدام حوسێن ترسی لە دڵی ئەو کرێکارانەدا چاندبوو لە مەڕ رێکخستنی هەر یەکێتیەك یان کۆمەڵێکی تایبەت بە خۆیان، کاتێك کە لە ١١ ئاداری ١٩٨٧دا یاسایەکی دەرکرد، بە پێی ئەو یاسایە گشت مافە بنەڕەتیەکان، بە مافی ٨ کاتژمێر کارکردنیش لە رۆژێکدا نەما. ئەو یاسایەی سەدام حوسێن مافی پێکهێنان یان بەئەندام بوونی یەکێتیو کۆمەڵەکانیشی لەناوبرد. ئەوە لە کاتێکدا گشت یەکێتیەکان لە کەرتی گشتی یاساغ کران و بە پێی یاساکە "یەکێتی" تری تازە پێکهێنران بۆ کەرتی تایبەت بە مەبەستی هاوکاری کردنی کارگێریەکان بۆ "کاراتر کردنی ئیشو کارەکانو سەپاندنی بەندوباریش."

جارێکی تریش هەمان یاسا لەسەر دەستی "پۆڵ برێمەر"ـەوە لە ٢٠٠٣/٦/٥دا دووپات کرایەوە، کاتێك کە ناوبراو مەرسوومێکی دەرکرد، بە مەرسوومی هاندانی خەڵکی بۆ توندو تیژیو گێرەشێوێنی ناسرا. لە مەرسوومەکەدا هاتووە: " هەر کەسێك هانی ئاژاوەنانەوەی مەدەنی، زیان گەیاندن بە موڵكو شوێنە گشتیەکان بدات.... ئەوا دەسبەجێ رووبەڕووی دەسگیرکردن دەبێتەوە لەلایەن هێزە ئەمنیەکانی سەر بە دەسەڵاتە کاتیەکەی هاوپەیمانان. لەوەش زیاتر وەکو دیلێکی جەنگ مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت بە پێی بەندی چوارەمی رێکەوتنامەی جنێڤی ساڵی ١٩٤٩ (کە

تایبەتە بە پێناسەکردنی دەسگیرکراوەکانی جەنگ)." بە ڕای داکۆکیکاران لە مافەکانی کرێکار، دەکرێ دەستەواژەی "ئاژاوەنانەوەی مەدەنی" لە دژی ئەو خەڵکانە بەکار بهێنرێت کە نیازی مانگرتن و خۆپیشاندانیان دەبێت.

لەراستیدا هەر واشبوو، بەوەی لەسەرەتای کانوونی یەکەمدا، مەفرەزەیەکی ئەمریکیەکان کە لە دە هامڤیو ژمارەیەك زریپۆش پێکهاتبوون، هەڵیان کوتایە سەر نووسینگەی فیدراسیۆنی کرێکارە عێراقیەکانو هەشت لە ئەندامانی دەستەی کارگێری فیدراسۆنەکەیان دەسگیر کرد.

وتەبێژی فیدراسیۆن، عبداللە محسن، رایگەیاند: "سەرەڕای چەندین جار داواکاری لەمەڕ هۆکارەکانی ئەو هەڵکوتانە، هیچ روونکردنەوەیەکیان نەدا." هەرچەندە رۆژی دواتر هەشت کەسەکەیان ئازاد کرد، بەلام دەسەلاتدارانی هێزی داگیرکەر هیچ روونکردنەوەیەکیان نەدا سەبارەت بە هۆکاری دەسگیرکردنەکە. ئەو ئەندامانەش تەنیا کەس نەبوون دەسگیر بکرێن. چونکە بەر لەو رووداوەو لە مانگی تشرینی دووەمدا، دوو ئەندامی تریش - "قاسم هادی، سکرتێری گشتی یەکێتی بێکاران، هەروەها عادل صالح، سەرکردەیەکی دیکەی ئەو رێکخراوە دەسگیرکرابوون." ١١

کرێکارەکان لەسەرتاسەری عێراق، دووچاری هەمان مەینەتی دەبوونەوە. لە کاتێکدا یەکێتیەکان بە مەبەستی زیادکردنی مووچەو باشترکردنی هەلومەرجی کار ئامادەکاریان دەکرد بۆ مانگرتن، کەچی کرێکارەکان رووبەڕووی تۆقاندنو دەسگیرکردن دەبوونەوە لەلایەن هێزەکانی داگیرکەر. سەرەڕای ستەمو سووکایەتی پێکردنیش، ئەندامەکانی ئەو یەکێتیانە مەترسی لەدەستدانی کارەکانیشیان هەبوو، ئینجا دامەزراندنی کرێکارە بیانیەکان لە شوێنەکانیان تەنانەت بە مووچەیەکی زیاتریش لەو مووچەیەی کە یەکێتیەکان داوایان دەکرد.

لەسەرەتای مانگی شوباتدا، "وۆڵ ستریت جۆرناڵ" لە راپۆرتێکیدا نووسیویێتی، کۆمپانیای هالیبێرتۆن هەفتانە ٥٠٠ کرێکاری ئەمریکایی دەهێنێت کە مووچەکانیان چوار ئەوەندەی مووچەی کرێکارەکانی هالیبێرتۆنە لە تەکساس ١٢، کە مووچەی مانگانەی شوفێرێکی"بیانی" تانکەری نەوت دەگاتە٨٠٠٠ دۆلار. لە ژمارەیەك کرێکاری ئەندام لە بەهێزترین یەکێتیەکانی کرێکارانم پرسی: چی بکرێت بۆ ئەوەی پارێزگاری لە مانەوەی عێراقیەکان بکرێت لەسەر کارەکانیان؟ جومعە زۆر بەسادەیی وەڵامی دایەوەو گوتی: " ناتوانیت بەری خۆر بگریت؛ هەر عێراقیەك کە خاوەن شەرەف بێت دەبێ دژی داگیرکردن بوەستێتەوە، بۆیە هەمووومان هیواخوازین بە زوترین کات داگیرکەرەکان ئێرە جێبێڵن و بڕۆن."

## دەفرە پیسەکانی هالیبێرتۆن

هەفتەیەك دوای گەشتەکەم بۆ کێڵگە نەوتیەکانی باشوور، لە بەسراوە بەرەو باکوور بۆ بەغدا سەفەرم کرد، کە لەلایەن وتەبێژی سوپای ئەمریکیەوە بانگێشت کرام بۆ باسکردنی گرێبەستیەکەی نێوان هالیبێرتۆن و سوپای ئەمریکی. شوێنی یەکتر بینینمان، هۆتێلی ئەلرەشید بوو کە پارێزراوترین شوێنە لە بەغدا، بێ خۆهەڵکێشان خۆی بە "زیاتر لە هوتێلێك دەناساند"، چونکە لە ساڵی ٢٠٠٣دا، رێك لەدوای شەڕ کرایە بەشێکی بنکەی کاتی هێزەکانی داگیرکەر لە عێراق، هەر بۆیەش دەروازەکانی بریتی بوون لە بەربەستی تەلدڕ و دیواری کۆنکرێتی رێگر لەبەردەم تەقینەوەی خۆکوژی توندو کاریگەر، هەروەها خاڵەکانی پشکنینیشی لەلایەن پاسەوانە چەکدارەکانی گاردی نیشتمانی فلۆریداوە سەرپەرشتی دەکران.

هەر لەگەڵ چوونم بۆ ناو چێشتخانەی "ئەلزاهیر" لە ناو هوتێلی ناوبراو، جارێکی تر چاوم بە ئاسیاییەکان کەوت؛ "موزمفەر" ی چێشتلێنەر، لە گوندێکی بچووك كە نزیکەی ٦٤ کیلۆمەتر لە شاری "دەککا"ـەوە دووربوو لە بەنگلادیشەوە هاتبوو؛ "شاهنەواز" ـی سفرەچیش لە شاری "نیودەلهی" هیندستانەوە هاتبوو؛ هەروەها "عەلی" کە لەسەر مێزی زەلاتە وەستابوو، لە ناوچە نائارامەکەی سنووری باکووری رۆژئاوای پاکستانەوە هاتبوو.

ئەو سێ کەسە بەیەکەوە لە هۆڵی چێشتخانەکەدا، کە ٣٠٠ کورسی لە خۆ گرتبوو کاریان دەکرد. بە نێو ئەو مێزانەدا بلاوببونەوە کە سەربازەکان و کارمەندەکانی دەزگا هەوالگریەکانی کەوا ئامێری بێ تەلیان لە گوێ دابوو لەسەری دانیشتبوون (چەکەکانیشیان ئەوەندە لێیانەوە دوور نەبوو کە دەستیان نەیگاتێ)، هەروەها ئەو سکرتێرە رێکپۆشانەی کە کارمەندبوون لەو کۆمپانیانەی کە گرێبەستیان لەگەڵ سوپادا هەبوو، پیاوانێك کە بە چاکەتو پانتۆڵی رەشەوەو بە دەنگی بەرز باسی کارو چۆنیەتی بەرێوەبردنی ولاتەکەیان دەکرد.

من بۆ نانخواردنی نیوەرۆ میوانی "ریتشارد داولینگ" بووم، ناوبراو وتەبێژی بەتالیۆنەکانی ئەندازیاری سوپای ئەمریکا بوو. پۆشاکێکی سەربازی گەنم رەنگی خەڵەتێنەری پۆشیبوو، کەسێکی دەم بە پێکەنینو لە ناوەراستی تەمەنی دابوو ریشێکی سپیشی هێشتبۆوە، ماوەی ٢٣ ساڵە وەکو کەسێکی مەدەنی لە سوپادا کاردەکات. لەبەر سیما سوورو سپیەکەشی بە "بابا نوێل" ناویان دەبرد، کە وەرگێرراوی عەرەبیە بۆ "سانتا کلۆز". لە میانەی نانخواردنماندا، بە نارەحتیەوە خواردنەکەم دەخوارد، چونکە ئەو راپۆرتە هەواڵانەی کەناڵیNBCـم دەهاتنەوە یاد، کە باسیان لەوە دەکرد، چەندین جار پێنتاگۆن ئاگاداری هالیبیرتۆنی کردۆتەوە کەوا ئەو خواردنانەی دەدرێنە سەربازە ئەمریکاییەکان "پیسن"، بە هەمان شێوەی

ئەو ناندینانەی کە خواردنەکانیان لێوە ئامادە دەکرێن. لە راپۆرتەکانی پێنتاگۆندا هاتبوو، چوار بنکەی سەربازی ئەمریکایی لە عێراق کە ئەرکی دابینکردنی خواردن تیایاندا دراوەتە هالیبیرتۆن، ئەو حاڵەتانەیان تێدا بینراوە: "خوێنی رژاو لە گشت شوێنێکی سەرزەوی ناندینەکان"، "پانتۆڵی پیس و نەشۆراو"، "شیشی گۆشتی پاك نەکراوە"، "مێزی زەلاتەی پیس"، هەروەها "گۆشت و سەوزەی گەنیویش". راپۆرتەکە باس لەوەش دەکات کەوا "هیچ بەدواداچوونێك نەکراوە" سەبارەت بە بەڵێنەکانی هالیبیرتۆن بۆ چاککردنەوەی ئەم لاریانە، هەر بۆیەش راپۆرتەکە هۆشداری دەدات، گەر بێتو بەڵێندەرەکە کەم تەرخەم بێت لەپاك کردنەوەی ئەو پیسیانە، "ئەوا ئاکامی خراپو ناپەسەندی لێ دەکەوێتەوە".١٣

ژەمە خواردنەکانی هوتێلی ئەلرەشید مام ناوەندی بوونو بێگۆمان کەمێك باشتریش بوون لەو ژەمە خۆراکە ئامادەکراوانەی تایبەت بۆ سەربازەکان لە مەیدانی جەنگدا. لەگەڵ ئەوەش نەختێك پارەی کاشیان لە لایەن سوپای ئەمەریکاوە بۆ سەرف دەکرا (رۆژانە بیستو هەشت دۆلار بۆ هەر سەربازێك)، کە سەربازەکان لە توانایان دابوو هەموو رۆژێك لە چێشتخانەی (کۆشکی سپی) "باشترین چێشتخانەکانی شاری بەغدا" نان بخۆن، بە لای خودی برێمەریشەوە جۆرێك لە خەیاڵ بوو.

دوای تەواو بوونمان لە نانخواردن، بۆ قسەکردن لەگەڵ سێ کرێکارەکە وەستام، پێیان گوتم، مانگانە ٢٠٠ دۆلاریان دەست دەکەوێت، بە دەرماڵەی ترسناكو کاتی زیادکراویشەوە. لێیانم پرسی کارەکانیان بەلاوە چۆنە، بە دوودڵیەوە وەڵامیان دایەوە، یەکێکیان گوتی: "هەر چۆنێك بێت دەیگوزەرێنین" دواتر موزەففەری چێشتلێنەر روونی کردەوە، کەوا زۆر زیاترە لەوەی لە وڵاتی خۆیان دەستیان دەکەوێت. نابراو هەوڵی پەیداکردنی خەرجی شووکردنی کچەکەی دەدا بە کەسێکی بەنگلادێشی کە لە سعودیە

دەژییت. بەلام ئەو خۆشی و زاواکەشی بەدەگمەن دەتوانن سەردانی هاوسەرەکانیان بکەن. کچەکەی تریو کورە بچووکەکەشی بە ئاسانی نایناسنەوە، چونکە ئەوە ماوەی سێزدە ساڵە لە دەرەوە ژیان بەسەر دەبات.

لە کاتێکدا کە ژمارەیەك لەو کرێکارانەی هالیبێرتۆن کە لە عێراق کاردەکەن، راستەوخۆ لە هیندستانەوە لە رێگەی کۆمپانیای "تەمیمی" سعودیەوە بەکارخراون، کەچی زۆربەیان لە کوێت یان سعودیەوە هێنراونەتە عێراق لە بەرانبەر سەرمووچەو بەخشیشی زیاتر. یەکێك لەو کرێکارانە دەیگوت، کۆمپانیاکە هیچ رێگا چارەیەکی تری بۆ نەهێشتۆتەوە، یا ئەوەتا دەبێ بێتە عێراق، یاخود لەسەر کارەکەی دەردەکرێت. کرێکارەکان دەیانگوت کەوا ئاگادار کراونەتەوە بەوەی نابێت بچنە دەرەوەی هۆتێلەکە یان کۆشکی کۆماری، چونکە بە ناوچەی دوور لە مەترسی دەژمێردرێن بە بەراورد لەگەڵ شوێنەکانی دەرەوەی ناوچەی سەوز کە لە رووی ئەمنیەوە باش پارێزراوە.

قسەکانمان لە لایەن "تۆنی" بڕرا، ناوبراو ئەمریکیەکی بە رەچەڵەك فلپینیەو پێشتریش لە ریزی هێزەکانی مارێنزدا بووەو دانیشتوی بۆرلێنگامی سەر بە ویلایەتی کالیفۆرنیایە. کە بەرپرسی شەست لەو کارمەندە ئاسیاییانەیە، رووی لە کرێکارەکان کردو بە نەڕاندنەوە گوتی "بگەڕێنەوە سەر کارەکانتان دەی، هەر ئێستا بۆ چێشتخانەکە". چونکە ئەو نە زمانی ئۆردۆو نە بەنگالیشی دەزانی، هەر بۆیە لە قسەکانمان تێنەدەگەیشت، رەنگبێ ئەوەش پەستی کردبێت.

"مایك" یەکێك بوو لە بەڵێندەرەکانی سوپاو ئاگاداری ئەو قسەگۆڕینەوانە بوو، گوتی: "تۆنی کەسێکی قەڵپە". کاتێکیش کە هەڵسامەوە بڕۆم، رووی لە تۆنی کردو گوتی: "لەسەرەخۆ بە لەگەڵیان". ئینجا سێ کرێکارەکە بە داوای لێبوردنەوە گوتیان: "حەزدەکەین جارێکی

تــریش ســەردانیمان بکــەیت، چــونکە ناوەنــاوە خــواردنی هینــدی ئامــادە دەکەین"

لە کاتی دەرچوونیشم لە هۆتێلەکە، پرسیارم دەربارەی ئەو قسەڵۆکانەی کە دەڵێن هالیبێرتۆن سودمەندە لە شەڕی عێراق لە "داولینگ" کرد؟ کە لە وەڵامدا گوتی: "لەوانەیـە هەنـدێ کـەس وەکو هەلقۆسـتنەوی شـەڕ سـەیری بکـەن، بـەڵام بـە لای سـەربازە گەنجەکانـەوە، بریتیـە لـە ژەمێکـی خـواردنی گــەرمو شــوێنێکی وشــك بــۆ خــەوتن. بێگومــان قــازانج هاندەرێکــە وا لــە کۆمپانیاکان دەکات بێنـە شوێنو ناوچـەی مەترسـیدار، ئـەوەش یەکێکـە لـە بنــەما ســەرەکیەکانی ســەرمایەداری. کارمەنــدەکانی هــالیبێرتۆن لــە نێــو ئـاگردان و ژمارەیەکیـشیان لێ کـوژراوە، بـەڵام هـەر لێـرە ماونەتـەوە. لەگـەڵ رێزێکی زۆرم بـۆ رێکخـراوە نێودەوڵەتیـەکانی وەك نەتـەوە یـەکگرتووەکان و خاچی سووری نێودەوڵەتیش، بەڵام ئەوان رایان کـرد. گـەر بەدەسـت هێنـانی قازانـج هانـدەری سـەرەکی رێکخراوێـك بێـت بـۆ ئـەوەی کـاری قـورس ئـەنجام بدات، ئەوا ئەو کاتە تەنیا رێگا دەبوو بۆ بە جێگەیاندنی."

## ژمارەی ژەمە خۆراکەکان

بـە پێـی چـەند ژمارەیـەکی راگـەێنراو لـە لایـەن پـەیامنێری کـەناڵی تەلـەفزیۆنی NBC: لـە خەمڵانـدنێکی هـالیبێرتۆن، لـە کـانوونی یەکـەمی ٢٠٠٣، بیستو یەك ملیۆن ژەمـە خـواردن بـۆ ١١٠٠٠٠ سـەرباز دابـین کـراوە لـە چل و پێنج شوێنی جیاواز لە عێراقـدا. بـەڵام لەسـەرەتاکانی ٢٠٠٤، پـشکنەرە داراییەکانی سوپا، کەوتنـە گومـان لـەوەی رەنگبـێ کۆمپانیاکە زێـدەڕەوی لـە ژمـارەی ژەمــەکان کردبێــت، بــەوەش ملیۆنــەها دۆلاری وەکــو سەرتێــچوون خستبێتە سەر ئەستۆی حکومەت. ١٤

لە مانگی شوباتیشدا، لە راپۆرتێکی "وۆڵ ستریت جۆرنـال "ـدا هـاتبوو:

ئەگەری ئەوە هەیە هالیبێرتۆن شانی باج دەرە ئەمریکیەکانی قورس کردبێت بەوەی ١٦ ملیۆن دۆلاری خستبێتە سەر تێچوونی راستەقینەی ژەمە خۆراکی ئامادەکراو بۆ سوپا لە ماوەی حەوت مانگی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٣دا لە چوارچێوەی ئۆپێراسیۆنی ئازادکردنی عێراق. هەر تەنیا لە مانگی تەمموزی ٢٠٠٣، هالیبێرتۆن لیستێکی بە ٤٢٠٤٢ ژەمە خۆراك لە رۆژێکدا پێشکەش کردووە، کەچی لە راستیدا رۆژانە تەنیا ١٤٠٥٣ ژەمە خواردنی ئامادەکردووە. ١٥

وتە بێژی کۆمپانیای هالیبێرتۆن لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست "میلیسا نۆرکرۆس" بەرگری لە کارو رەفتارەکانی کۆمپانیاکە کردو بە وتەیەکی "راندی هارڵ" سەرۆکی جێبەجێکاری هالیبێرتۆن کە دەڵێت: "بۆنموونە، سەرکردە سەربازیەکان بە هۆی نیگەرانیان لە سەلامەتی سەربازەکانیان نە دەیانەویت سەربازەکان ئیمزای وەرگرتنی ژەمە خواردنەکان بکەن نە خوازیاریشن سەرەی دوور و درێژ بگرن بۆ وەرگرتنی خۆراك". هەروەها ناوبراو ئاماژەی بە گرفتی "چێشتخانە پیسەکان"دا و وتی، ئەو گرفتەش چارەسەرکراو و لەو کاتەوە تا ئێستا دامەزراوەکانمان لە چەندین پشکنیندا سەرکەوتوو بووە.

نۆرکرۆس بەردەوام دەبێتو دەڵێت: "ئەوەشت لە یاد نەچێت، ئامادەکردنو پێشکەشکردنی خواردن رۆژانە بۆ ١٣٠٠٠٠ کەس لە شوێنێکی دژوار و شەڕاوی کارێکی ئاسان نیە. شایانی سەرنجیشە، سەرەڕای سەرهەڵدانی کێشەو گرفت یان کەمو کورتی لە کاتی دابینکردنی ژەمە خۆراك بۆ ئەو ١٣٠٠٠٠ سەربازە، کەچی گەڵێ کارو ئەرکی تری جوانو باش هەن کە کارمەندەکانمان ئەنجامیان دەدەن" ئەم قسانەی نۆرکرۆس ئاماژە بوون بۆ قسەی وەکیلێکی هالیبێرتۆن لە تەلەعفەر کە گوتبووی: "سەرکردە سەربازیەکە لەوێ سوپاسی ستافی هالیبێرتۆنی کردبوو بۆ ئەو ژەمە

خواردنانـەی کـە لـە جـەژنی سوپاسـگوزاری ئامـادەکرابوون، ئەمـە بەلایـەوە باشترین خزمەتگوزاری بووە کە پێشکەش کرابێت. منیش پێم گوت، راستە ئـەوە باشـترین خزمـەتکردن بـووە کـە لـە مـاوەی ٢٣ سـاڵەی کـارکردنم بـۆ حکوومەت بەرچاوم کەوتبێت."

## کرێکاری نێوخۆیی

دوای ماڵئـاواییکردنم لـە داولیـنگ، لـە هـۆتێلی ئەلرەشـیدەوە بـەرەو سـەنتەری کۆنفرانـسەکانی بەغـداً (مرکـز المـؤتمرات) چـووم، کـە هـۆڵێکی شانۆی فراوانو بەتاڵی تێدابوو، لەگەڵ کۆمەڵێك نووسینگەی چالاكو پـڕئیش لـە ژێـر زەمینـەوە تـا نهـۆمی سـێیەم. عێراقیـە خـاوەن سـیما جدیـەکانو کاربەدەسـتانی سـوپا و پاسـەوانەکانیانو هـەروەها سـتافێکی زۆری کـامێرا بەدەست، ژوورەکانیان پڕ کردبوو.

کۆمەڵێك لەو کرێکارە عێراقیانەی لە سەنتەرەکە کاریان دەکرد، باجی هالیبێرتۆنیشیان هەڵواسیبوو، لە میانەی وەرگرتنی پشووی چاخواردنەوە بۆ قـسەکردن راوەسـتابوون. یـەکێکیان چـەند جارێـك هـەوڵی دا وشـەی (congratulations ) دەرببڕێـت بـەلام بـێ ئاکام بـوو، نەیـدەتوانی هیـوای سەرکەوتن بۆ بەرپرسەکەی بخوازێت، بە پەسـتیەوە رووی لـێم کـرد و پرسـی گەر وشەیەکی ئاسانتر هەبێت بیڵێم؟ منـیش پێشنیاری ئـەوەم کـرد دەسـتێك لە پشتی بەرپرسەکەی بداتو بڵێت: "دەست خۆش، کارێکی باشە".  کەچی ئەو سەری بە توندی هەژاندو گوتی: "نەخێر، من ناتوانم ئاوا بڵێم، (بـەرێز لویس) بەرپرسەکەم کەسێکی ئەمریکیە بۆیە دەبێ بەڕێزەوە قسەی لەگەڵدا بکەم".

سـێ کارمەندەکـەی هـۆڵی سـەنتەرەکە هـاوڕێو دانیـشتووی هـەمان گـەڕەکیش بـوون. بۆیــە هــالیبێرتۆن هــەموو بەیانیــەك کاتــژمێر ٨,٠٠

ئۆتـۆمبێلێکی دەنـارد تـاکو بیانگەیێنێتـە سـەر کـار، ئێـوارانیش کاتـژمێر ٤،٠٠ ئۆتۆمبێلێکی تر دەیگەیاندنـە ماڵەوە. هەرسێکیـشیان کارمەنـدی شـارەزابوون بۆیە هالیبێرتۆن بە گشتی مانگانەیەکی زۆرتری پێدەدان لە کرێکارەکانی تر. "خالـد عـەلی" ئەنـدازیارو بەرپرسـی نۆژەنکردنـەوەی سـەنتەرەکەش بـوو، "صباح عادل موستەفا"ش وەرگێر، هەروەها "داوود فەرهوود" سەرپەرشتیار بوو. داوود بەتەمەن لەوانی تر گەورەتر بـوو، دووەکەی تـریش تەمـەنیان لـە کۆتایی بیـستەکان دەبـوو. پێیـان گوتم کـەوا خۆشـحاڵن بـەوەی کارمەنـدن لـە هالیبێرتۆن.

صباح گوتی: " ئەوە یەکەمین پیشەمە، بـەر لـە ئێـستا دەرفـەتی ئـەوەم نەبووە قسە بە زمانی ئینگلیزی بکەم. پێشتریش مووچەی حکومەت تـەنیا ١٠ دۆلار بوو." بە هەمان شێوە خالیـدیش روونـی کـردەوە کـەوا ئـەوە یەکـەمین کارکردنیەتی. لێم پرسی:"تۆ بەرپرسی گشت کردارەکـانی نـۆژەن کردنـەوەی لێرە؟" بە شانازیەوە سەری لەقاند بە بـەڵێ و کـاتێکیش کـە پـێم وت پـیرۆزە "congratulations" گەشـایەوە. هەرسـێکیان پێیـان راگەیانـدم کـەوا مانگانەی کرێکارە عێراقیەکان لە هالیبێرتۆن لە نێوان ١٠٠ تا ٣٠٠ دۆلارە.

## کرێکارە رەش پێستەکانی تەکساس

لە نیوەکەی تـری جیهـان، کۆمـەڵێکی تـر لـە کرێکارە بەدبەختـەکان لـە بنکەی وەرگـرتنو دامەزرانـدنی هێـزی کـار لـە شـاری "هیۆسـتن" دەبینـرێن. خاوەن کارە چاوەروان کراوەکانیان پۆسـتەری راگەیانـدن لـە شـوێنی وەسـتانی ماشێنەکانو رێکلامیشیان لە رێـی ئەنتـەرنێتـەوە بلاوکردبـۆوە. چوار لەسـەر پێنجی ئەو وەرگێراوانەی کە بانگێشت کرابون بۆ کۆرسی راهێنان لە بەشـێکی کۆگـای "مۆنتگـۆمری" نزیـك فرۆکەخانـەی "هیوسـتن"، دەنێردرانـە عێـراق. لەسـەرەتای کـانوونی دووەمیـشدا، کۆمپانیـای هـالیبێرتۆن هـەموو هەفتەیـەك

پێنج سەد لەو کرێکارانەی رەوانەی عێراق دەکرد.

هیچ یەکێك لەوانە شارەزا نەبوون. "راسل گۆڵد" پەیامنێری وۆڵ ستریت جۆرنال دەڵێت: "ئەوانە کەسی بێکارو کرێکاری بێ پیشەن لە چوارچێوەی ئابووری ئەمریکا، کە لە بنەڕەتدا گەڵ کارو پیشەی لێوە بەرهەم نایەت." ناوبراو چاوپێکەوتنی لەگەڵ کەسانێك کرد کە بۆ خوولەکانی راهێنان ریزیان بەستبوو، یەکێك بە نموونە دەهێنێتەوە، کاری پێشوتری بریتی بووە لە گواستنەوەی پەلەوەر "مریشك"، لە بەرانبەر ١٢ دۆلار لە کاتژمێرێکدا. بەڵام دواتر کە دەگەنە عێراق، لە رێی پاسەپۆرتە ئەمریکییە رەنگ شینەکانیانەوە برێك پارەی زۆر بەدەست دێنن: کە خۆی دەدات لە نزیکەی ٧٠٠٠ بۆ ٨٠٠٠ دۆلار لە مانگێکدا، تەنانەت بە پێی پێوەرەکانی ئەمریکاش ئەمە مووچەیەکی بەرزە. بەڵام لە بەرانبەریشدا دەبێت رۆژی ١٢ بۆ ١٥ کاتژمێرو لە هەفتەیەکدا حەوت رۆژ کاربکەنو لەژێر خێمەو لەبەر گێژەڵۆکەی لماوی‌و پلەی گەرمی بەرزدا کە دەگاتە ٥٤،٤ پلەی سەدیەوە بژین.١٦

پرسیارم لە "نۆرکرۆس" وتەبێژەکەی کۆمپانیای هالیبێرتۆن کرد، سەبارەت بەو جیاوازیکردنە لە پێدانی مووچە لە عێراقدا لە لایەن کۆمپانیاکەوە لەسەر بنەمای نەتەوەیی، لە وەڵامدا گوتی:" باسی پێکهاتەی مووچە و رۆژانەی کرێکارەکان کە لەلایەن کۆمپانیەکەمانەوە پەیڕەوی لێدەکرێت ناکەم. چونکە بودجەی تەرخان کراو بۆ مووچەو کرێ کە لەلایەن کۆمپانیاو بەڵێندەرە لاوەکیەکانەوە دابین دەکرێت، بەندە بەو پێوەرو رێنماییانەی کە لەلایەن دەسەڵاتی کاتەکی هاوپەیمانەکانەوە دەردەچێت. بڕی مووچە و کرێش بە پێی بارودۆخی بازاڕو پێوەری نێوخۆیی دیاری دەکرێت". ١٧

هەمان پرسیارم ئاڕاستەی " داولینگ" وتەبێژەکەی سوپا کرد، کە

وەڵامەکەی ئەو روونو ئاشکراتر بوو: " ئەو کرێکارانە خۆیان بە بەختەوەر دەزانن بەوەی کاریان دەست کەوتووە، گەرچی سەفەری شوێنی تریشی تێدا بێت. ژمارەیەکی زۆری کۆمپانیا هەن کە لە جۆرەها شوێنو ناوچەکانی کە ململانێیان لێیە دەگەڕێنو شارەزاییو ئەزموونیشیان بەدەست هێناوە لە دامەزراندن و دروستکردنی هۆڵی نانخواردن بۆ هەزارەها سەربازگەی سوپا لە چۆڵاییو دوور لە ئاوەدانی، تەنیا لەماوەی چەند رۆژێکی کەمدا. ئەمە پیشەیەکی ئاسان نیە و ئەوانەش کەسی لێهاتوو و شیاون بۆ ئەم کارە. ئەو کۆمپانیانە کارمەندو خەڵکی خۆیان لەگەڵە، ئەو خەڵکەی پێشینەی کارو شارەزاییان هەیە لە کارکردن لە شوێنی سەربازیو شەڕدا."

ئەو لە پووختەی قسەکانیدا دەڵێت:" بڕیاری دیاریکردنی مووچە لەسەر بنەمای بەهای ژیانو گوزەران نیە، بەڵکو لەسەر بنەمای تێچوونو خەرجیەکانی مەشقو ئامادەکردنی هێزی کارە. لە هەمان کاتیشدا ناکرێو راستیش نیە گەر بێتو سوپای ئەمەریکا هەمان ئەو پێوەرەی کە لە ئەمریکادا پەیڕەوی لێ دەکرێت بۆ مووچەدان، لێرە بەکاری بێنێتەوە، ئەوە لە کاتێکدا کە هیچ کەسێکی تر لە توانای دا نیە پەیڕەوی لەهەمان ئەو پێوەرە بکات. هەندێ جار ژیان ناڕەوایە!."

## کێ دادپەروەرە و کێ ناڕەوایە؟

پێدەچێت هەندێك جار ئەو ناڕەواییە پێویست نەبێت یان بە ئەنقەست بکرێت. بۆ نموونە، رەنگە ئەو سیستەمە ئاڵۆزەی گرێبەستیە لاوەکیەکان کە چێشتلێنەرە ئاساییەکان بۆ سوپای ئەمریکی دابین دەکات، مافی کرێکارەکانیش پێشێل دەکاتو لە هەمان کاتیشدا ئەستۆی باج دەرە ئەمریکیەکان قورستر دەکات.

سیستەمەکەش بەو شێوەیە: هالیبیرتۆن کۆمپانیای تەمیم لە

عەرەبستانی سعودیە بەکرێ دەگرێت، ئەویش لەلای خۆیەوە ڕەنگبێ گرێبەستێکی لاوەکی لەگەڵ کۆمپانیای "گەلف کاتەرینگ"ی مۆر بکات، کە ئەوەشیان ڕەنگبێ دامەزراوەیەکی هیندی بەکار بێنێت وەك دەزگای "سەبهاش ڤیجای". هەر یەکێك لەم کۆمپانیا و بەڵێندەرانە خەرجی خزمەتگوزاری خۆی دەوێت، هەر بۆیەش ئێمەی باج دەر دەبێت پارەیەکی زۆرتر لەو ٣٠٠ دۆلارە بدەین کە کرێکارەکە لە مانگێکدا وەری دەگرێت.

ئەگەری ئەوەش هەیە، کرێکارە هیندیەکە مووچەکەی خۆی بە تەواوەتی وەرنەگرێت. لەسەرەتای مانگی ئایاری ٢٠٠٤دا ڕۆژنامەکانی هیندستان ڕاپۆرتێکیان دەربارەی بەسەرهاتی هاولاتیەکی هیندی بلاّوکردەوە، بەوەی چۆن بۆتە قوربانی ئەم سیستەمە:"دەزگای (سەبهاش ڤیجای) گرێبەستیەکی دوو ساڵی بە بڕی ١٨٠٠ دۆلار لەگەڵ (عبدالعزیز حامد و برا بچوکەکەشی شاهجیهان) مۆرکرد، کە دانیشتووی باشووری هیندستانن. بۆ ئەوەی بە پیشەی قەساب لە بنکەیەکی سەربازی ئەمریکی لە کوێت کاربکەن. بە پێی گرێبەستیەکە مووچەی مانگانەی هەر یەکێکیان دەگاتە ٣٨٥ دۆلار- سامانێکی بچووکە بە پێی پێوەرەکانی هیندستان- بۆیە هەڵدەستن بە ڕەهن کردنی خانوو ماڵی یەکێك لە ناسیاوەکانیان بۆ ئەوەی بتوانن پارەی سەفەر دابین بکەن. ئینجا لە مانگی ئابدا لە ڕێی فڕۆکەوە لەگەڵ دوو ناسیاوی خۆیان بەرەو کوێت سەفەردەکەن. پاش چەند ڕۆژێك پاسپۆرتەکانیان لێ زەوت دەکرێت و ڕەوانەی بنکەیەکی سەربازی ئەمریکیان دەکەن لە باکووری عێراق. سەرکارەکەیان لە کوێت کە پاسەپۆرتەکانیانی زەوت کردبوو، پێیانی گوتبوو، دەبێ تا شەش مانگی تر لەو بنکەسەربازیە کاربکەن و بە هیچ جۆرێکیش نابێت ئەوێ جێبهێڵن. ئیشەکەشیان، بریتی بوو لە قاپ شۆردن و پاك کردنەوەی پاشماوەی سەربازەکان لە بەرانبەر ١٥٠ دۆلار لە مانگێکدا، بۆیە عبدالعزیز لە تەلەفون بە خێزانەکەی گوتبوو ئێمە لە دۆزەخ داین و

ئەگەر خواش ئێمەی خۆشبوێت ئەوا رەنگبێ بتوانین جارێکی تر بەیەکتر شاد بینەوە".

"نیکۆ سمیس" بەڕێوەبەری کاروباری فەرمانبەران لە کۆمپانیای "گەلف کاتێرینگ" تایبەت بە دابینکردنو ئامادەکردنی خۆراکو بەرپرس لە دامەزراندنیان، ئەوەی رەت دەکردەوە کە هەڵخەڵەتێنرابنو لە راگەیاندنێکیدا بۆ رۆژنامەی نیویۆرك تایمز گوتبووی:" مەبەست لە گلدانەوەی پاسەپۆرتەکان تەنیا بۆ پارێزگاریکردنیان بووەو هەرکاتێکیش ئارەزوویانکرد دەست لە کار بکێشنەوەو کارەکەیان جێبێڵن، ئەوا ئێمە رێگەیان لێ ناگرین."

لەلایەکی تریشەوە"وێندی هۆڵ" وتەبێژی هالیبیرتۆن، لە روونکردنەوەیەکیدا وتی: کۆمپانیاکەمان لێپێچینەوەی وورد لەگەڵ کۆمپانیای ناوبراودا ئەنجام دەدات، کە دەڵێت: " KBR گەر بۆی دەرکەوت هەر بەڵێندەرو کۆمپانیایێکی لاوەکی مامەڵەی خراپی لەگەڵ کرێکارەکاندا کردووە ئەوا بە پێی سیاسەتی نێوخۆیی کۆتایی بە گرێبەستیەکانیان دەهێنێت. بۆیە بە پێی پەیڕەوی KBR هەر کارمەندێك یان کرێکارێك گەر حەزی کرد، ئەوا دەتوانێت ئەو بەشەی کاری لێدەکات جێبێڵێت یان هەر کاتێك خۆی ئارەزووی کرد ئەوا دەتوانێت دەست لەکارەکەی بکێشێتەوە." ١٨

لە هەمان کاتدا، چەند بەڵێندەرێکی لاوەکی، دەیانگوت لەلایەن هالیبێرتۆنەوە ئیستیغلال کراون- لەوانە ئەو کۆمپانیایەی کە ئێوارەخوانی جەژنی سوپاسگوزاری بۆ جۆرج بۆشی سەرۆکی ئەمریکا ئامادە کردبوو لە کاتی سەردانە لە ناکاوەکەی بۆ بەغدا لە ساڵی ٢٠٠٣، کە لەبەردەم کامێراکاندا قەلی نایلۆنیو پلاستیکی خستبووە سەر سینیو پێشکەشی دەکرد.١٩ لە حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٣ ـشدا گرێبەندیەك مۆرکرا لەگەڵ کۆمپانیای مۆریسی ئوستراڵی بە هاوبەشی لەگەڵ کۆمپانیایەکی کوێتی بە ناوی KCPC بۆ دابینکردنی ژەمە خۆراکی هەژدە هەزار سەرباز لە سێ بنکەی سەربازی لە

باکووری عێراقدا لە بەرانبەر ١٠٠ ملیۆن دۆلار. دوای شەش مانگ، هالیبێرتۆن گرێبەندیەکەی هەڵوەشاندەوە بە بیانووی ئەوەی کە کۆمپانیای مۆریسو کۆمپانیا کوێتیەکە کەمتەرخەم بوونە لە پابەندیەکانیان.

سەرچاوەیەکی نەناسراو بە رۆژنامەی " سیدنی مۆرنینگ هێرالدی" راگەیاند کەوا یەکێك لە کارمەندە ئەمریکاییەکانی هالیبێرتۆن لە کاتی دانووستانەکانی تایبەت بە گرێبەستیەکە، پێشنیاری ٢ ملیۆن دۆلاری کردبوو وەکو بەرتیل بۆ هەردوو کۆمپانیا ئوسترالی و کوێتیەکە لە حاڵەتی پەسەندکردنی گرێبەستیەکە: "ئێمە باسی پارەی کاش ناکەین، ئەو کارمەندە داوای پشکداری دەکات لە فرۆشتنی هەموو مانگێکدا، ئەوان چاویان لە رێژەی ٣٪ تا ٤٪ دابوو، کە بێگومان نرخی شتەکانی بەرز دەکردەوە، چونکە بەڵێندەرە لاوەکیەکان ئەو رێژەیە دەخەنە سەر تێچووی گشتی" ٢٠.

## تێچووی زێتر واتە قازانجی باشتر.

بۆچی پێدانی کرێیەکی شیاو بۆ کرێکارە عێراقیەکان دژایەتی بکرێتو سەندیکاکانیش یاساغ بکرێن، لە کاتێکدا رەنگبێ چارەسەری باش بن بۆ گرفتی بێکاری لە رادەبەدەر و پێداویستی بەردەوامیش لەسەر هێزی کار بۆ ئاوەدانکردنەوە، کە ئەمانە هەموویان فاکتەری بەهێزن بۆ دامرکاندنەوەو هێورکردنەوەی تورەیی عێراقیەکان لە بەرانبەر داگیرکەریدا؟ وەڵامە سادەکەی ئەو پرسیارە ئەوەیە کە هالیبێرتۆنو کاربەدەستانی هێزەکانی داگیرکەر متمانە بە کرێکارە عێراقیەکان ناکەنو دەترسن لەوەی ئەو کرێکارانە، سەرکارە داگیرکەرەکانیان بکوژن.

کۆمپانیای هالیبێرتۆنی هەلپەرست، مانگانە ١٠٠ دۆلار دەداتە کرێکارە لۆکاڵیەکان، ٣٠٠ دۆلاریش بۆ هیندیەکانو ٨٠٠٠ دۆلاریش بۆ تەکساسیەك. سەرەرای سیفاتە هاوبەشەکانیشیان، ئیشو کاری ئەو دامەزراوە هەلپەرستانە

بـه نـەخوازراوترین ئـیش‌و کـار دادەنـرێن. لـە زۆربـەی وڵاتەکانـدا، کۆمپانیـا نێودەوڵەتیەکان کرێیەکی کەمێك زیاتر دەدەن بـە بـەراورد لەگـەڵ کاروپیـشە ناوخۆییەکان (گەر دەسەبەر بکرێن) بەوەش هێزی کـاری نـاوخۆیی بۆخۆیـان رادەکێشن. بۆیـە ١٠٠ دۆلار لـە وڵاتێـك کـە رێـژەی بێکاری تیایـدا دەگاتـە ٧٠٪ پارەیەکی زۆرە، هەروەها ٣٠٠ دۆلاریش لە وڵاتێکی وەکو هیندستان بریتیە لە سامانێکی بـچووك و ٨٠٠٠ دۆلاریـش مانگانـەی ئەندازیارەکانـە لـە ئەمـەریکا. هــەر بۆیــەش ئاســاییە ژمارەیــەکی زۆری داوای کــارکردن پێــشکەش بــە هالیبێرتۆن بکرێت لە کاتی راگەیاندنی بۆ ژمارەیەکی کەمی هەلی کار.

وەکـو چـۆن داولینـگ روونـی دەکـردەوە، کۆمپانیاکـە مەبەسـتی بـوو کـە پارەیـەکی زیـاد لـە پێویـست نـەدات بـۆ مووچـەی کرێکارەکـان، ئەگـەر چـی بەلایانــەوە گــرنگ نــەبوو چــەند مەســرەف دەکرێــت، چــونکە بــە پێــی کۆنتراکتەکان، سوپا رێژەی ١٪ لـە بـری زیـادە مەسـرەف دەدا بـە هـالیبێرتۆن. سـەرەڕای خەرجیـە راستەوخۆکانیـشی، کۆمپانیاکـە دەتـوانێ داوای رێژەیـەك بکـات بـۆ زێـدە خەرجیـەکانی، لـە گـشت قۆنـاغ‌و شـوێنەکانیش تـا دەگاتـە نووســینگە ســەرەکیەکەی لــە هیوســتن. لەگــەڵ تــەواو بــوونی کارەکــانیش لێژنەیەکی پێکهاتوو لە گەورە ئەفسەرەکانی سوپا بڕیاری ئەوە دەدەن کە ئایا دەکرێ پاداشتێکی زیاد بۆ هالیبێرتۆە سەرف بکرێت بۆ راپەڕاندنی کارەکانی، کـە رەنگـە بگاتـە ٢٪. میکانیزمـە هەڵسەنگاندنی لێژنەکـەش بـۆ کارەکـانی هالیبێرتۆن بەم شێوەیە دەبێت: لە ٦٠٪ ی هەڵسەنگاندنەکە لەسەر چۆنیەتی ئەنجامـدانی کارەکـانی دەبێـت وەك پابەنـدبوون بـە خـشتەی کـار، کـوالێتی کارەکـان‌و چارەســەرکردنی گرفتــەکان‌و تــەنها ٤٠٪ نمـەرەی هەڵسەنگاندنەکە لەسەر مەسروفات‌و خەرجی دەبێت. بەم شێوەیەش کۆمپانیاکە چەند پـارەی زیاتر خەرج بکات ئەوا قازانجی زۆرتر بەدەست دێنێت. ئەو جۆرە میکانیزمە لــە کاریگــەری کــۆنترۆڵ‌و چــاودێریکردنی خــەرجی کۆمپانیاکــانی تــر کــەم دەکاتەوە.

## ڕاستی دەرخەرەکان

بێگومان، ڕاستی دەرخەرەکان لە نێو کۆمپانیاکە دەردەکەوتن بۆ ئەوەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنو ئەندامەکانی کۆنگرێسیش ئاگادار بکەنەوە لە تەشەنەکردنی کەلتووری زێدەڕۆیی لە خەرجیەکانی نێو کۆمپانیاکەدا. "هێنری بانتینگ" سەربازێکی دێرینی جەنگی ڤێتنامە، وەکو شارەزا لە بوارەکانی فرۆشتنو پلانداناں لە گەڵ کۆمپانیای وەك هالیبێرتۆن، هێولیت- پاکەرد، تیکۆو دەسەلاتی گواستنەوەو گەیاندنی پایتەختی هیوستن کاری کردووە. ناوبراو لەسەرەتاکانی مانگی ئایاری ٢٠٠٣ بۆ کارکردن لە هالیبێرتۆن چووە کەمپی ئەلخەلیفە لە کوێت، تا ناوەڕاستی مانگی ئابی هەمان ساڵ مایەوە.

ناوبراو دەڵێت بەدرێژایی مانەوەی لەو شوێنەدا تەنانەت یەك کارمەندی تایبەت بە وردبینی ژمێریاری نەبینیوە. جگە لەوەش کرێکارەکان پێیان ڕاگەێنرابوو گەر بێتوو لەگەڵ وردبین یان هەر دەزگایەکی ڕاگەیاندن قسە بکەن ئەوا دەمودەست لەسەر کار لادەبرێن. لە ئاکامدا ناوبراو دەستی لەکارکێشایەوە چونکە بە"تەواوەتی بێزار ببوو" لە کارکردنی بەردەوام بۆ ماوەی ١٢ تا ١٦ کاتژمێر لە ڕۆژێکدا. بەلام سورە لەسەر ئەوەی کە لەسەر کارەکەی لانەدراوە. ٢١.

لە ڕۆژی ١٣ شوباتی ساڵی دواتر، بانتینگ بۆ گەواهی دان، لەبەردەم دەستەیەك لە نوێنەرە دیموکراتەکانی ناو کۆنگرێس خاولی ڕەنگ پرتەقاڵی نەخشە لەسەرکێشراوی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، کە لەلایەن هالیبێرتۆنەوە کڕدرابوو بۆ شوێنی وەرزشکردنی سەربازە ئەمریکیەکان. وەکو بەلگەیەك لەسەر ڕەفتارەکانی کۆمپانیاکە بۆ زێدەڕۆیی لە خەرج کردنی پارەی باج دەرەکان. وەکو چۆن ناوبراو دەڵێت، هالیبێرتۆن مکوڕ بوو لەسەر کڕینی ئەم

جۆره خاولیانه به نرخی ٥ دۆلار بۆ هەر خاولیەك. له بری كڕینی خاولیەكی ئاسایی ئاسایی به ١,٦٠.

بانتینگ بەم شێوەیەی خوارەوە وەسفی پرۆسەی كڕینی ئەو خاولیانە دەكرد:

نرخێكی كۆن و پەیڕەوی لێكراو هەبوو بۆ كڕینی پەشتەماڵی ئاسایی. بەلام بەڕێوەبەری MWR وره، Morale.Welfare.Recreation خۆشگوزەرانی، كات بەسەربەردن) داوای كڕینەكەی گۆڕی بۆ خاولی چاككراو به جۆرێك كه ئارمی ئەو بەشەی (MWR) ـی لەسەر چنرابێت، وەكو چۆن لەسەر ئەم پەشتەماڵە دەیبینن. ڕێو شوێنی ئاسایی ئەوەیە لە كاتی گۆڕینی داوای كڕین، دەبێت نرخی تازە پێشكەش بكەیت. كەچی بەڕێوەبەری MWR فشاری خستبووه سەر هەریەك لە لێپرسراو و بەڕێوەبەری كڕینی پێداویستیەكان بەوەی داواكه بكەن بێ ئەوەی نرخێكی تازه پێشكەش بكرێت. كاتێكیش كه بەو شتەم زانی بەرپرسەكەی خۆمم لێ ئاگاداركردەوه، بەلام بەز لە یەكلابوونەوەی كێشەكە دەستم له كار كێشایەوه. بۆیه پێم وایه داوای كڕینی ئەم جۆره پەشتەماڵە بەرزكراوەتەوه بێ ئەوەی هیچ نرخێكی تازه پێشكەش بكرێت. ٢٢

سیناتۆر "ریتشارد دێربن" نوێنەری ویلایەتی ئەلینۆی سەر به لیستی دیموكراتەكانی نێو كۆنگرێس و ئەندامی دەستەی گوێگرتنەكەش، بە لێكدانەوەیەكی خێرا دەریخست كەوا بەو بڕە پاره زیادەیەی كه بۆ كڕینی ئەو جۆره پەشتەماڵە دانراوه، دەتوانرێت ١٢ دەستە ئێلەگی گولله نەبڕ

بکردرێت. ئەوە لە کاتێکدا کە ژمارەیەکی زۆری سەربازەکان رەوانەی عێراق دەکران بێ ئەوەی ئەو ئێلەگانەیان بۆ دابین بکرێت. ۴۳

بە پێی گوتەی بانتینگ‌و کەسانی وەك بانتینگیش، کە لە بارودۆخێکی نادیاردا قسەیان بۆ ئەو نووسەرە کردووە، هالیبێرتۆن لە کاتی کڕینی پێداویستیەکان کڕیارەکانی ناچار دەکرد بەوەی دەبێ مامەڵە لەگەڵ ئەو بەڵێندەرانە بکەن کە پێشتر کاریان بۆ کردوون، گەر بێتوو نرخەکانیشیان هەرزانتر نەبێت. وەکو نەریتێکیش، کۆمپانیاکان پشت بەو بەڵێندەرانە دەبەستن کە متمانەیان پێیانە نەوەك ئەوانەی تەنیا نرخەکانیان هەرزانە، بەڵام کڕیارەکان هەر زوو بۆیان دەرکەوت کەوا بەڵێندەرەکان پشتیان پێ نابەسترێت. یەکێك لە راستی دەرخەرەکان رایگەیاند: "هێشتا ئەو بەڵێندەرانە باشترن لەوانەی کە هالیبێرتۆن لە بۆسنە مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن."

بانتینگ بەردەوام دەبێت لەسەر روونکردنەوەی میکانیزمی کارکردنی سیستەمەکەو چۆن کۆمپانیای ناوبراویش پارەی باج دەرەکانی دەپچڕیەوە:

> لە نێو هالیبێرتۆندا سێ ئاست لە ستافی دابینکردنی پێداویستی‌و کەلوپەل هەیە. کڕیارەکان بەرپرسن لەسەر داواکردنی کەرەستەکان بۆ پڕکردنەوەی ئەو پێداویستیانەی کە لەلایەن کارمەندەکانی هالیبێرتۆن داوا دەکرێن. ئێمەش بەدوای فرۆشیارێکدا دەگەڕێین کە توانای دابینکردنی شتە داواکراوەکان‌و ئامادەکردنی داواکانی کڕینی هەبێت. سەرپەرشتەکانی بەشی پێداویستیەکانیش بەرپرسیارێتی پرۆسەو کاری رۆژانەی ئەو بەشەیان لە ئەستۆدا بوو. بەڕێوەبەری بەشی پێداویستیەکان‌و ئامرازو موڵکیەتەکانیش لە سەرووی

ئەوانەوە دێت.

ئینجا لیستێك بە ناوی بەڵێندەرەكان لەلایەن سەرپەرشتی بەشی پێداویستیەكان پێشكەش دەكرێت. لیستەكە تەنیا ناو و ناونیشانیانو ژمارەی تەلەفونی تێدایە. ئێمەش ڕێنمایی كرابووین بەوەی تەنیا ئەو لیستە بەكار بێنین لە كاتی پڕكردنەوەی لیستی پێداویستیەكان. لە كاتی پەیوەندیكردن بەو بەڵێندەرانەوە، زانیاری تری وەك جۆری كەلوپەل و پێداویستیەكان دەخرایە سەر لیستەكە. بە هەرحاڵ ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بۆمان دەردەكەوت كەوا زۆر لەو بەڵێندەرانە نرخەكانیان شیاوی ڕكابەركێ نەبوون و هەروەها دوادەكەوتن لە پێدانی نرخو بگرە لەكاتی هێنانو گەیاندنی شتوومەكەكانیش درەنگ دەكەوتن.

لەو ماوەیەی كە لە هالیبێرتۆن كارم دەكرد، چەند هەڵسوكەوتێكم بینی كە جێگای گومان بوون. بۆ نموونە; لەكاتی كڕینی ئەو شتومەكانەی كە نرخەكانیان لە ژێر ٢٥٠٠ دۆلار بوو، كڕیار تەنیا یەك نرخی لەلای یەك فرۆشیارەوە دەهێنا. ئەویش بۆ ئەوەی خۆی لە هێنانی نرخێكی تری ڕكابەر بدزێتەوە، بۆیە هەر داوایەك، نرخێكی بەجیای بۆ دەهێنراو دواتر هەموویان لە یەك داوای كڕینی كەمتر لە ٢٥٠٠ دۆلار كۆدەكرانەوە. لە ئاكامیشدا نزیكەی ٧٠-٧٥٪ پرۆسەكانی كڕینی شتومەك دەكەوتنە خانەی كڕینی ئەو پێداویستیانەی كە نرخەكانیان كەمترە لە ٢٥٠٠ دۆلار. بەڵێندەرەكانیش داواكانیان بەش دەكرد بۆ ئەوەی خۆیان لە هێنانی دوو

نرخی پێدان بە دوور بگرن. بۆ ئەو داوای کڕینانەشی کە لە سەرووی ٢٥٠٠ دۆلار بوون، کڕیارەکان داوایان لێدەکرا دوو نرخی پێدراو بێنن. ئینجا کڕیارەکان ئەو بەڵێندەرانەیان هەڵدەبژارد کە بەرزترین نرخو ئەو بەڵێندەرانەشی کە بە باش دەزانرانو نرخی مام ناوەندیان پێبوو. بەو جۆرە بەڵێندەرەکە دەیتوانی داوای کڕینەکە لەگەڵ بەڵێندەرە بەباش زانراوەکە بگونجێنێت، لە کاتێکدا ئەو کڕیارە دەیزانی ئەو نرخەی لەلایەن بەڵێندەرە بەباش زانراوەکە هێنراوە کەمتر دەبێت.

ڕێم بدەن با چەند نموونەیەکتان لەسەر هەڵسوکەوتەکانی هالیبێرتۆن لەم بارەیەوە بۆ بێنمەوە:

لەبەرئەوەی ڕۆژانە ستافو کارمەندانی هالیبێرتۆن لە زیادبوون دابوو، بۆیە پێداویستی بۆ مێزو کورسیش زیادی دەکرد. بەڵێندەرەکان هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی هالیبێرتۆن لە کوێت دەستیان کردبوو بە کڕینی ئەو پێداویستیانە، کەسیش لە نرخەکانی نەدەپێچایەوە. بە کورتی پێداویستیەکان دەهێنرانو مامەڵەکانیش ئەنجام دەدران. هەر یەك لە لێژنەکانی کڕینو کارگێڕی هالیبێرتۆنیش لەو بارەیەوە دەیانگوت:" گەڕان بە دوای بەڵێندەری تر پارەی تێدەچێت بۆیە کاتی خۆتان بە فیڕۆ مەدەن." هەر بۆیەش زۆربەی پێداویستی نووسینگەکانی هالیبێرتۆن پڕکرانەوە بێ ئەوەی نرخی ڕکابەر هەبێت بۆ کڕینیان.

لەلایەنی خۆشمەوە ئەرکی گەڕان بەدوای سەرچاوەی ترو

هێنـانی نرخـی تـرم گرتـە ئەسـتۆ، لـە کۆتاییـدا تـوانیم کۆمەڵێك نرخی جیا لەلای چەند فرۆشیارێکەوە بەدەست بێـنم. چـەند نرخێکی کورسـیو مێـزم پەیـدا کـرد، بـە جۆرێـك بـۆ هـەر مێزێکـی نووسـینگە ۲۰ دۆلار و بـۆ هـەر کورسیەکیش ۱۰ دۆلار هەرزانتر. دوای ئەوەی لێکم دایـەوە گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە دەکرێت ساڵانە ۵۰۰۰ تـا ۶۰۰۰ دۆلار بگێڕدرێتـەوە. مەبەسـتم ئەوەیـە دەکرێـت نرخـی جیـاواز لـە کوێـت دەسـتەبەر بکرێـت. بـەلام کێـشەکە لـەو لیستەیە کە تـەنیا نـاوی بەڵێنـدەرە بـە بـاش زانراوەکـانی تێدایـە. ئامانجیـشم لـەو روونکردنەوەیـە دەرخـستنی ئـەوەبوو کـە هـالیبێرتۆن لـە توانـای دا هەیـە خـەرجیو تێچووەکان کەم بکاتەوە. ۲٤

لەوەلامدانـەوەی تۆمەتـەکانی بـانتنیگ، وتەبێـژ بـە نـاوی هـالیبێرتۆن خاتوو "کاپی گیست" لە بەردەم میدیاکانـدا بـەرگری لـە کۆمپانیاکـە دەکرد، بـەوەی نرخـی ئـەو پەشـتەماڵانەی کـە کۆمپانیاکـە داوایـانی کردبـوو بـۆ هەریەکێك تەنیا ۳ دۆلار بووە و مەبەستیش لە نەخشاندنی ئارمی بەشەکە ئەوەبووە تاکو لە دزین و بردن بیپارێزرێن.

لە مانگی حوزەیرانی ۲۰۰۲، کۆمەڵێك کارمەنـدی تـری وەك بـانتنیگ بـۆ گـەواهی دان لـە بـەردەم (لێژنـەی چاکسازی حکومـەت) لـە ئەنجوومـەنی نوێنەران ئامادەبوون. بـەلام "تـۆم دەیڤس" سـەرۆکی لێژنەکە کـە سـەر بـە کۆماریەکان و نوێنەری ویلایەتی ڤێرجینیا بوو، رێی بەو گرووپـە نـەدا قسە بکـەن. بۆیـە "هێنـری واکسمان" نوێنـەری ویلایـەتی کالیفۆرنیـا و سـەر بـە دیموکراتـەکانو ئەنـدامی هـەمان لێژنـەش. گەواهیو قسەکانی ئـەو کۆمەڵـە کەسەی وەرگرتو لە وێب سایتەکەی خۆیدا بلاوی کردەوە.

یەکێك لەو گەواهیدەرانە کە ناوی "مایك وێست" بوو، دەیگوت بەرلەوەی لە هالیبێرتۆن کاربکات، پێشتر بەڕێوەبەری ناوچەیی بووە لە کۆمپانیای "ڤالێرۆ ئینێرجی" لە بەرانبەر ٧٠٠٠٠ دۆلار وەك مووچەی ساڵانە. ناوبراو گوتی: "کاتێك کە زانیم دەرفەتێك هەیە بە مووچەیەکی بەرزتر لە هالیبێرتۆن، راستەوخۆ پەیوەندیم پێیانەوە کرد. دوای چەند خولەکێك ئەو ئافرەتەی کە وەڵامی پەیوەندیەکەمی دایەوە پێی راگەیاندم کەوا بە سەرپەرشتیکاری کرێکارەکان دامەزراوم بە مووچەی ١٣٠٠٠٠ دۆلار لە ساڵێکدا، مەسەلەکە ئەوەندە کتوپڕ بوو تەنانەت بەوەش رانەگەیشتم کورتەیەك لەسەر ژیانی پیشەییو بواری شارەزاییەکانم بنێرم."

لەگەڵ دەستبەکاربوونیشی لە هالیبێرتۆن، "وێست" ئاماژەی بەوە دەدا، سەرەڕای وەرگرتنی بۆ ئەو مووچە بەرزە، بەڵام لە راستیدا هیچ کارێك نەبوو بیکات. کە دەیگوت: "لە ماوەی شەش رۆژی کاردا لە کوێت تەنیا یەك رۆژ کارم دەکرد. رۆژێکیشیان بەرپرسەکەم داوای لێکردم بچم کار لەسەر بارهەڵگرێك (کرێن) بکەم، منیش پێم گوت مۆڵەتی ئیش پێکردنی ئەو ئامێرەم نیەو لە ژیانیشمدا کارم پێ نەکردووە، کەچی ئەو لە وەڵامدا گوتی کارپێخستنی زۆر ئاڵۆز نیەو خۆ کەسیش نازانێ تۆ مۆڵەتت نیە."

لەو رۆژەشی کە وێست گەیشتە بنکەی سەربازی ئەناکۆندا لە باشووری عێراق، نە خۆیو نە زۆربەی ئەو ٣٥ کرێکارەشی کە سەر بەو بوون هیچ کارێکیان نەبوو بیکەن. بۆیە سەرپەرشتەکانیان بەردەوام پێیان دەگوتن بە نێو کەمپەکەدا بسوڕێنەوەو خۆتان وا نیشان بدەن کەوا سەرقاڵی کارکردنن. دوای ئەوە خۆی و ستافەکەشی بۆ بنکەیەکی تر گوێزرانەوە لە ناوچەی ئەلئەسعەد، لەوێش بەهەمان شێوە لە ماوەی پێنج رۆژی کاردا تەنیا یەك رۆژ کاریان دەکرد. پێشیان راگەیانرابوو دەبێ رۆژانە ئیمزا لەسەر ١٢ کاتژمێری کارکردن بکەن. لەوێشەوە خۆی و کرێکارەکانی رەوانەی شاری

فەللوجە کران، هەر وەکو جارەکانی پێشوو هیچ کارێك نەبوو بیکەن تەنیا یارمەتیدانی بواری ئەمنی نەبێت. هەندێ جاریش گەڕان بەسەر کرێکارە عێراقیەکان بۆ دڵنیا بوون لەوەی ئاودەستەکان بە باشی پاك دەکەنەوە.

دەڵێ جارێکیان پێویستم بە هەندێ کەرەستە هەبوو بۆیە پرسیارم لە بەڕێوەبەری بنکەکە کرد کە ئاخۆ دەتوانم داوای دریلێك بکەم؟!

ئەویش لە وەڵامدا گوتی داوای چوار دریل بکە. منیش گوتم بەلام پێویستیم بە چوار نیە. گوتی گوێشی مەدەرێ ئەو کۆنتراکتەی کە هەمانە رێگە بە زێدە خەرجی دەدات. بۆیە منیش پرسیم واتە ئەوە چەکێکی (شیك) بەتاڵە بۆ داواکردنی پارە؟ سەرپەرشتەکەم بە پێکەنینەوە گوتی "بەڵێ" چەندین جاریش ئەو مەسەلەی بۆ کارمەندەکانی تر دەگێڕایەوە. بۆیە من وەك کارمەندێکی هالیبێرتۆن دلگرانم بەو هەموو درۆو نارێکیەی کە لەوێ هەبوو. وەکو باج دەرێکیش نیگەرانو توڕەم لەوەی کە هالیبێرتۆن ئەو هەموو پارەیە خەرج دەکات لە بەرانبەر کارێك کە ئەنجام نادرێت. ٢٥

## کیسەخەو و بەفر

کارمەندی تریش هەبوون بە هەمان شێوە باسیان لەو فرتوفێلانە دەکرد کە لە کڕینی شتومەك بە بڕی کەمتر لە ٢٥٠٠ دۆلار ئەنجام دەدرا. گروپی "ئەلحەساوی" بۆ پیشەسازی داوای لێکرا کە ٥٠٠ کیسە خەو دابین بکاتو لە هەمان شەویشدا بیگەیێنێتە بنکەیەکی سەربازی. بۆیە داواکەیان بەسەر چوار بەشی جیا، دابەش کرد کە هەر بەشێك ١٢٥ کیسەخەوی تێدا تۆمار بکرێت، بەو جۆرەش هەر بەشێك نرخەکەی دەگەیشتە ٢٥٠٠ دۆلار. ٢٦

سەرەڕای ئەوانەشی کە پێشتر باسکران، هالیبێرتۆن بەوەش تۆمەتبار کرابوو کە سوودی لە هەندێك ڕێنمایی ناڕوونی سوپا وەردەگرت. بۆ نموونە: داوایەکی پێشوەختە لە هالیبێرتۆن کرابوو بەوەی لە وەرزی هاویندا دەبێ سەهۆڵ بۆ سەربازەکانی بنکە سەربازیەکانی کوێتو عێراق دابین بکات. دەقی داواکەش بەم شێوەیە بوو:" بەڵێندەر بۆی هەیە چ ڕاستەوخۆ لە ڕێی بەرهەمهێنان وەیان لە ڕێی بەڵێندەری لاوەکیەوە بەفر دابین بکات کە شیاوی خواردنەوە بێت." بۆیە هالیبێرتۆن دەستی کرد بە دامەزراندنی کارخانەیەکی بەرهەمهێنانی بەفر لەگەڵ بەندەرێکیش بۆ دانان و گواستنەوەی سەهۆڵی بەرهەم هێنراو، هەروەها دوو ئامێری بەرهەمهێنانو دروست کردنی بەفری لە ڕۆژهەڵاتی تەکساسەوە هاوردە کرد، کە ڕۆژانە توانای بەرهەمهێنانی ٤٠ تۆن بەفریان هەبوو. دەستیشی کرد بە دامەزراندنی بیستو هەشت کرێکار بۆ ئەوەی بیست و چوار کاتژمێر لە کارکردن دابێت. لەوەش زیاتر کارگەکە توانای مۆرکردنی ئەو دەستەواژەیەی هەبوو لەسەر هەر پاکەتێك بەفری بەرهەم هاتوو:

.(KBR Iceworks Inc. Serving the US military)

وەکو چۆن لە نووسینێکی "ڕاسل گۆڵد" پەیامنێری ڕۆژنامەی وۆڵ ستریت دا هاتووە: " پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری دیلۆکسی بەفر، وا دەردەخات کە چۆن KBR ڕۆڵێکی بە هێزو دانسقەی بینیوە وەك تاکە دابینکاری خزمەتگوزاری تر بۆ سوپا. کۆنتراکتەکەی KBR لەگەڵ سوپا هاندان و بەخشیشێکی زۆری تێدایە، بۆ ئەوەی کەلوپەل و خزمەتگوزاری بە خێرایی بگەیێنو دڵی گەورە ئەفسەرەکان خۆش بکەن- بێ گوێدانە تێچوونو کاریگەری ئەو ڕێگا چارەیە." ٢٧

## تارمایی ماشێنەکان

هـالیبێرتۆن، سـەرەڕای کرێنـی پێداویـستیەکان، ئـەرکی گواسـتنەوەو گەیاندنیـشی بـۆ سـوپا پـێ سـپێردرابوو. بـۆ بەجێگەیانـدنی ئـەو ئەرکـەش کۆمپانیاکـە تـا کۆتـایی بـەهاری٢٠٠٤ بـڕی ٣٢٧ ملیـۆن دۆلاری لـە پـارەی بـاج دەرەکان خەرج کردبوو، واش چاوەڕوان دەکرا کە ٢٣٠ ملیـۆن دۆلاری تـریشی پێ بدرێت بۆ هەمان مەبەست.

بەڵام دوانزە لە شۆفێرە تازە و کۆنەکانیش، ئەوانەی کە بـە شـێوەیەکی رێـکو پێـک بـە درێـژایی ٤٨٢,٨ کیلۆمـەتر لـە نێـوان سـەربازگای سـیدار (دەکەوێتـە باشـووری عێـراق) و سـەربازگەی ئەنەکۆنـدا (لـە نزیـک شـاری بەغدا) هاتو چۆیان دەکـرد بـۆ هێنـانو بردنـی شـتومەكو پێداویـستی، بـە پـەیامنێری "نایـت رایـدەریان" راگەیانـد بـوو کـەوا یـەك لەسـەر سـێی بارهەڵگرەکان بە بەتاڵی لێدەخوڕی.

زۆر جـاری واش هـەبوو شـۆفێرەکان ترێلەیـەکی بـەتاڵ دەبـەنو لـەو سەریـشەوە ترێلەیـەکی بـەتاڵ دێننـەوە. "دەیڤـد وێڵـسۆن" کـە بەرپرسـی کاروانی ترێڵەکان بووە بۆ زیاتر لە ١٠٠ کاروان، دەڵێت: "جارێکیـان ٢٨ تـرێڵە بەڕێکەوتین، لە کۆی هەر ٢٨ ترێڵەکـە، تـەنیا یـەکێکیان یـەك سـندوقی داری کـە بـۆ گواسـتنەوەی شـتومەك بـەکاردێت بـارکردبوو (لـە کاتێکـدا هـەر ترێڵەیەك توانای بارکردنی ٣٦ لەو سندوقانەی هەیە) کەچـی ترێلـەکانی تـر گشتیان بەتاڵ بوونو هیچ شتێکیان بارنەکردبوو" بۆ پشت راست کردنەوەی ئـەو قـسەیەی ویڵـسونیش، چـوار لـەو شـۆفێرانەی کـە بەشـداری هـەمان کاروانیان کردبوو دووپاتی قسەکەی ناوبراویان دەکردەوە.

دوای ئەوەی هـالیبێرتۆن لەسـەر کارەکـەی لایـدا، ویڵـسۆن گەڕایـەوە بـۆ باشووری رۆژئـاوای فلۆریـدا. نـاوبراو درێـژە بـە قـسەکانی دەدات و دەڵێت: "

مەبەستیش لە کاروانەکە بریتی بوو لە گەیاندنی کەلوپەلی هەستیارو گرنگ بۆ سەربازەکانی سوپا بۆ ئەوەی لە کردە سەربازیەکاندا بەکاریان بێنن، تەنیا شت ئێمە لە پێناویدا ژیانمان دەخستە مەترسی، بریتی بوو لە گەیاندنی ترێلەی بەتاڵ."

ناوبراو لە گەواهیدانێکیدا کە بۆ"هێنری واکسمانی" ناردبوو، باسی لە نەبوونی چاودێریکردنی تێچوونەکانو سیستەمی گونجاوی پاراستنی کەلو پەلەکان. کە دەڵێت: "لەو کاتەی گەیشتمە بنکەی (عەریفجان) لە کوێت لە تشرینی دووەمی رابردوو، سەرنجی ئەوەم دا نزیکەی ٥٠ تا ١٠٠ جۆر لە ماشێنو بارهەڵگری تازە وەستابوون بێ ئەوەی بەکاریان بێنن."

دیسانەوە درێژە بە قسەکانی دەدات:

> دوای پێنج مانگی تر، کە گەڕامەوە بۆماڵەوە. لە هەمان شوێن ژمارەیەکی زۆری بارهەڵگرەکان هێشتا هەر لەوێ وەستێنرابوونو بەکارنەهێنرابوون، ئەمانە هەموو لۆری گەورەی مارسیدسو ڤاڵڤۆ بوون کە نرخی هەر یەکێکیان نزیکەی ٨٥٠٠٠ دۆلار بگرە زیاتریشە. وەکو چۆن ئەو شۆفێرانەی کەوا لەو کاروانانەدا کاردەکەن پێت دەڵێن کەوا KBR هیچ کارێکی ئەنجام نەدابوو بۆ دانانو دامەزراندنی شوێنی چاککردنەوەو بەردەوامی پێدانی ئەو ترێلانە. جگە لەوەش ماوەی چەند مانگێک بوو کە هیچ جۆرە فلتەرێکی رۆنو گاز نەمابوو. چەندین جار داوای ئەو فلتەرانەم دەکرد بەلآم بێ ئەنجام بوو. پێیان وتم باسی گۆڕینی رۆن مەکە. لەوەش زیاتر KBR هەر لە کوێت گشت تایە سپێرەکانی لەو ئۆتۆمبێلانە دەکردەوە بۆیە گەر لە ڕێگا تایەك پەنچەر بوایە ئەوا

> دەبوو سەیارەکەمان لە شوێنی خۆی بەجێ بهێشتایە تا عێراقیەکان تالآنی بکەن، ئەمەش شتێکی شێتانە بوو. بیرم دێت جارێك کە ئەمە روویدا بە خۆمم دەگوت: " ئەوە لۆریەکی ۸۵۰۰۰ دۆلاریت لە کیس چوو تەنیا لە بەر تایە سپێرێك." جارێکیان ترێلەیەکمان لە دەست دا چونکە سۆندەیەکی زیادەی هایدرۆلیکی کلاجەکەیمان پێنەبوو کە بایی ۲۵ دۆلارە ۲۸.

یەکێك لەو شۆفێرانەی کە لەگەڵ هالیبێرتۆن کاریان کردووە ناوی خۆی ئاشکرا نەکرد، فلیمێکی ڤیدیۆیی گرتووە لە کانوونی دووەمی ساڵی ۲۰۰٤ بۆ پازدە ترێلەی بەتاڵ کە بە رێگاوەن. بەدەنگی خۆی لە فلیمەکە بەو جۆرە باسی دەکات: "ئەوە تەنیا نموونەیەکە بۆ ترێلە بەتاڵەکانی کە لێمان دەخورپن، زیاتریش هەن لە دوامەوە. یەکێکی تریش ئەوە لەولاوەیە...ئەوە ساختەبازی و ماف خواردنە."

حەوت لەو دوازدە شۆفێرەی کەوا لێدوانیان بۆ پەیامنێری"نایت ریدەر" دابوو، داوایان کردبوو ناوەکانیان ئاشکرا نەکرێت. لەگەڵ ئەوەش هالیبێرتۆن شەش لەو دوازدە شۆفێرەی دەرکرد بە بیانووی ئەوەی لە رێگاو بانەکاندا شۆفێرە عێراقیەکانیان ناچار دەکرد لەسەر شەقامی ڤیر لابدەن گەر بیانویستایە خۆیان بخزێننە ناو کاروانەکانیان. بەلآم ئەوان ئەو تۆمەتانەیان رەت دەکردەوە.

سەرەڕای ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ شۆفێرەکان، "نایت ریدەر" پێداچوونەوەی کردبوو بۆ تۆمارو دۆکیومێنتی ئەو سەفەرە بەتالآنەو دەیەها وێنەی کامیۆنەکانو هەروەها ئەو کاسێتە ڤیدیۆیەی کە پانزە ترێلەی بەتاڵ لە یەك کارواندا دەردەخات.

لە راگەیاندنێکی "لیندا تاهیس" وتەبێژی هێزی سەربازی ئەمریکی لە

رۆك ئایلەندی سەر بە ویلایەتی ئیلینۆی، لە وەلامی ئەو تۆمەتانە دەڵێت: "رەنگبێ مەبەستی سەرکردە سەربازیەکانو بەرپرسەکانی هالیبیرتۆنیش لەو کارانەدا، گرتنە بەری رێوشوێنی ئەمنی بووبێت." بەرزترین رێژەی هاتوچۆکردنی ئەو ترێلانە لە مانگەکانی کانوونی دووەمو شوباتو ئاداری ٢٠٠٤ دا بوون، لەگەڵ زیادبوونی راددەی هێرشەکانیش بۆ سەر ئەو کاروانانە دوو تا سێ ئەوەندە، سوپا رایگەیاند کەوا ئەو جۆرە تاکتیکە بێ ئاکامە.

کاربەدەستەکانی هالیبێرتۆن، هۆکاری ئەنجامدانی ئەو کاروانە بەتالانە بۆ کەمی بارەکانی نێو ئەمبارەکان دەگێرنەوە – بۆیەش کۆمپانیاکە ئەو کاروانانەی بە بەتاڵی ئەنجام داوە بۆ ئەوەی ترێلەکان لە کاتی گەڕانەویاندا گشتیان لە بەردەست دابن لە حالەتێك گەر هاتوو باری زیاد هەبوو- بەلام شۆفێرەکان ئەو روونکردنەوەیان رەت کردەوە. وەکو چۆن یەکێك لەو شۆفێرانە کە نەیویست ناوی راستەقینەی خۆی بلێتو خۆی بە"سوێرفی" ناودەبرد، دەڵێت:" ئێمە هەندێ جار کە لەگەڵ کامیۆنی بەتاڵ دەردەچووین لەسەرەکەی تریشەوە بە بەتاڵی دەهاتینەوە واتە لە شوێنەکەی تریش بار نەبوو. بۆیە هەر بە بەتاڵی دەچوینو بە بەتاڵیش دەگەڕاینەوە." ٢٩

## لە دزینی تەکنەلۆژیاوە بۆ رووتکردنەوەی باج دەرەکان

هالیبێرتۆن پێشینەیەکی دوورو درێژی هەیە لە پەیرەوکردنی میکانیزمی ناڕوونو گوماندار لە دامەزراندنی کارمەندەکانی و هەروەها سوود بینینیش لە هەلقۆستنەوەی گرێبەستیەکان. کۆمپانیاکە لەسەر دەستی "ئێرل هالیبێرتۆن" لە ساڵی١٩١٩دامەزراوە، بە مافنامەیەکی داهێنانی (براوە الاختراع) دزراو لە کۆمپانیا دایکەکەی پێشووی ( The Perkins Oil Well Cementing Company)٣٠. ساڵ لە دوای ساڵ کۆمپانیاکە فراوانتر دەبوو تا گەیشتە ئەو راددەیەی ببێتە گەورەترین کۆمپانیای

دابینکردنی کەلوپەلو پێداویستی لە جیهاندا بۆ کۆمپانیاکانی نەوت هەر لە ئێکسۆنەوە تا شێڵ. لە زۆربەی پرۆژەکانی لێدانی بیری نەوت لە جیهاندا، کۆمپانیاکە قازانجی زۆری دەکرد. بەپێی گوتەی هەندێك کەس قازانجی کۆمپانیاکە لە رادده بەدەر بووە. بە تاوانی دیاریکردنی نرخەکانی (قۆرخ کردن)، لە میانەی جێبەجێکردنی پرۆژەکانی بیناکردنو دامەزراندنی بیرە نەوتیەکانی نێو دەریا لە کەنداوی مەکسیکدا بۆ ماوەی شانزە ساڵ، کۆمپانیاکە لە حەفتاکاندا ٩٠ ملیۆن دۆلاری وەکو غەرامە بەسەردا سەپێنرا.٣١ لە ساڵی ٢٠٠٢ کۆمپانیاکە دانی نا بەوەی کە یەکێك لە کارمەندەکانی لە نەیجیریا دەسگیر کراوە بە تۆمەتی هەوڵدان بۆ پێدانی ٢,٤ ملیۆن دۆلار وەکو بەرتیل بۆ یەکێك لە پشکنەرەکانی باج. ٣٢

کۆمپانیای "براون ئەند روت سێرڤس" کە کۆمپانیایەکی ئەندازیاریو بیناکردنەوەی لاوەکیە. لە ١٩١٩ لەلایەن هەردوو برا "جۆرج و هێرمن براون" بە هاوبەشی لەگەڵ ژن براکەیان "دان روت" دامەزرێنراوە. کۆمپانیاکە لەسەرپەرشتی کردنی دانانی شۆستەی رێگاوبانەکان گەشەی کردووە بۆ کارکردن لە بواری دانانو بیناکردنی پرۆژەی زەبلاحو ئاڵۆزی وەك دانانی بەندەرە نەوتیەکان، دروستکردنی بەنداوەکانو هەروەها دروستکردنی کەشتی جەنگیش، لە رێی پاڵپشتیو یارمەتی سیاسەتمەدارە دەست رۆیشتووەکانەوە.٣٣ "رۆبرت کارۆ" لە میانەی نووسینەوەی بۆ سەرگوزەشتەی "لیندۆن جۆنسن"دا٣٤ ئاماژەی پێدەکاتو دەڵێت: "پەیوەندی نێوان کۆمپانیای براون ئەند روت و لیندۆن جۆنسۆن پەیوەندیەکی هاوسوودبینی بووە، پاداشتی ئەو پەیوەندیەش وەرگرتنی کۆنتراکتی گەورە بووە لە حکومەت – هەر لە پرۆژەی دروست کردنی بەنداوی تەکساسەوە تا بوونی بە هاوبەش لە دەستەبەندیەکی پێك هاتوو لە چوار کۆمپانیا، کە ٨٥٪ کارەکانی بیناکردنی ژێرخانی پێویست بۆ سوپایان

پێ سپێردرابوو لە شەڕی ڤێتنامدا.٣٥

ئەو کاتیش رەخنەیەکی زۆر لە کۆمپانیاکە دەگیرا، بەوەی قازانج و سوود لە شەڕ دەبینێت کۆنترۆڵو چاودێری کردنی بۆ کارەکانی لەدەست داوە: لە راپۆرتێکی نووسینگەی ژمێریاری گشتیدا (GAO)دا هاتووە، کەمو کورتی لە ژمێریاری ١٢٠ ملیۆن دۆلاری کۆمپانیاکەدا هەیە. هەروەها رێ و شوێنەکانی تایبەت بە چاودێریکردنی دارایی و موڵکەکانی کۆمپانیاکە ئەوەندە لاوازە، بووەتە هۆی دزینی بایی ملیۆنەها دۆلار کەلوپەلو پێداویستی. ٣٦

لەو کاتە "دۆناڵد رامزفێڵد" کە ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران لە سەر لیستی کۆماریەکانو نوێنەری ویلایەتی ئیلینۆی بوو، داوای روونکردنەوەی کرد سەبارەت بەو پەیوەندیە ٣٠ ساڵەی نێوان "ليندۆن جۆنسۆن" کاتێک لە پۆستەکانی ئەندامی کۆنگرێس، سیناتۆر، جێگری سەرۆکو ئینجا سەرۆکیش دابووە، لەگەڵ "جۆرج براون"ی سەرۆکی کۆمپانیاکە، کە بڕی ٢٣٠٠٠ دۆلاری بەخشیبووە سەرۆکی ناوبراو، بۆ ئەوەی مافی ئەندامێتی لە یانەیەکدا وەربگرێت، ئەوەش هاوکات بوو لەگەڵ سەرقاڵبوونی کۆنگرێس بە تاوتوێ کردنی پێدانی پرۆژەیەکی تری چەند ملیۆن دۆلاری بە کۆمپانیای ناوبراو.( هەر بۆ روونکردنەوەش، ئەو کاتە نرخی بەشداریکردن لە یانەکە تەنیا ١٠٠٠ دۆلار بووە) ٣٧.

## هەڵوێستێکی هەڵخەڵەتێن

هەر لەگەڵ کەمبوونەوەی دەسەڵاتی دیموکراتەکان لە ئەنجوومەنی نوێنەراندا، هالیبێرتۆن، زیرەکانە رووی کردە کۆماریەکان، بە شێوەیەک کە لەلایەن کۆماریەکانەوە بەرگری لێ دەکرا، هەمان ئەو کۆماریانە دەیانگوت، هێرشەکان تەنیا تۆمەتبارکردنێکی بێ بەڵگە بوونە بۆ"دیک

تـشینی"(جێگـری سـەرۆکی ئێـستا و بەڕێوەبـەری جێبـەجێکاری پێـشوتری کۆمپانیاکـە)و لـە چوارچـێوەی هەڵمەتـەکانی هەڵبژاردنـدا کـراون. راسـتە دیموکراتـەکانو رەخنـەگرانی تـریش لـە کاتی هەڵبژاردنـەکانی سـاڵی ٢٠٠٤دا هێرشـێکی زۆریـان دەکـردە سـەر کۆمپانیـای نـاوبراو، بـەڵام هەنـدێ راسـتی حاشاهەڵنەگریش هەن کە ئەو تۆمەتانە پشت راست دەکەنـەوە. بـە کـورتی هالیبێرتۆن خاوەنی گەورەترین گرێبەستی حکومەتی ئەمریکیە لـە عێـراق، کە قازانجەکەی سێ ئەوەندەی قازانجی کۆمپانیای بەکتلی گەورە رکابـەرێتی. کـۆی داهـاتی کۆمپانیاکـە لـە عێـراق تـەنیا لـە ساڵی٢٠٠٣، گەیشتە ٣،٩ ملیـار دۆلار، واتـە بـە رێـژەی ٦٨٠٪ زیـاتر لـەو داهاتـەی لـە سـاڵی ٢٠٠٢دا بەدەسـتی هێنابوو، کە بریتی بوو لە ٤٨٣ ملیۆن دۆلار. ٣٨

هالیبێرتۆن چۆن توانیوێتی ئـەو هـەموو گرێبەسـتیە قـازانج بەخـشانە بە دەست بێنێت؟ لەوانەیە زۆربەی رەخنەگرەکان بەو جۆرە وەڵام بدەنەوە: "بە هۆی پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ کاربەدەستە دەست رۆیـشتووەکان". بـەڵام کاربەدەسـتەکانی کۆمپانیاکـە دەڵـێن، ژمـارەی ئـەو کۆمپانیانـەی کـەوا وەکو ئێمە شارەزان لـەو جـۆرە کارانـە زۆر کـەمن. بـەڵام ئەمـە ئـەو راسـتیە پشتگوێ دەخات کە کۆمپانیاکە توانیوێتی بە کردەوە سیستەمێکی مـۆدێرنی بۆ پارەکێشانەوە لە سوپای ئەمریکی داڕشتووە بە هاوکاریو یارمـەتی تـەنیا یەك کەس: کە "دیك چێنی"یە.

چێنی وەکو سیاسەتمەدارێك، ماوەی ٣٥ ساڵە لە واشنتۆن رۆڵ دەگێرێت. سەرەتای کاریـشی لـە پایتـەختی وڵاتـە یـەکگرتووەکان لـە سـاڵی١٩٦٩دا بـووە، کاتێـــك وەك یاریـــدەدەری تایبـــەتی بەڕێوەبـــەری نووســـینگەی دەرفەتـــە ئابووریەکان دەست بـەکار بـووە. لـە ساڵی١٩٧١، بۆتـە یاریـدەدەری سـتاف لـە کۆشـــکی ســـپی، دوای ماوەیـــەکی کـــورتیش، پۆســـتی یاریـــدەدەری بەڕێوەبـەری"ئەنجوومـەنی تێـچوونی گـوزەران" تـا سـاڵی١٩٧٣ وەرگرتـووە.

ئینجا دوای ئەوە بۆ ماوەی ساڵێك لە كەرتی تایبەت خاوەن كاری خۆی بووە. دووبارە لە ساڵەكانی ١٩٧٤-١٩٧٥ گەڕایەوە كۆشكی سپی و پۆستی جێگری یاریدەدەری سەرۆك "گیراڵد فۆرد" پێدرا. دوای ئەوە لە١٩٧٥-١٩٧٧پۆستی بەڕێوەبەری ستافی كۆشكی سپی وەرگرت. لە تشرینی دووەمی ١٩٧٨دا، تشینی بە نوێنەری ویلایەتی "وایمینگ" لەسەر لیستی كۆماریەكان بۆ كۆنگرێس هەڵبژێردرا. كە زۆربەی ساڵەكانی هەشتاكان ناوبراو لە كۆنگرێس خزمەتی دەكرد ٣٩.

لە ساڵی ١٩٨٨، دوای هەڵبژاردنی جۆرج بۆشی باوك بە سەرۆكی ئەمریكا، چێنی پۆستی وەزیری بەرگری پێدرا. دوابەدوای تەواوبوونی قۆناغی شەڕی سارد مەسەلەی "داهاتەكانی ئاشتی- Peace dividend" هاتە پێش، بۆیە چێنی ئەركی كەم كردنەوەی هێزو نەهێشتنی چەك‌و داخستنی بنكە سەربازیەكانیشی پێ سپێردرا. سەیریش نەبوو كەوا تەواوی ئەندامەكانی كۆنگرێس دژی ئەو مەسەلەیە وەستانەوە، چونكە پشتیان بە پارەی تەرخان كراوی حكومەت بۆ سوپا(*نووسەر زاراوەی Pork-barrelی بەكار هێناوە، كە زاراوەیەكی سیاسییەو ئەمریكیەكان بەكاری دەهێنن، بۆ دەربڕینی ئەو خەرجیانەی كەوا سیاسەتمەدارەكان ئەنجامی دەدەن بۆ پاداشت كردنەوەی دەنگدەرەكان لە بەرانبەر پشتگیری كردنیان بۆ ئەو سیاسەتمەدارانە لە كاتی هەڵمەتەكانی هەڵبژاردندا، وەرگێر*) دەبەست بۆ كڕینی دەنگەكانی هەڵبژاردن لە ناوچەكانیان. بەڵام چێنی ئەو شتەی زۆر بەلاوە گرنگ نەبوو. بۆیە داوای بڕینی گشت خەرجیەكانی سوپای كرد كە (سەرف دەكرا بۆ ناوچەی هەڵبژاردنەكانی دیموكراتەكان بە تایبەتیش لەو ناوچانەی كە هەموو كەسانی دیموكراتخوازی ناودار بوون وەك، "تۆماس داونی، دەیڤد بۆنیۆو جیم رایت" خەریكی هەڵمەتەكانی هەڵبژاردن بوون). "جەین مایەر" لە نیویۆركەر دەڵێت، یاریدەدەرێكی دیموكراتەكان كە لەو

سالآنەدا ئەندامی لیژنەی خزمەتگوزاریەکانی هێزە چەکداریەکانی سەر بە ئەنجوومەنی نوێنەران بووە، پێی وتم: "بە پێچەوانەی ئەو وێنەیەی کە بۆ خەڵکی دەردەکەوت وەك کەسێکی میانڕەوو هێمن و قسە نەرم و کەسایەتیەکی گشتگیر، چێنی پارتیزانێکی توند بوو. وەك سیاسەتمەدارێکیش بەردەوام پشتی بەرانبەرەکەی لە زەوی بدات." هەروەها ناوبراو دەڵێت سەرچاوەکە پێی گوتوە: " چێنی زۆر قینی لە ئەندامانی کۆنگرێس دەبۆوە کە بە (کۆمەڵێك مێشوولەی بێزارکەر) ناوی دەبردن." لە هەمان کاتیشدا پەیوەندیەکانی لەگەڵ ناوەندی کارو خاوەن کارەکان قووڵتر دەبوو. یاریدەدەرەکە لە درێژەی قسەکانیدا بۆ مایەر دەڵێت: " کاتێك کە چاوی بە خاوەن کارەکان دەکەوت و کۆبوونەوەی لەگەڵدا دەکردن دەگەشایەوە." ٤٠

بە کۆتایی هاتنی ئەرکەکەی چێنی، بۆ یەکەمین جار بوو کە ژمارەی سەربازەکان، لەوەتەی شەڕی کۆریاوە بگاتە نزمترین ئاستی، هالیبێرتۆنیش هەموو هەوڵەکانی خستبووە گەڕ بۆ کارکردن لەسەر ستراتیژیەتێکی تایبەت بە دابینکردنی یارمەتی و پاڵپشتیەکی بەپەلە بۆ بیست هەزار سەرباز بە بڕی ٣,٩ ملیۆن دۆلار. دوای خوێندنەوەی توێژینەوەی یەکەم، کاربەدەستەکانی پینتاگۆن، بڕی پێنج ملیۆن دۆلاری تریشیان دایە هالیبێرتۆن بۆ تەواوکردنی ستراتیژیەتەکەی. دواتر لە ئابی١٩٩٢، هالیبێرتۆن لەلایەن بەتالیۆنی ئەندازیاری سوپای ئەمریکیەوە دەستنیشان کرا بۆ ئەنجامدانی پلانێك لە چوارچێوەی کۆنتراکتێك بە ناوی (پرۆگرامی زیادکردنی لۆجستی مەدەنی،LOGCAP). کۆنتراکتەکەش بریتی بوو لە"وەسڵی قەرەبوو کردنەوەی تێچوونی زیادەو گەیاندنی کراوەو بێ سنووری خزمەتگوزرایەکان"، واتە بەخشینی دەسەڵات و بودجەیەکی کراوە لەلایەن حکومەتەوە بۆ ناردنی هالیبێرتۆن بۆ هەر شوێنێکی دونیا بە

مەبەستی دابینکردنی پێداویستیەکانی سوپا. لەگەڵ ئەوەی پێنتاگۆن پێشتر بەڵێندەری تایبەتی بەکار دەهێنا، کەچی هەرگیز بەو جۆرە پشتی بە تەنیا یەك کۆمپانیا نەبەستبوو. پەراوێزی قازانجەکانیش کەمتر بوون لەوەی لە کارەکانی کەرتی تایبەتدا هەبوون، بەڵام قازانجی دەسەبەر کراو، لە نێوان١-٩٪ بوو، بەمەش کۆمپانیاکەی لە حاڵەتی زەرەر دەپاراست.

لە کانوونی یەکەمی ١٩٩٢، لە چوارچێوەی ئەو گرێبەستیە نوێیەدا، هالیبێرتۆن دەستی کرد بە دابینکردنی پێداویستی بۆ سەربازەکانی سوپای ئەمریکی کە چاودێری کارەساتە مرۆییەکانیان دەکرد لە سۆماڵ. بیستو چوار کاتژمێر دوای گەیشتنی هێزەکانی ئەمریکا بۆ مەقادیشۆ، هالیبێرتۆن دەستی کرد بە ناردنی کارمەندەکانی. دوای ئەوەی لەساڵی ١٩٩٥ ئەوێی جێهێشت، بوو بە گەورەترین خاوەن کار لە ئەمریکا، گرێبەستی بۆ ئەنجامدانی زۆربەی کارە ناخۆش‌و بێ نرخەکانی لە دەرەوە ئیمزا دەکردو لە بەرانبەریشدا پسپۆرو لێزانی لە بوارە پێویستەکاندا دەهێنا. بۆ ئەو کارەشی لە سۆماڵ بڕی ١٠٩ ملیۆن دۆلاری پێدرابوو، کاتێکیش کە ئەو وڵاتەی جێهێشت گشت ئەو کارمەندانەی دەرکرد کە بە گرێبەستی کاتەکی دامەزرێنرابوون، کە ئاژاوەیەکی زۆری لێ کەوتەوە.

یەکێك لە پەیامنێرەکانی رۆیتەرز کە لەوێ بوو رووداوەکەی بەم جۆرە وەسفکرد:

> ئەو خۆپیشاندانانەی بەردەم کۆمپاوەندی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە لەلایەن کرێکارە سۆماڵیەکان ئەنجام درا، بۆ دەربڕینی نارەزایی دژ بە بڕیاری دەرکردنیان لەلایەن کۆمپانیایێکی ئاوەدانکردنەوەی ئەمریکی، ئەمڕۆ بە کوتەك‌و گازی فرمێسك رژێن کۆتایی پێ هێنرا. ئەو کرێکارە دەرکراوانە بۆ چاککردنەوەی رێگاو بانەکان

دامـەزرێنرابوون. بـە پێـی گوتـەی "ئیوگـون فێرسـۆن" وتەبێـژی نەتـەوە یـەكگرتووەكان لـە سـۆماڵ، ژمـارەی كرێكـارە دەركراوەكـان ٩١ كرێكـار بـووە، بـەلاّم چـەند سەرچاوەیەكی تری سۆماڵی ئاماژەیان بەوە دەكرد كەوا ژمـارەی خۆپیـشاندەرەكان خـۆی لـە ٥٠٠ كـەس دەدا. فێرسۆن دەڵێ: " دوای دانووستانەكان هیچ ئەنجامێكیان نەبوو، سەربازەكانی سەر بە نەتەوە یەكگرتووەكان بە بـەكارهێنانی كوتـەك و گـازی فرمێـسك رژێنـەوە هـەوڵی دوورخـستنەوەی كرێكارەكانیـان دەدا بـۆ دەرەوەی كۆمپاوەندی نەتەوە یەكگرتووەكان لە مەقادیشۆ." ٤١

خەونە سیاسیەكانی چێنی لە پێنتاگۆن كۆتاییان پێهات كاتێك جۆرج بۆشـی بـاوك لـە هەڵبژاردنـەكانی سـاڵی ١٩٩٢ لـە بەرانبـەر بیـل كلینتـۆن دۆڕانـدی. بـۆ مـاوەی سـاڵێك نـاوبراو بـە ناچـاری لـە دەرەوەی پێكهاتـە ئاڵۆزەكـانی حكومـەت مایـەوە، كـە دووبـارە لەگـەڵ كۆنـە كۆنتراكتەرەكـەی "هالیبێرتۆن" كەوتە كاركردن. (كارمەندەكانی حكوومەت تـا مـاوەی سـاڵێك لـە وادەی بەجێهێشتنیان بـۆ كارەكانیـان لەگـەڵ حكومـەت، بۆیـان نیـە كـار لەگـەڵ ئـەو كۆمپانیانـە بكـەن كـە پێشتر مامەڵەی كـارو بازرگانیـان لەگـەڵ حكومەتدا كردووە، بەلاّم دوای ئەو ماوەیە -ساڵەكە- بۆیـان هەیـە و زۆریـش لەوانە توانیویانە سامانی باش كۆبكەنەوە لە ئەنجامی پێكهێنان یـان چوونە ریزی ئەو گرووپە فشارانەی تایبەتن بە كاركردن بۆ بەرژەوەندی كەسانێك، كـە رۆژێـك لـە رۆژان كارمەنـدی ئـەوان بوونـە) ئـەو پۆسـتەی تـشێنیش پۆستێكی ئاسایی نـەبوو: كرایـە بەڕێوەبـەری جێبـەجێكار سـەرەڕای ئـەوەی هـیچ جۆرە شارەزاییەكیـشی نـەبوو لـە كـاری كۆمپانیاكـان. ئـەوەی چێنیش لەگەڵ خۆیدا هێنای هەریەك لە "رۆلۆدۆكس" كە متمانەیەكی زۆری پێبـوو

هەروەها "دەیڤد گریبی" سەرۆکی پێشووی ستافەکەی، کە هەردووکیانی لە سەرووی گرووپی فشار دانا. ناوبراوان هەردووکیان لە دوا دوو ساڵی کارکردنیان لە کۆمپانیاکەدا، بڕی ١,٥ ملیار دۆلاریان لە قەرزە فیدراڵیەکان و بیمەو بەخشینە داراییەکان پچڕیەوە، لە بەرانبەر پارەیەکی کەم ١٠٠ ملیۆن دۆلاری بەدەست هاتوو لە ماوەی پێنج ساڵ پێش ئەوەی چێنی دەست بەکاربێت. بەخشینە داراییەکانی حکومەت پاڵپشتیەکی باشی بۆ هالیبێرتۆن دەسەبەرکرد لە بواری بەدەست هێنانی گرێبەستیەکانی تایبەت بە خزمەتگوزاریەکانی نەوت لە جەزائیر، ئەنگۆلا، بەنگلادێش‌و روسیاش. لەوەش زیاتر، هەر لەو کاتەدا کۆمپانیاکە توانی ٢,٣ ملیار دۆلار پاشەکەوت بکات لە ئەنجامی گرێبەستیەکانی لەگەڵ حکومەتی ئەمریکی، بە واتایەکی تر یەکسانە بە دوو ئەوەندەی بڕی ١,٢ ملیار دۆلاری بەدەست هاتوو لە حکومەتەوە لە ماوەی پێنج ساڵ بەر لەوەی چێنی پۆستەکەی وەربگرێت لە کۆمپانیای ناوبراو. ٤٢

دواتر لەسەروبەندی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٠ جۆرج بۆشی (کوڕ) داوای لە "دیك چێنی" کرد، چەند ناوێکی بۆ کاندید بکات بۆ پۆستی جێگری سەرۆك، بەلام چێنی بەتەوازوعەوە پێشنیاری خۆی کرد بۆ ئەم پۆستە. کاتێکیش لە ساڵی ٢٠٠٠، وازی لە هالیبێرتۆن هێنا بۆ ئەوەی لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکاندا یاوەری جۆرج بۆش بکات، پێی باش نەبوو ئەو پارەیەی کە لەدوای جێهێشتنی کارەکەی پێی دەدرێت، بەیەك جار وەری بگرێت، بەڵکو لەبری ئەوە لە ماوەی پێنج ساڵدا پێی بدرێت، تاکو باج نەیگرێتەوە. هەر بۆیەش هالیبێرتۆن پێدانی پارەکەی دواخست بۆ ساڵەکانی دواتر بەم شێوەیە: لە ساڵی٢٠٠١، بڕی ٢٠٥,٢٩٨ دۆلار. ساڵی ٢٠٠٢، بڕی ١٦٢,٣٩٢، هەروەها بۆ ساڵی ٢٠٠٣، بڕی١٧٨,٤٣٧دۆلار. ئەوەی جێگای تێبینی کردنیشە، هەر بڕێك لەو بڕە پارانە نزیك بوو لە مووچەی

سالآنەکەی وەکو جێگری سەرۆك کە دەگەیشتە۱۹۸,۰۰۰دۆلار. ٤٣

لـەوەش زیـاتر دەسـتەی بـەڕێوەبردنی کۆمپانیاکـە بڕیـاری دا پاداشـتی پێشوەختەی خانەنشینی بۆ خەرج بکات، هەرچەندە تەمەنی کەمتر بوو لەو تەمەنەی کە بۆ خانەنشین بوون دیاری کرابوو لـە کۆنتراکتەکـە. بـەم جۆرە چێنی لەگەڵ وازهێنانی لە کۆمپانیای ناوبراو، تـوانی کۆمـەڵێك دەسـتکەوتی خانەنشینی وەك پشك‌و مافی تایبەت لە کۆمپانیاکە بایی ملیۆنەها دۆلار بـە دەست بێنێت، بێگومان گەر دەستی لە کار بکێشابایەوە ئەوا ئەو دەسکەوتەی دەستەبەر نەدەکرد. ئەمڕۆ ناوبراو خاوەنی ٤٣٣٠٠٠ پشکی کۆمپانیاکەیە، کـە بەهاکەی بە زیاتر لە ١٠ ملیۆن دۆلار دەخەملێنرێت و بە پێی گۆڕانی نـرخی پشکەکانیش دەگۆڕێت. ٤٤

لە راپۆرتێکی دەزگای توێژینەوەی سەر بە کۆنگرێس، کە لەسـەر داوای سـیناتۆر "فرانـك لـۆتینبێرگ" نوێنـەری نیوجێرسـی سـەر بـە لیـستی دیموکراتەکان ئامادەکرابوو، هاتووە: "ئەو بڕە پـارە دواخراوانـەی کـە چـێنی وەك پاداشتی خانەنشین بوونی لـە هـالیبێرتۆن وەریگرتـوون، هـەروەها ئـەو پشکانەشی کە هەیەتی، "بە یەکێك لەو "پەتانـە" دادەنرێـت کـە بـە خـاوەن کـاره پێـشووەکانی دەیبەسـتنەوە، کـە لەوانەیـە ببێتـە بەرژەوەندیـەکی هاوبەشـی دارایـی بـەردەوام لەگـەڵ ئـەو خـاوەن کارانـە، ئـەویش رەنگبـێ پێکداکێشانی بەرژەوەندیەکان لە نێوانیان دروست بکات."

ئـەوەش پێـچەوانەی راگەیاندنەکـەی چـێنی بـوو کـە لـە رێکـەوتی ٢٠٠٣/٩/١٤ بـۆ کـەناڵی تەلـەفزیۆنیNBC دابـووی لـە میانـەی بەرنامـەی چاوپێکەوتنی رۆژنامەوانی، کە گوتبووی:"وا بـۆ سـێ سـاڵ دەچێت کـە هـیچ جۆرە بەرژەوەندیەکی داراییم لەگەڵ هالیبێرتۆنـدا نـەبووەو ئێـستاش هـیچ جۆرە بەرژەوەندیەکم نیە، چونکە هەموو پەیوەندیەکانم لەگەڵ کۆمپانیاکە بڕیوەو وازیشم لە گشت بەرژەوەندیە داراییەکان هێناوە."٤٥

دوای وازهێنـانی لـە کۆمپانیاکـەو دەسـبەکاربوونی وەکـو ئەنـدامێکی تیمەکەی بۆش، نـاوبراو"دیڤد گریبینـی"یـشی لەگەڵ خۆی بـردو کردیـە بەڕێوەبـەری پەیوەندیـەکانی نێـوان کـۆنگرێس‌و تیمـی گـوێزراوەی بـۆش-تشینی. ئەرکی گریبن لەو پۆستەیدا بریتـی بـوو لـە بـەڕێوەبردنی پرۆسـەی پەسەندکردنی کاندیدەکان بـۆ وەزارەتـەکانی کابینـە نوێیەکە، هـەروەها بـە هاوکـاری ئەنـدامانی کـۆنگرێس‌و حـاکمی ویلاتـەکان کـاری لەسـەر یەکلاکردنەوەی پرۆسەی دامەزرانـدنی ئیـدارە تازەکـەیان دەکـرد. دواتـریش گریبن کاری حکومەتی جێهێشت بـۆ ئـەوەی سـەرۆکایەتی گروپێکـی سیاسـی داکۆکیکار لە کارە ئابووریە گەورەکان بکات. ٤٦

دوای ئـەوەی گـریبن وازی لـە هـالیبێرتۆن هێنـا کەسـێکی بـە توانـا شـوێنەکەی گرتـووە، کـە بـووە سـەرۆکی گرووپـی فـشاری کۆمپانیاکـە لـە واشنتۆن: ئەویش ئەدمیراڵ "جۆ لۆپێز" بوو کە ئەفسەرێکی تازە خانەنشین کراو بوو لە هێـزی دەریـایی ویلایەتـە یـەکگرتووەکان، هـەروەها سـەرکردەی پێشووی هێزەکانی ئەمریکاش بوو لە باشووری ئەوروپا. لە سەرووی هـەموو ئەوانەشەوە کەسێکی نزیک‌و متمانە پێکراوی دیک چێنی بـوو. دوای ئـەوەی لـە سـاڵی ١٩٩٩دا دەسـت بـەکار بـوو، یەکـەم کـاری لـۆپێز لـە هـالیبێرتۆن سەرپەرشتی کردنی کۆنتراکتێك بوو بایی ١٠٠ ملیۆن دۆلار، بۆ پەرەپێـدان و پتەوکردنی ١٥٠ کونسوڵخانەو باڵیۆزخانەی ئەمریکی لەسەرتاسـەری جیهانـدا بۆ پارێزگاری لێکردنیان لە هێرشی تیرۆریستی. لە مانگی ئاداری ٢٠٠٢ لۆپێز کرایـە ئەنـدامی لێژنەیـەکی پێکهێنـراو لەلایـەن هـەردوو پـارتی کۆمـاری‌و دیموکرات، تایبـەت بـوو بـە ئاوەدانکردنـەوە، دوای ململانێیـە چـەکداریەکان، کە لەلایەن "سەنتەری ستراتیژی‌و توێژینـەوە نێودەوڵەتیـەکان" دامـەزرێنرا بۆ داڕشتن‌و پێشکەشکردنی پرۆپۆزەڵی تایبەت بە هاندانی بەشداریپێکردنی زێـتری ئەمـەریکا لـە هەوڵـەکانی دووبـارە ئاوەدانکردنـەوە لـە جیهانـدا، بـە

تایبەتیش لەو ولاتانەی کە تازە لە حاڵەتی شەڕو ململانێی سەربازی دەرچوونە، وەك ئەفغانستانو بۆسنەو کۆسۆڤۆ. ئەو لێژنەیەش لە حەوت سیناتۆرو نوێنەری کۆنگرێس پێکهاتبوو، کە بێگومان دۆستی بە کەڵکن لە کاتی تەرخانکردنی پارەو بودجە بۆ پرۆپۆزەڵەکانی ئاوەدانکردنەوە. ٤٧

## شەڕی ئەفغانستان

لە ساڵی ٢٠٠٢، گوومانم هەبوو بەوەی قەیرانێك دێتە بەردەمی هالیبێرتۆن کە لە بناغەوە هەڵی بتەکێنێت. سەفەری ئەفغانستانو ئۆزباکستانم کرد، بۆ ئەوەی بزانم تا چەند هالیبێرتۆن دەستی هەبووە یان بەشداری کردووە لە پرۆسەی جەنگو لە ناوبردنی تاڵیبان. بەڵام هەر زوو کۆمپانیاکە ڕەتیکردەوە بەوەی هیچ شتێکی لەو ناوچەیە کردبێت. لە ناوەڕاستی نیساندا، وتەبێژی کۆمپانیاکە "زەلما برانك" پێی گوتم: "براون ئەند روت نە بۆ ئەوێ نێردراوەو نە هیچ ئەرکێکیشی پێ سپێردراوە بۆ دابینکردنی پاڵپشتی لە هیچ لەم دوو ولاتە."

لە هەمان رۆژدا سەرچاوەیەکی سەربازی هەندێ زانیاری نهێنی پێدام. بە پێی ئەو زانیاریانە پێشبینیەکەم راست بوو، بەڵام تەنیا کەمێك زوو کەوتم: لە رۆژی ٢٦ نیسانی ٢٠٠٢، سێ لە کارمەندەکانی هالیبێرتۆن گەیشتنە بنکەی ئاسمانی خان ئاباد لە ناوەڕاستی ئۆزباکستان، بەمەبەستی خۆشکردنی زەمینە بۆ سەرەتای بەشداریکردنی مەدەنی لە بنکەی سەربازی ئەمریکی لە ئەفغانستان (گۆڕەپانی داهاتووی رووداوەکان). دوای دوو هەفتەش، ژمارەی کارمەندەکانی هالیبێرتۆن گەیشتە ٢٨ کارمەند. بۆ رۆژی ١٠ تەمووز، ١٣٠ کەسایەتی سەربازی شوێنی کارمەندەکانی کۆمپانیای ناوبراویان گرتەوە. کە ئەوان (سەربازەکان) پێشتر سەرپەرشتی رۆژانەی کارەکانی دابینکردنی کەلوپەلی پێویست بۆ بیناکردنی دوو بنکەی

سەربازیان دەکرد، هەریەکیان شوێنی حەوانەوەی ١٠٠٠ سەربازی سەر بە خاوەن بێریە سەوزەکانو فیرقەی دەیەمی چیایی لەخۆدەگرت.

ئەو سەربازانەی کەوا تازە دەگەیشتنە بنکەکە، لەلایەن کارمەندەکانی کۆمپانیای "براون ئەند روت" دابەش دەکرانە سەر شوێنی حەوانەوەیان کە بۆ خۆجیاکردنەوە لەسەربازەکانی تر پانتۆڵی خاکیو تی شێرتی رەشیان پۆشیبوو لەگەڵ نانەسەری کڵاوی بەیسبۆڵ. لەوەش زیاتر کۆمپانیاکە ئەرکی جل شتنو ئامادەکردنی خواردنو کارەکانی خومەتگوزاری بنکەکەو شوێنی فرینو نیشتنەوەی فرۆکەکانی پێ سپێردرابوو. لە ماوەی چەند مانگێکیشدا کۆمپانیاکە بەرپرسیارێتی بەرێوەبردنی بنکەکانی "باگرام" و "قەندەهار"یشی وەرگرت.

لە رێی لێدوانێکی تەلەفۆنی لەگەڵ "مایک نۆڵ" سەرۆکی پلان و کردارەکانی گرێبەستی (LOGCAP)، کە چاودێریو سەرپەرشتی "براون ئەند روت"ی دەکرد، لە سەرکردایەتی پاڵپشتیکاری کردە سەربازیەکانی ئەمەریکا لە ئەسکەندەریەی سەر بە ویلایەتی ڤێرجینیاوە پێی راگەیاندم:"بەڵێندەرە مەدەنیەکان توانای دابینکردنی پێداویستیە جۆراوجۆرو گۆراوەکانی سوپایان هەیە. ئێستا لە توانامان دایە تەنیا لە ماوەی ٧٢ کاتژمێردا کۆمپانیا تایبەتەکان بڵاو بکەینەوە، کەچی لە رابردوودا ئەو پرۆسەیە ١٢٠ تا ١٨٠ رۆژی دەخایاند." ٤٨

دوای ئەوەی ئەندازیارەکان هەموو شتەکانیان دامەزراند، لە نیوەی دووەمی هەمان ساڵدا پێنتاگۆن پێشبینی رۆڵی زیاتری بۆ هالیبێرتۆن دەکرد لەوەی تەنیا کردارەکانی بەردەوامی پێدانو پاراستن ئەنجام بدات. لەو کاتەی کەوا کۆشکی سپی فشارەکانی بۆ سەر سەدام حوسێن زیاد دەکردو دەشیزانی لە تواناادا هەیە پێداویستی سەربازەکانی لە ماوەیەکی کورتدا دابین دەکرێن، بەتالیۆنی ئەندازیاری سوپا دەسبەجێ بۆ بیناکردنو

ئامـادەکردنی چـەند بنکەیـەکی سـەربازی تـازە لـە بیابـانی کوێـت بـۆ داگیرکردنێکی چاوەڕوانکراوی عێراق گرێبەستیان لەگەڵ کۆمپانیاکەدا کرد.

ئەو کاربەدەستانەی سوپا ئەوانـەی لەگەڵ هالیبێرتۆن کاریـان دەکـرد، گوتیـان لـەڕێی کـاری هاوبەشـەوە تـوانراوە تێچوونەکان کـەم بکرێنـەوە. بـە بەراورد لەگەڵ کۆی تێچووی پێدانی مووچـەی سـەربازەکانی سـوپا، تێچووی هالیبێرتۆن بۆ هەمان کار ( کە ئەوانیش دەیدەنە بەڵێندەری لاوەکی) تـەنیا بەشێك دەبێت. بە هەمان شێوە کۆلۆنێـل "رۆد کـەترایت" گـەورە بەرپرسـی پلان دانان لە (LOGCAP) لە باشووری رۆژئاوای ئاسیا، گوتی: "ئێمـە لـە ماوەیەکی کورتدا دەتوانین دەسـت بکـەین بـە کڕینـی کەرەسـتەی بیناسـازی، هەروەها کرێکار لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا بەکاربخەین‌و دەست بـەکاربین. ئەوەش مانای ئەوەیە کە پێویستیمان بـە ژمارەیـەکی کـەمتری سـەربازەکانی تایبەتمەنـد بـە دابینکردنـی خزمـەتگوزاری دەبێـت بـۆ پاڵپـشتی کـردن‌و دابینکردنی کەرەستەی پێویست بۆ بیناکردنی شوێنەکە." ٤٩

لـە ئـەیلولی ٢٠٠٢، "جـۆیس تـایلۆر" لـە نووسـینگەی بـەڕێوەبردنی پرۆگرامـی سـەرکردایەتی کەرەسـتە سـەربازیەکانی ئـەمریکی، گەیـشتە ئەفغانستان بۆ سەرپەرشتی کردنی نزیکەی ١٨٠٠ کارمەنـدی هـالیبێرتۆن. کـە خـەریکی دامەزرانـدنی خێمـەو دروسـتکردنی کـەمپی حەوانـەوە بـوون بـۆ دەیـان هـەزار سـەرباز. کەسـی بەرپرسـیش لەلایـەن هالیبێرتۆنـەوە بـۆ ئـەو ئەرکە، بە رێککەوت، کەسێك بوو کە پێشتر بۆ ماوەی سی‌و دوو سـاڵ هـەمان کاری بۆ سوپا دەکرد: "رۆبەرت بـەتش گـاتلین" کـە کەسـێکی لاوازی تەمـەن پەنجاو نۆ ساڵی و دانیشتووی شاری "تەنەسی" بوو لە ئەمریکا. ئەو شتەشی کە جیاواز بوو، ئەوەبوو ناوبراو نزیکەی دوو ئەوەنـدەی مووچـەکەی دەسـت دەکـــەوت، ئـــەویش تـــەنیا لـــە رێـــی دانـــانی جلـــە ســـەربازیە هەڵخەڵەتێنەریەکانیـەوەو زیـاتر پۆشـینی جـل‌و بـەرگی مـەدەنی. بـە

پەیامنێری نیویۆرک تایمزی گوت: "کاتێك کە گەیشتینە ئێرە، نە کارەباو نە ئاویش هەبوو، هەزار کەسیشم هەبوو کە رۆژانە ٢٤ کاتژمێر لێرە کاریان دەکرد. بێگومان ئەو کارە بە سوپا ناکرێت." ٥٠

لەماوەی چەند هەفتەیەکدا ئەو کرێکارانەی هالیبێرتۆن، تەپۆلکەو بەرزایەکانی بیابانی باکوری کوێتیان گۆڕی بۆ بنکەیەکی سەربازی کە دواتر بووە شوێنی حەوانەوەی نزیکەی هەشتا هەزار سەربازی بیانی، واتە نزیکەی ١٠٪ دانیشتوانی کوێت. وەك ئاماژەیەکیش بۆ رووداوەکەی ١١ سێپتێمبەری ساڵی ٢٠٠١، ژمارەیەك لەو کەمپانە ناوی هەندێك لە شارە ئەمریکیەکانیان لێ نرا، وەك "کەمپی نیویۆرك، کەمپی ڤێرجینیا و کەمپی پێنسلڤانیا."

بنکەی سەرەکی ئەو ئەرکەش کەمپی "ئەرفجان" بوو، کە دەورە درابوو بە لێژگەو رێڕەوی چەورێژکراو، لەگەڵ دانانی مێزو کورسی پلاستیکی بە جۆرێك کە هەستێکی پێ دەبەخشی وەك ئەوەی لەماڵەوە بیت، لەلاکەی تریشەوە مەقاڵەی برژاندنی گۆشت، مەکینەی پیپسی، یانەی وەرزشیو لەشساغی، هۆڵی فێربوونی سەماو باڵ، لەو لاشەوە ئەڵقە ئاسنینە هەڵواسراوەکانی تۆپی سەبەتەو تۆڕی تۆپی باڵەش کە لە نزیك هۆڵی خواردن دانرابوون سیمای سەربازەکانی دەگەشاندەوە. ٥١

ئەوە یەکەم بنکەی نێوخۆیی هالیبێرتۆن نەبوو بۆ دابینکردنی پاڵپشتی بۆ کردە سەربازیەکان. بەر لەوە نزیکەی ١٥٠٠ کارمەندی هالیبێرتۆن لە بنکەی سەربازی "ئەنجەرلیك" لەنزیك شاری ئەدەنە دامەزرێنرابوون کە یەك کاتژمێر بە لێخوورینی ئۆتۆمبێل لە لێواری دەریای ناوەڕاستەوە بۆ ناوەڕاستی تورکیا دوور بوو. لێرەوە ئەوانە پاڵپشتی نزیکەی ٢٠٠٠ سەربازی ئەمریکیان دەکرد کە ئەرکی چاودێریکردنی ناوچەی باکووری عێراق تا هێڵی پانی ٣٦یان پێ سپێردرابوو (بە ناوچەی یاساغ کردنی فرینی فرۆکەی عێراقی ناسرابوو)، لە رێی فرۆکە جەنگیەکانی جۆری "F-١٥" سترایك ئیگل

و "F-16". ٥٢

وەکوچۆن مەیجۆر "تۆنی کێمپەر" بەرپرسی کاروباری گشتی بنکەکە دەڵێ، هەرزانی دەستی کاری بێگانە هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ پەنابردنە بەر خزمەتگوزاری هێزی کاری بیانی: " هاندەری سەرەکی سوپا لە پەنابردنە بەر گرێبەستی کردن، لەبەرئەوەیە کە لە هەندێ بواری دیاریکراودا کاریگەری بەسەر تێچوونەکانەوە دەبێت. مەبەستمە بڵێم، لە ساڵانی رابردوودا گەلێ توێژینەوە ئەنجام دراون سەبارەت بەوەی چ جۆرە خزمەتگوزاریەك لە رێی بەڵێندەرەکانەوە پێشکەشی سوپا بکرێت؟ چونکە کاتێك کە گرێبەستی دەکەین، ئەوا ناچار نابین پارەی خزمەتگوزاری تەندروستیو گشت خزمەتگوزاریەکانی تریش بۆ کرێکارەکان خەرج بکەین، چونکە تێچووی ئەو جۆرە خزمەتگوزاریانە دەکەوێتە ئەستۆی بەڵێندەرەکانەوە." ٥٣

## عێراقی داگیرکراو

لە نیسانی ٢٠٠٣، کاتێك کە سەربازە ئەمریکیەکان دەستیان بەسەر عێراقدا گرت، هالیبێرتۆن ئەندازیارەکانی بلاوەپێکرد بۆ یارمەتیدان لە کوژاندنەوەی ئەو بیرە نەوتیانەی کەوا گریان گرتووەو چاککردنەوەی ئەوانەشی کە دارماون. ( سەربازەکانی سەدام حسین، دوای ئەوەی بە شکاوی لە کوێت کشانەوە، لە ساڵی ١٩٩١ گریان بەردایە بیرە نەوتیەکانی ئەو وڵاتە. بۆیە سوپای ئەمریکی ترسی دووبارەبوونەوەی هەمان شتی هەبوو، بەلام ئەمجارە ترسەکەیان لە شوێنی خۆی نەبوو چونکە تەنیا حەوت بیرە نەوت ئاگری گرتبوو). سەرپەرشتیکاری ئەو پرۆسەیەش، عەمیدی ژەنەراڵ "رۆبەرت کریر" بوو لە بەتالیۆنی ئەندازیاری سوپای ئەمریکی. لە رۆژانی دوای شەڕ، هەفتانە دوو جار لە کوێتەوە دەچوو بۆ کارە نوێیەکەی. بە

ڕۆژنامەی "تەکساس"ی گوت: " ئەوە دووبارە بیناکردنەوەی وڵاتێکە، ئەوە دەسپێکردنەوەیە لە خاڵی سەرەتا." ٥٤

"دان باوم" لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری "نیویۆرك تایمز"دا بەو جۆرە ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە:

هەوڵی زۆر بۆ وەگەڕخستنەوەی پیشەسازی نەوتی عێراقی، ڕۆژانە لە دووری دوو سەعات لە سنووری عێراقەوە لە هۆتێلی "لاڤیش کراون پلازا" کە دەکەوێتە شاری کوێت دەست پێدەکات. هۆڵی نانخواردنی هۆتێلەکە ڕێك لە کاتژمێر پێنجی بەیانی دەکرێتەوە، زیاتر لە ریزێك لە پیاوە تەمەن ناوەڕاستەکان بە یەك پۆشی ( جل و بەرگی وەرزشی (تراکسوت) و هەمان جۆری کاسکێتی گۆڵفیش) دەبەستریێت لەبەر دەم بۆفێی نانخواردنی بەیانی، کە خۆیان لە زەلاتەو لەبنە (جۆرێکی ماستە) لادەدەن‌و دەست بۆ نانی برژاوی فەڕەنسی‌و گۆشتی بەرازی سوورکراوە دەبەن. لە دەرەوەش چەند ریزە ماشێنێکی بەرزی رەنگ رەساسی وەستاون‌و دوای نانخواردنێکی خێرای بەیانی، سووك بەرەو ئەو ماشێنانەی کە روو لە باکوورن دەچن، هەر دوولای هەر ماشێنێکیش پیتی "V" لەسەر نیشان کراوە وەکو ئاماژەیەك بەوەی ئەو ماشێنانە ئەمریکی‌و بەریتانین. ڕێگاکەش بە نێو بیابانێکی پڕ لە بەردو تەخت وەك سێنی تێدەپەڕێت‌و دەروربەریش بە زەحمەت دەبینرێ چونکە بەقەد تێبڕینی چاو کەش و هەواکە تۆزاویە یان پڕە لە چگڵ‌و بەرد، بەلام کەس بێزاری لەو کەشە دەرنابڕێت.

کەسەکانی نێو ماشێنەکانیش هەموویان لە یەك کاتدا خەریکی قسەکردنن، تەختەی سپی‌و کالکولەیتەریشیان بەدەستەوەیە، بۆ لێکدانەوەی دەیان هەزار گریمانەو کۆسپ‌و تەگەرە بەرلەوەی

بگەنە سەر بیرە نەوتەکانی عێراق. دووانیشیان بەر لەوەی کوێت جێبێڵین (کە دواتر تۆڕی مۆبایل نامێنێت) لە ڕێی مۆبایلەکانیانەوە، پەیوەندیان بە نووسینگە سەرەکیەکەیان دەکرد لە هیوستن لە ئەمریکا. کە بە زمانێکی نەرمی درێژدادڕی دزەکانی نەوت لە تەکساس و ئۆکلاهۆما قسەیان دەکرد، ئەوانە هاولاتی راستەقینەی جیهانن- یان بەلانی کەمەوە گۆشە سەرەکیەکانی بەهەمهێنانی نەوتن لە جیهاندا.

ئەوان دەستەو گرووپی کارمەندەکانی سەر بە کۆمپانیای "براون ئەن روت"بوون، کە کۆمپانیایێکی لاوەکی سەر بە کۆمپانیا زەبەلاحەکەی هالیبێرتۆنە بۆ کاروباری خزمەتگوزاریەکانی نەوت، کە لە مانگی ئاداردا کۆنتراکتێکی ماوە کۆتایی پێهاتووی نادیاری لە سوپا بەدەست هێنا بۆ وەگەڕخستنەوەی بیرە نەوتیەکانی عێراق. زۆربەیان چەندین ساڵ لە شوێنی سەخت و ناخۆش کاتیان بەسەر بردووە بگرە لەو شوێنانەش کە توندی تیژی لێ بووە لە پێناو دەرهێنانی نەوتی پەنگ خواردوو، هەریەکێکیش لەوانە پابەندە بە ڕێسا تایبەتیەکەی دەرهێنانی نەوت: "هیچ شوێنێك دووردەست نیە". ئەو دوانزە ساڵەی لە جەزائیر بەسەرت برد چۆن بوو؟ "خراپ نەبوو". ئەی ئەو شەش ساڵەی کەنداوی پرۆدهۆی؟ "خراپ نەبوو". ئەو چواردە ساڵەت لە نەیجیریا؟ "خراپ نەبوو". باشووری عێراق کە وشك و دوورە لە ئاوەدانی و بێ یاسایە، ئەویش ئەرکێکە وەك هەر ئەرکێکی تر. بگرە پارەیەکی باشیشیان پێ دەدرێت.

لەسەر سنوور، کە بۆ زۆربەی کوێتیەکان مامەڵەو کاغەزکاری نزیکەی کاتژمێرێك دەخایەنێ، کەچی ماشێنە بەرزەکانی ئێمە هەر

ئـەوەتا هێواشـیان کـردەوە. هـەر یەکـەو ناسـنامەی تایبـەت بـە کۆنتراکتەکـەیان لەگـەڵ وەزارەتـی بـەرگری ئـەمریکی لـە پـشت پەنجەرەکـەوە دەرخـست، پاسـەوانە کوێتیـەکانی سـەر سـنووریش ئاماژەیان بۆ کردن کە تێپەڕن. کەسیش کۆنترۆڵ دیوی عێراقی نـەدەکرد. دوای سـەعاتێك ڕۆیـشتن، گەیـشتینە بەنزینخانەیـەکی چۆڵ لـە جەرگـەی شـوێنێکی دوور. کـەمێك لـەولاتر دەسـتەیەك سـەربازی بـەریتانی لـە ژێـر سێبەری دیـوارێکی نیـوە داڕمـاو بـە چوارمشکی لەسەر لمەکە دانیشتبوون و خـەریکی نـانخواردن بـوون لەو پاکەتەی کەوا وەکو بەشە خۆراك بەسـەریاندا دابـەش دەکـرا. ئەوان تێکەڵەیەك بوون لەسەربازانی پیادەی ئەنـدازیاری سـەر بـە هێزی ئاسمـانی شاهانە (R.A.F) و لیـوای حەوتـەمی چەکداری- ناودارترین شەڕکەرانی بیابانن کە لـە جـەنگی دووەمـی جیهانیـدا لە باکووری ئەفریقیا شەڕی هێزەکانی ڕۆمڵیـان دەکـرد. کـاتێکیش کە خەریکی چالێنان بـوون لەسـەر ئاگردانێکی تەنەکـەی تەنکدا، "جـیم کـوو کۆجێـێ"ـی پاسـەوان و ڕێکخـەرێکی ماسـولکەداری کاروباری ئاسایش بوو لە KBR، لەبەردەم پەیژەێکی تەل وەستاو بە نێو ئەو بایە گەرمەدا هاواری کردو گوتی:

" توبـا تـانگۆ: پێویـستمان بـە دوو نیـشانگر هەیـە. دوو نیـشانگری تفـەنگی ئارسـەر پـاوەر ستەیـشن. چـوار نیـشانگریش بـە چـەکی GOSP سری ڕۆمیۆ..." – لە کوێتـەوە تاکو ئێـرە SUVـیەکان بێ مەترسی بوون لە نێو کاروانەکەدا، بـەڵام ئێـستا، کـە بـە تـەنیا دەکەونە ڕێگا، پێویستیان بە پاسەوانی چەکدار دەبێت. سـەربازە بەریتانیەکان، پاشماوەی خواردنـەکانیان فرێدایـە لایـەك و چـەك و ڕیزبەنـدی گوللـەکانیان لـەخۆ بەسـت و لەگەڵمانـدا کەوتنـە ڕێ.

ئـەوان لـەو سـەربازانە بـوون کـە زۆربـەیان بەشـداری شـەڕە سەختەکانی گرتنی بەسرەو ئوم قەسریان کردبوو. سواری لاند رۆڤەرەکانیان بوون و بە دوامـان کـەوتن بـەرەو بیرە نەوتیـەکانی عێراق. ٥٥

ئەوە ئـەزموونێکی وروژێنـەر بـوو بـۆ ئـەو ئەندازیارانـەی، بـەدوای مووچەیەکی ساڵانەی زیاتر لە ١٢٠,٠٠٠ دۆلار کەوتبوون. ئەو مووچەیەی کەوا عێراقیـەکان لـە خـەونیش دەستیان نەدەکەوت سەرەڕای ئـەوەش ترسی دەرکردنیان هەبوو لەسەر کارەکانیان.

لەلایـەکی دیکـەوە، پـەیامنێری "واشـنتۆن پۆسـت" هاوکـات لەگـەڵ گەشـتەکەی"بـوام" ئـەویش بـە هـەمان شـێوە سـەرقاڵی گەشـتێکی رۆژنامەوانی بوو، کە بەم جۆرە بەسەرهاتەکانی دەگێڕێتەوە:

کرێکارەکـانی بـەردەم کارگەکـە، بەلـەش خـاوی هەڵسانەوە سـەر پـێ، قـژیان لەبـەر بـای تـۆزاوی هـەمووی لـوولی خواردبـوو، خـەریکی گۆڕینەوەی جگەرەو ناسۆریەکانیان بوون لەگەڵ یـەکتری لەبـەربێ کاریو نەبوونی هیچ شتێکی تر کە بیکەن. ئـەوان بێزاربـوون لـەو تالاَنو دزیـەی کـە تەنانـەت کورسیەکیشی بـۆ نەهێشتبوونەوە تـا لەسەری دابنیشن، جگە لـە ئامێرێـك نـەبێت کـە دەبـێ شـارەزایانە بەکار بهێنرێت. دڵنیاش نـەبوون لـەوەی کـە کۆمپانیـا حکومیەکـە دەتـوانێ بـەردەوام بێـت لەسـەر پێـدانی مووچـەکانیان یـان نـا. پرسیاری ئەوەشیان دەکرد ئاخۆ جارێکی تر نەوتی خاو بە تـەوژم لـە بـیرە نەوتیەکانـەوە بـەرەو وێـستگەکانی پـاڵاوتن لـە بەسـرە دەچنەوە؟

دواتـر، ماشـێنێکی گرانبـەها لـە جـۆری GMC یۆکـۆن کـە پلێتـی ژمـارەی کـوێتی لەسـەربوو لـە دەروازەی دەرەوە نزیـك بـۆوە،

کەسێکی ئەمریکی بە ناوی "جیم هامفریز"، دەموچاو خڕ، پانتۆڵێکی کاوبۆیو کاسکێتێکی خاکی کە پیتەکانی KBR لەسەر نەخشێنرابوو لەسەری نابوو، خۆی گەیاندە ئەو دیوی کۆمەڵە کرێکارەکەو بە بێباکیەوە ئاماژەیەکی بەسەر کردوو چووە ژوورەوە. دوای چەند خولەکێك گەڕایەوە بۆ ناو ماشێنەکەیو وەلامی ئەو پرسیارەی نەدایەوە کە ئاڕاستەی کرا سەبارەت بەوەی چی بینی لە ژوورەوە. بەلای زۆر لەو کرێکارانەوە ئەوە شتێك بوو بەرنەدەگیرا. چونکە ئەوان خۆیان پەست و بێزاربوون لەو زەرەر و زیانانەی کە لە ئەنجامی ئەو دزین و تالآنە بەربلاوانەی دوای کۆتایی هاتنی شەڕ کەوتبوونەوە. لەوکاتەی "هامفریز" بێ باکانە هاتە دەرەوەو بەرەو ماشێنەکەی گەڕایەوە تاکو بڕوات، یەکێ لە وەستاوەکان بە ناوی "محمد موحی" کە تەکنیکار بوو بە عەرەبیەوە هاواری کرد: "پێویستە ئێوە هاوکار بن". ئینجا درێژەی بە قسەکانی داو گوتی: "ئەوان تەنیا فرمان دەکەنو هیچی تر نا، هیچ شتێکمان نادەنێ بۆ ئەوەی یارمەتیمان بدات لەکارەکانمان. ئەوە نەوتی ئێمەیە، شاری ئێمەیەو کۆمپانیاو ولآتی خۆشمانە. ئێمە دەمانەوێ دووبارە ئێرە چاك بکەینەوەو بەرەو پێش بڕۆین. هیچ کەرەستەو ئامرازو پارچەی یەدەگمان لەبەردەستدا نیە. ئەوانیش هیچ کارێك ناکەن تەنیا دێن سەیرێك دەکەن و دەڕۆن."

دوای پێنج خولەك، جێبێکی بیابانی-ڕەنگ لمی سەربازی بەریتانی، لەگەڵ ماشێنێکی تری ڕەنگ سیلڤەری بەرز هاتنە ئەوێ، شەش سەربازی تێدابوو- هەندێکیان ئەمریکیو هەندێکیشیان بەریتانی، کە هەموویان چەکی ڕەشاشیان هەلگرتبوو. هەرچەندە کە ژمارەی

کرێکارەکان خۆی لەبیستو پێنج کەسێك دەدا، بەڵام سەربازەکان ڕاستەوخۆ لە"محمد موحی" نزیکبوونەوەو لە ڕێی وەرگێڕێکەوە پرسیاری ئەوەیان لێکرد کە ناوی چیەو ئایا کارمەندی کارگەکەیە؟ دوای ئەوەی ناوبراو ناسنامەکەی پێ نیشان دان سەربازەکان لە نێو هۆیهاو گاڵتەی کرێکارەکانەوە ئەوێیان جێهێشت. ٥٦

کۆنتراکتەکانی نەوت تەنیا بەشێکی بچووك بوون لە سامانو داهاتێکی زۆر. چونکە بەرلەوەی ئەمەریکا کۆنترۆڵی خۆی بەسەر تەواوی عێراقدا بچەسپێنێ، هالیبێرتۆن بایی ملیارەها دۆلار کۆنتراکتی وەرگرتبوو لە بەرانبەر گشت کارەکان، لە ئامادەکردنی خۆراك بۆ سەربازەکان، سەرتاشینیان، شتنی جلەکانیان، پاککردنەوەی تەوالیتەکان، گەیاندنی پۆستەو نامە بگرە گواستنەوەی دیلە گیراوەکانی جەنگیش. وا دیارە تەنیا لە ماوەی شەش مانگدا داهاتی کۆمپانیاکە لە عێراق بەراددەیەکی خەیاڵی بەرز بۆوە.

## قسەڵۆکەکان سەبارەت بە سەرتێچوون

دەرکەوتنی یەکەمین ئاماژە بەوەی هالیبێرتۆن سنووری تێپەڕاندووە، ئەنجامی کارەکانی هەردوو ئەندامی کۆنگرێس بوو لەسەر لیستی دیموکراتەکان، "جۆن دینگڵ" و "هێنری واکسمان" کە کۆڵنەدەرانە بەردەوام بوون لەسەر نووسینو ناردنی نامە بۆ بەتالیۆنی ئەندازیاری سوپا، تیایدا داوای ووردەکاری زیاتری گرێبەستیەکانی کۆمپانیای هالیبێرتۆنیان دەکرد، ئەو کارەشیان هەر زوو لە دوای داگیرکردنی عێراق دەستی پێکرد. لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣ ڕاپۆرتێك لە نووسینگەی هەردوو ئەندامی ناوبراو دەرچوو، تیایدا هاتبوو کەوا هالیبێرتۆن بڕی ١،٥٩دۆلار بۆ هەرگالۆنێك

بەنزین (کە دەکاتە نزیکەی پێنج لتر) لە سوپا وەردەگرێت، بڕێکی لە رادده بەدەرە گەر بێتوو راستی ئەوە بزانرێت کە سوپا تەنیا بە ٠,٠٥ دۆلار بە عێراقیەکانی دەفرۆشێتەوە (نرخی بەنزین لە کاتی رژێمی سەدام). راستیەکی تری لەوەش سەرسوڕهێنەتر ئەوەبوو کاتێك لە مانگی کانوونی یەکەمدا ژمارە راستەقینەکان ئاشکرابوون- کۆمپانیاکە رێژەیەکی دادەنا بە بڕی ٢,٦٤ دۆلار بۆ هەر گالۆنێك بەنزین، لە هەندێ حاڵەتیشدا رێژەکە دەگەیشتە ٣,٠٦ دۆلار. هەر بۆ بەراوردکردن، بەشی دابینکردنی وزە (سووتەمەنی) سەر بە وەزارەتی بەرگری (ESC) هەمان کاری دابینکردنی سووتەمەنی دەکرد بەڵام لەبەرانبەر ١,٣٢دۆلار بۆ هەر گالۆنێك، هەروەها کۆمپانیای (SOMO) کە کۆمپانیایکی لۆکاڵی بوو بە هەمان شێوە لە بەرانبەر هەر گالۆنێك سووتەمەنی ٠,٩٦ دۆلاری دەدا. کۆی تێچووی کڕینی سووتەمەنی کە دەخرایە ئەستۆی باج دەرە ئەمریکیەکان بۆ ٦١ ملیۆن گالۆن لە کوێتو نزیکەی ١٧٩ ملیۆن گالۆنی تر لە تورکیا، لە نێوان مانگی پێنج تا کۆتاییەکانی مانگی دە گەیشتە زیاتر لە ٣٨٣ ملیۆن دۆلار. بە جیاوازی ١٠٠ ملیۆن دۆلار زیاتر لەوەی کە کۆمپانیا لۆکاڵیەکان یان خودی(SOMO)، یان (ESC) هەمان کاریان بکردبوایە.

وەك ئەوەی "فیلێ ڤێرلێگەر" ئابووریناس لە بواری نەوتو سەرۆکی کۆمپانیای راوێژکاری (PK verleger LLC) بە نیویۆرك تایمزی راگەیاند: "لە ژیانمدا شتی ئاوام نەبینیوە، ئەوە پاداشتکردنە لە رێی قۆرخکردنەوە، هەرچی کۆمپانیای دابینکردنی پێداویستی یان کۆمپانیا لاوەکیەکانی نەوت هەیە لە ئەمریکاو ئەوروپاش، دەمیان بۆ ئەم جۆرە گرێبەستیانە ئاو دەکات."

"وێندی هاڵ" وتەبێژی کۆمپانیاکە گوتی، تێچوونەکان زۆر بەرز بوون، چونکە زیاتر لە بیست لۆری کۆمپانیاکە زەرەریان پێ گەیشتووە یان دزراون،

نۆ شۆفێریش بریندرابوونەو شۆفێرێکیش کوژراوە لەو کاتەی کە خەریکی گواستنەوەی سووتەمەنی بوونە لە ناو عێراقدا. ٥٧

دوو رۆژ دوای ئەوە، رۆژنامەی "وۆڵ ستریت" ئەوەی ئاشکرا کرد، کەوا کۆمپانیای "ئەلتەنمیە" کە کۆمپانیایەکی لاوەکی دابینکردنی سووتەمەنیە، تایبەتمەند نیە بە گواستنەوەو گەیاندنی سووتەمەنی، بەڵکو تەنیا تایبەتمەندە لە بوارەکانی راوێژکاری وەبەرهێنان، پەرەپێدانی موڵك و عەقار، هەروەها بریکاری ئەو کۆمپانیایانەیە کە بازرگانی بە کەرەستەی سەربازی، ناوەکی، بایەلۆجی و کیمیایی دەکەن. سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیاکەش کەسێکە بە ناوی "نەجیب ئەلهومەیزی" کە ئەندامی خانەوادەیەکی ناوداری کوێتیە. چیرۆکەکەش تەمو مژاویتربوو کاتێك کە "وۆڵ ستریت" چەند بەشێکی لە نامەیەك بلاوکردبۆوە کە "ماری رۆبرتسۆن" ئەفسەری باڵای بەرپرسی کۆنتراکتەکان لە بەتالیۆنی ئەندازیاری سوپا نووسیبووی، تیایدا باسی ئەوەی دەکرد کەوا باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە کوێت فشاری دەخستە سەر کۆمپانیای هالیبێرتۆن بۆ ئەوەی گرێبەستی لەگەڵ کۆمپانیای "ئەلتەنمیە" بکات. وەك لە نامەکەدا هاتبوو: "هەتا حکومەتی ئەمریکی پارە بۆ ئەو خزمەتگوزاریانە بدات، ئەوا من ملکەچی ئەو فشارە سیاسیانەی حکومەتی کوێتی یان باڵیۆزخانەی ئەمریکی نابم، بەوەی کە کارێك بکەم دژی بیرو باوەڕم بێت، یان پارەیەکی زیاتر لە پێویست بدەم بۆکڕینی سووتەمەنی."

"جۆرناڵ" بلاوی کردەوە کەوا سەرچاوەیەك پێی راگەیاندووە، بەوەی باڵیۆزی ئەمریکی لە کوێت "ریتشارد جۆنس" کە وەکو یاریدەدەری "پۆڵ برێمەر"یش کاری کردبوو، داوای لە کاربەدەستانی هەر یەك لە هالیبێرتۆنو بەتالیۆنی ئەندازیاری سوپاش کردبوو، رێکەوتنەکەیان لەگەڵ "ئەلتەنمیە" تەواوبکەن بۆ هاوردەکردنی سووتەمەنی لە ئایندەدا، تەنانەت

گەر کۆمپانیاکە ڕێژەی نرخەکانیش دانەبەزێنێت. ٥٨

لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤، هالیبێرتۆن لە ناکاو ڕایگەیاند، دوو لە کارمەندەکانی خۆی دەرکردووە، چونکە بڕی شەش ملیۆن دۆلاریان لە کۆمپانیایێکی لاوەکی کوێتی وەرگرتووە لە بەرانبەر ئاسانکاری بۆ تەواوکردنی گرێبەستی تایبەت بە گواستنەوەی سووتەمەنی نەوت. کۆمپانیاکە جەختیشی لەسەر ئەوە دەکردەوە کەوا دەمودەست ئەو کێشەیەی بە پێنتاگۆن ڕاگەیاندووە. وەکو چۆن وتەبێژ بە ناوی کۆمپانیاکە دەڵێت: "پشکنەرە نێوخۆییەکانی ژمێریاری هالیبێرتۆن چەند ناڕێکییەکیان دۆزیەوە، کە ئەمەش پێشێلکردنی فەلسەفەو سیاسەتی کۆمپانیاکەمانەو هەروەها پێچەوانەی ڕێسا ئەخلاقیەکانیشمانە. بۆیە زوو ئاشکرامان کردو دەسبەجێ پشکنەری گشتیمان لێ ئاگادار کردەوە. ئێمە ئەم جۆرە ڕەفتارانە لە هیچ کەسێك کە لە هەرئاستێك‌و لە هەر کۆمپانیایەکی سەر بە هالیبێرتۆنیش بێت قبوڵ ناکەین."

هاوکات لەگەڵ ئەوەی باسکرا، ساختەییەکی تریش ئاشکرابوو. یاداشتنامەیەکی پێشوتری ئاشکرانەکراوی لقی نووسینگەی "وەکالەتی پێداچوونەوەی گرێبەستیەکانی بەرگری"، سیستەمی ناوخۆی هالیبێرتۆن لە ووردی هەڵسەنگاندنی تێچووی کارە بەردەوامەکان بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی هۆکاری خەرجیەکان بە "نەگونجاو" ئەژمار دەکات. یاداشتنامەکە بۆ زۆر لە کاربەدەستەکانی بەشی گرێبەستیەکانی سوپا نێردراوە. پێنتاگۆن ڕایگەیاند کەوا ناچار بووە دوو لیستی خەرجی پێشکەشکراو لەلایەن هالیبێرتۆنەوە ڕەتبکاتەوە، کە یەکێکیان بەهاکەی ٢,٧ ملیار دۆلار بوو، لەبەرهەبوونی چەندین "کەم‌وکورتی".٥٩

نووسینگەی "واکسمان" یاداشتنامەیەکی تری بلاّوکردەوە، تیایدا باسی کورتەیەك دەکات کە لە نووسینگەی ژمێریاری گشتیەوە (کە بەشێکی

لێکۆڵینـەوەی سـەر بەکۆنگرێـسەوە) لـە رۆژی ١٣ مـانگی شـوبات، درابـووە لێکۆڵـەرەوانی لیژنـەی چاکـسازی حکومـەت. لـە کورتەکـەدا هـاتووە، لـە یاداشـتنامەکەی واکـسماندا هـاتووە، کـەوا کاربەدەسـتەکانی نووسـینگەی ژمێریـاری گـشتی بـاس لـە لاوازی حکومـەت دەکـەن لـە رێو شـوێنەکانی چاودێریکردنێکی کاریگەر بۆ گرێبەستیەکەی هالیبێرتۆن. یاداشتنامەکەی نـاوبراو برگەیـەکی کورتەکـەی بـە نموونـە هێناوەتـەوە، بـەوەی هەنـدێك لـە کردارەکـانی چـاودێریو بەدواداچـوونی کۆنتراکتـەکان لەلایـەن سـەربازە یەدەگـەکان ئـەنجام دراون، کـە تـەنیا بـۆ مـاوەی دوو هەفتـە مەشـقیان وەرگرتووە.

لەوەش زیاتر، یاداشتنامەکە باسی لەوە دەکرد کەوا نووسینگەی نـاوبراو بـۆی دەرکـەوتووە یـەك لـە گرێبەسـتیەکان کـە بەهاکـەی ٥٨٧ ملیـۆن دۆلارە، تەنیا لە ماوەی دە خولەکدا پەسەند کراوە بە پشت بەسـتن بـە تـەنیا شـەش لاپـەرە لـە پـەڕاو. بـە پێـی راپۆرتـەکانیش، جیاوازیـەك بـە بـڕی ٧٠٠ ملیـۆن دۆلار هەبووە لە نێوان خەملاندنێکی هالیبێرتۆن بـە بـڕی ٢,٩ ملیـار دۆلار تایبەت بە دابینکردنی خواردنو کەرەستەو خزمەتگوزاری تری لۆجستی بۆ حکومەت، لەگەڵ ئەو کەم کردنەوەیەی کە کۆمپانیاکە برگە بە برگە لەسـەر نرخـی شـتومەکە خـەملێنراوەکان ئـەنجامی داون. دوای لێپێـچینەوەی وەزارەتی بەرگریش لەو خەملاندنە، کۆمپانیاکە کۆی گشتی خەملاندنەکەی گەیاندۆتە تەنیا ٢ ملیار دۆلار- سەرەڕای ئەوەش هەرگیز کەس ئـەوەی روون نەکردەوە کە بۆچی ئـەو خەملاندنـە ئـەو بـڕەی لێ کەمکرایـەوە تـا گەیشتە ئەو بڕە پارەیە.٦٠

هالیبێرتۆن دەڵێت، هۆکاری دروسـتبوونی ئـەو کێشەو گرفتانـە زۆرتـر لەبەر پەلکێشانی کۆمپانیاکەو بەرفراوان بـوونی بەرپرسیارێتیەکانی بـوون. بۆ نموونە، لە ئاگادارکردنەوەیەکی کورتی پێشوەختەدا، کۆمپانیاکەمان داوای

لێکرا کە ژەمە خۆراکی ١٣٠٠٠٠ سەرباز لە مانگی تەموزدا ئامادەبکات، کە دەکاتە نزیکەی سێ ئەوەندەی ٥٠٠٠٠ سەرباز کە لە حوزەیرانی ٢٠٠٣ خواردنی بۆ ئامادەکردبوون. وەکو چۆن"دەیڤ لیسار" سەرۆك و بەڕێوەبەری جێبەجێکار لە هالیبێرتۆن، لە لێدوانێکیدا بۆ رۆژنامەی "وۆڵ ستریت جۆرناڵ"، گوتی:"پێم وانیە خەڵکی لە سروشتی کاتی دیاریکراو بۆ ئەو کارانەی کە ئێمە دەیکەین تێبگەن. چونکە ئەوەی داوامان لێکراوە ئەوە نەبووە کە پێمان بڵێن: ئایا ئەو کارمت لە ماوەی دوو مانگ پێ جێبەجێ دەکرێت؟ بەڵکو پێیان گوتووین، ئایا سبەی ئەو کارمت بۆ ئەنجام دەدرێ؟"

## ناڕێکی ژمێریاری

بەلاّم پێنتاگۆن دەبوایە ئاگاداری ناڕێکی سیستەمی دارایی‌و ژمێریای هالیبێرتۆن بوایە، بە تایبەتیش کە لە گەڵێ بۆنەی جیاوازدا لەو مەسەلەیە ئاگادار کراونەتەوە. لە یاداشتنامەیەکی دەرچوو لە ئاداری ٢٠٠٢، "تۆماس وایت" کە عەریفێکی سوپایە، گلەیی خۆی بە نووسینێك بۆ سێ لە بریکارەکانی وەزارەتی بەرگری ناردبوو، کە گوتبووی: "زانیاری پشت ڕاستکراوەی پەیوەست بە گرێبەستی کرێکارەکان لە هیچ بەشێکی سوپا دانیە." بۆیە سوپاش ناتوانێ ئەو کرێکارانەی کە "پێویست نین‌و تێچوونیان زۆرە یان ئەوانەشی کە گرێبەستی نەگونجاویان لەگەڵدا کراوە" دەربکات بێ هەبوونی ووردەکاری تەواو لەسەر گشت کۆنتراکتەکان. ٦١

دواتر لە ڕێکەوتی ٢ ئابی ٢٠٠٣، دەزگای پێداچوونەوەی کۆنتراکتەکانی بەرگری، راپۆرتێکی لە ژێر ناونیشانی " راپۆرت لەسەر پێداچوونەوەو وردبینی سیستەمی کۆنترۆڵی خەرجیەکانی ناوخۆیی" بلاّوکردەوە. کە " کەم‌وکورتی بەرچاو"ی دۆزیتەوە لە رێ‌و شوێنەکانی خەرجی کە یەکەی خزمەتگوزاریەکانی کۆمپانیای کیلۆگ براون ئەند روت، کە پاشکۆی

هالیبێرتۆنە ئەنجامی داون.

ئەو کەمو کورتیانەش کاریگەری خراپیان هەبووە بەسەر توانای کۆمپانیاکە لە رووی تۆمارکردن، مامەڵەکردن، پوختەکردنو ناردنی راپۆرتەکانی تایبەت بە خەرجیەکانیشەوە. وەکو چۆن وردبینەکان هۆشیاری دەدەن، بەوەی ئەو "کەمو کورتیە زۆرانە" چاکنابنەوە گەر بێتوو کۆمپانیاکە سیستەمی رێکخستنی خەرجیەکانی چاکنەکاتەوە، بۆیە ئەنجامەکەشی، بریتی دەبێت لە زیادەڕەویەکی لە رادەبەدەر، یان کەمڕەویەکی لە رادەبەدەر لە تێچوونەکانی حکومەتدا. ٦٢

بەلام هەر بە تەنیا ووردبینو پشکنەرە بێئاگاکانی حکومەت نەبوون کە رەخنەیان لە سیستەمی دارایی هالیبێرتۆن دەگرت. بەڵکو بەڵێندەرە لاوەکیەکانی خودی کۆمپانیاکەش گلەییان لە لاوازی شێوازو سیستەمی ژمێریاری کۆمپانیاکە هەبوو. رۆژنامەی "وۆڵ ستریت جۆرناڵ" چاوپێکەوتنێکی کرد لەگەڵ ژمارەیەك لەو بەڵێندەرانەی کەوا نیگەران بوون لە شێوازو چۆنیەتی ئەنجام دانی هالیبێرتۆن بۆ رێو شوێنەکانی تایبەت بە ژمێریاری. "عەهدی پەترۆس" بەڕێوەبەری کۆمپانیای "ئیدریس بۆ بازرگانی" پەیوەندی بە هالیبێرتۆنەوە دەکرد، چونکە کۆمپانیاکە بۆ ماوەی مانگێك پارەی کرێی چەند موەلیدەیەکی دواخستبوو، دواتر دوای پێنج مانگ درەنگ خستن، ئینجا توانی پارەکەی وەربگرێتەوە. حاڵەتێکی تر لەوەی سەرەوە خراپتر، هی "جەیسن ڤارگیس" بوو، بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیای "فیتکۆ"ی تایبەت بەخزمەتگوزاری تەکنیکیو کۆمپیوتەرو ئامێری ئەلکترۆنی. کۆمپانیاکەی بڕی ٧٣٠٠٠٠ دۆلاری لای هالیبێرتۆن مابۆوە، کە رێکەوتی هەندێك لەو وەسڵانەی بەشێکی ئەو پارەیە بۆ نۆ مانگ لەمەوبەر دەگەڕایەوە. بە پەیامنێری رۆژنامەکەی گوت: "ئێمە تاکو سەرمان کەوتووینەتە نێو گلێ، بۆیە دەبێ بەردەوام بین لە پەیوندیکردن پێیانەوە تاکو بتوانین پارەکانمان بەدەست بێنینەوە." ٦٣

لە ئاداری ٢٠٠٤، لە وەڵامی لێکۆڵینەوە تاوانیەکانی کەوا لە لایەن دەزگای لێکۆڵینەوەی تاوانەکانی سەر بە وەزارەتی بەرگری دەستی پێکرابوو٦٤، هالیبێرتۆن رایگەیاند کەوا گشت داواکانی وەرگرتنی پارەی لە حکومەت راگرتووە، وەکو ئاماژەیەك بۆ پیشاندانی نیاز باشی. لە هەمان کاتیشدا، پێدانی پارەی بۆ کۆمپانیا لاوەکیەکان راگرت کە خۆی لە ٥٠٠ ملیۆن دۆلار دەدا. زۆرترین بڕە پارەی قەرز لە بەرانبەر وەسڵی تایبەت بە کۆمپانیاکانی "ئەلتەمیم" کە بڕی قەرزەکەی دەگەیشتە ١٣٦ ملیۆن دۆلار، هەروەها کۆمپانیای "لا نیوڤێل" بۆ بازرگانی کە بەهای قەرزەکەی نزیکەی ٧٦ ملیۆن دۆلاربوو ئینجا کۆمپانیای "ئیڤێنت سۆرس ئۆف سالت لایك سیتی"یش کە بڕەکەی دەگەیشتە ٨٧ ملیۆن دۆلار. ٦٥

لەگەڵ ئەوەش بارودۆخەکە بەرەو ئاقارێکی باشتر نەدەچوو، لە ناوەڕاستی ئایاری ٢٠٠٤، پێنتاگۆن پێدانی ١٥٩,٥ ملیۆن دۆلاری تری بۆ هالیبێرتۆن راگرت دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت کۆمپانیاکە کاغەزو دۆکیۆمێنتی ناتەواوی ناردووە. پێنتاگۆن بەیانێکی دەرکرد کە تیایدا هاتبوو کەوا تیمێك بە ناوی"تایگەر تیم" لەلایەن هالیبێرتۆن پێك هێنراوە بۆ لێکۆڵینەوەو وردبینی، بۆ ئەوەی لە ئەگەری کێشەو گرفتەکان بکۆڵێتەوە، لە ئەنجامدا حیسابی تێچووی ژەمە خۆراکە زیادکراوەکانیان کردووە (سەرتێچوون)، کە رێژەی ١٩,٤٪ خراوەتە سەر نرخی راستەقینەی کڕینی ژەمە خۆراکەکان. ٦٦

لەگەڵ ئەوەش، لەوانەیە ئەو رێژەیە هێشتا کەم بێت. چونکە کارمەندە پێشووەکانی هالیبێرتۆن گومانیان لە کارەکانی "تایگەر تیم" هەبوو، پێشیان وابوو کەوا هەڵسوکەوتیان ناکارامەو نەشیاون. "ماری دی یۆنگ" یەکێکە لە کارمەندە پێشووەکانی هالیبێرتۆن لە کۆسۆڤۆ، پێشتریش بۆ ماوەی دە ساڵ لەگەڵ سوپا کاری کردووە. لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣، بۆ سەرپەرشتیو چاودێریکردنی گرێبەستیەکانی "ئۆپەراسیۆنی ئازاد کردنی

عێراق" له کوێت دەست بەکاربوو. کە دەڵێت: "هەر زوو بۆم دەرکەوت کەوا لیستێکی تەواو بە ماوەی دیاریکراو بۆ بەڵێندەرە لاوەکیەکان لەبەردەستدا نیە... هەروەها، بەشی کۆنترۆڵی دۆکیومێنتەکان لیستی ناتەواوو هەڵەیان دابووە گشت بەڕێوەبەرەکانی ڕێکخستنی کارو چالاکیەکان، کە لە بنکەیەکی زانیاری نەگونجاویشدا وەرگیرابوو.":

کاتێکیش کە "تایگەر تیم" بە فایلی بەڵێندەرێکدا چوونەوە، تەنیا بۆ ئەوە بوو کە دڵنیا بن لەوەی ژمارەی فۆرمەکانی نێو فایلەکە تەواوە... هیچ جۆرە هەڵسەنگاندنێکیان نەکرد ئاخۆ نرخەکان شیاون یان نا، هەروەها راوێژیشیان بە بەڕێوەبەرە مەیدانیەکان نەکرد. چونکە مەبەستی سەرەکی تیمەکە تەنیا بریتی بوو لە داخستنی زۆرترین فایلی بەڵێندەرە لاوەکیەکان، لە چوارچێوەی ئەو گریمانە هەڵەیە، بەوەی گەر شتەکان بەرلەگەیشتنی تیمی پشکنەرانی حکومەت دابخرێن، ئەوا دووبارە وردبینیان بۆ ناکرێتەوە. بۆ ماوەی سێ مانگ، ئەو تیمە فێلایان لە هۆتێلی هیلتۆن لەسەر لێواری دەریا بۆ گیرابوو تەنیا بۆ سەیرکردنی پەڕاو و فایلەکان، کەچی هیچ کارێکی ئەوتۆیان نەکرد بۆ یەکلاکردنەوەی کۆنە بەڵێندەرە لاوەکیەکان.

ڕێنماییش کرابووین کەوا پارەی وەسڵەکان خەرج بکەین بێ دڵنیابوونەوە لەوەی ئاخۆ خزمەتگوزاریەکان گەێنراون یان نا. من خۆم بە ئەندامێکی"تایگەر تیم"ەکەی KBRـم وت: پارەی ئەو وەسڵە خەرجمەکە، کە دەمزانی پێشتر خەرج کراوە، بەلام ئەو کارمەندە هەمیشەییەی KBR پێی گوتم تۆ نازانی چی دەکەیت.٦٧

بۆ نموونە، دی یۆنگ دەڵێ هالیبێرتۆن بڕی ١٠٠ دۆلاری دەدایە کۆمپانیای "لا نوڤێل" کە بەڵێندەرێکی لاوەکی کوێتیە، بەرانبەر بە شتنی

یەك جانتا جلو بەرگ-چوار بەقەد ئەوەندەی کە دەدرایە شوێنێکی تر. بەمەش مانگانە زیاتر لە یەك ملیۆن دۆلار زێدە خەرجی دەکرا. لە حاڵەتێکی تریشدا، کۆمپانیاکە داوای کرینی ۲۲۷۰۰ پاکەت سۆدای کردبوو، لە بەرانبەر ۱،۵۰ دۆلار بۆ هەر پاکەتێك. کەچی ۲۲۷۰۰ قوتووی دابینکردبوو، واتە پارەی پێدراو بۆ ئەو داواکاریە پێنج ئەوەندە زیادی کرد، چونکە بڕی شتومەکە دابینکراوەکە بە کەمیەوە گەێندرابوو.

لەو کاتەی کەوا ووردبینەکان لە شوێنێکی ئاست بەرز نیشتەجێ کرابوون. هالیبێرتۆن، "تایگەر تیم"ـی لە هۆتێلێکی پێنج ئەستێرە دابەزاندبوو بە ناوی "هۆتێلی کێمپێنسکی" کە تێچووی مانگانە بۆ هەر یەکێك لە کارمەندەکانی ئەو تیمە بریتی بوو لە ۱۰۰۰۰ دۆلار. ئەوە لە کاتێکدا داوا لە سەربازەکان دەکرا لە ژێر خێمەو بە تێچوونی ۱،۳ دۆلار لە رۆژێکدا ژیان بەسەر بەرن. بە پێی گوتەی "دی یۆنگ"، سوپا داوای لە هالیبێرتۆن کردبوو کە کارمەندەکانی تیمەکە بگوازێتەوە ناو خێمەکان، بەڵام کۆمپانیاکە ئەو داوایەی سوپای رەت کردەوە.

دی یۆنگ دەڵێت: "کەلتووری هالیبێرتۆن لەسەر تۆقاندنو ترساندن بونیاد نراوە، بەوەی یەکێك لە لێپرسراوەکانی بەشی گرێبەستیەکان، کە دەستی لە کارکێشابۆوە پێی راگەیاندم، گەر بهاتایە هەر کارمەندێك لە دۆزینەوە یان ئاشکرا کردنی راستیەکان نزیك ببوایەوە، ئەوا لە شوێنەکەی خۆی لایان دەبرد. من خۆم لە نزیکەوە ئاگاداری ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانەی کۆمپانیاکە بووم. ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانیشە، بەڕێوەبەرە پێشووەکانی کەوا بەرگەی رەفتارە خراپەکانیان گرتووە، پۆستی بەرزترو مووچەی زیاتریان پێدەدرا لە عێراق یان هیوستن ومیان لە ئوردون."

## پوختە: بەکرێگیراو یان کرێکاری کارە ئاست نزمەکان ؟

کۆمپانیـا بەڵێندەرایەتیـەکانی سـوپا وەك هـالیبێرتۆن، توانـاێکی زۆر سەرف دەکەن بۆ ئەوەی روونی بکەنەوە بەوەی "بەکرێگیراو" نین، ئاماژەش بـەوە دەکـەن کـەوا کرێکارەکانیـان هـەرگیز چـەك‌و تەقەمـەنیان‌و نەگواسـتۆتەوەو دابەشـیان نـەکردووە، بـە هـیچ جـۆرێکیش شـان بەشـانی سـەربازەکان نەجـەنگاون. لەگـەڵ ئـەوەش، ئـەوە بـە جۆرێـك لـە جۆرەکـان سادەکردنەوەی مشت‌و مڕەکانە. "سام گاردنـەر" کە کۆلۆنێلێکی خانەنـشین بووی هێزەکانی ئاسمانی سوپایە بە"جەین مایـەر"ـی گوتبوو:" چوونە نـاو شەڕ زۆر ئاسانتر دەبێت، گەر بتوانیت خـەڵکانێك بـە کـرێ بگـری بـۆ ئـەوەی شەڕت بۆ بکەن. بەمەش بۆڵەبۆڵ و رووبەڕووبوونەوەت لەگەڵ سیاسیەکان لـە کۆڵ دەبێتـەوە." مەبەستیـشی لـەوە، ئـەو کارانـەی کـەوا زۆر خوازراو نـین ( دامەزراندنی خێمە، پاك کردنەوەی تەوالێتەکان، شتنی جل‌و بـەرگ، چێشت لێنـان و پاسـەوانی) کـە ئێـستا لـە رێـی کۆنتراکـت لەگـەڵ کۆمپانیـای وەك هالیبێرتۆن ئـەنجام دەدرێـن، پێـشتر لەلایـەن سـەربازە یەدەگەکانـەوە ئـەنجام دەدران، کە گلەیی و ناڕەزایی زۆریان دەردەبڕی. ٦٨

دواتر مشت‌و مڕی ئەوە هاتە گۆڕێ، کە گوایە کەرتی تایبـەت دەتوانێـت پارەیەکی زۆر بۆ باج دەرەکان بگێڕێتەوە، ئەمەش لە رووی تیۆریەوە شتێکی نایابە، بەڵام گوومان لەبارەیانەوە زیادی کرد، کاتێك کە راستی دەرخـەرەکان و ووردبین‌و پشکنەرەکانیش بە بەڵگەوە دەیسەلمێنن کـەوا زیـادە خـەرجی‌و بەفیڕۆدانی پارە لە گشت لایەك بەربڵاوە. "ستیوارت براونی کوڕ" پارێزەری پێـشوو لـە کۆشـکی سـپی، لـە کـانوونی دووەمـی ٢٠٠٤، کرایـە بەرپرسـی نووسینگەی لێکۆڵینەوەی گشتی سەر بـە دەسـەڵاتی داگیرکـەر. لەگـەڵ چـەند دەزگایەکی تری وردبینی و پشکنین دەستی کرد بە پێداچوونەوەی یەکەم ١٠

ملیار دۆلاری خەرج کراو بۆ نزیکەی هەزار و پێنج سەد گرێبەستی. ناوبراو هەر زوو بۆی دەرکەوت کەوا دەزگای "وردبینی کۆنتراکتەکانی بەرگری"، زیاتر لە١٨٧راپۆرتی دەرکردووە سەبارەت بە پێداچوونەوەی ٧ ملیار دۆلاری خەرج کراو بۆ کارەکانی ئاوەدانکردنەوە، کە بۆی دەرکەوت گومان لە شێوازی خەرجکردنی ١٣٢,٦ ملیۆن دۆلار هەیە، هەروەها ٣٠٧ ملیۆن دۆلاری تریش خەرج کراوە بێ ئەوەی هیچ کاغەزێك یان وەسڵێك هەبێت. ئەو بەڵگەیەوای لە پێنتاگۆن کرد، پێدانی ١٧٦,٥ ملیۆن دۆلار رابگرێت کە دەبوایە لە جیاتی خەرجیەکان بدرایە کۆمپانیاکە. ٦٩

مشتو مڕەکانیش دەربارەی کاریگەریو دەست پێوەگرتنی تێچووەکان ئاکامیان نابێت گەر بێتوو سەیری ئەو جیاوازیە بەرچاوەی کە لە نێوان مووچەکاندا هەیە بکەیت- تێکڕای مووچەی کارمەندێك کە بە کۆنتراکت لە هالیبێرتۆن دامەزرابێت (ئەوانەی لە ئەمریکاوە هاتوون)، بە لانی کەمەوە دەگاتە ٨٠,٠٠٠ دۆلار لە ساڵێکدا، کەچی تێکڕای مووچەی ساڵانەی سەربازەکانی سوپا لە نێوان ١٣,٥٠٠دۆلار تا ٣٠,٧٠٠ دۆلارە. وەکو چۆن لەو وێب سایتەدا هاتووە:(www.salary.com) ٧٠. هەر تەنیا لە ساڵی ٢٠٠٣دا هالیبێرتۆن ٣,٩ ملیار دۆلاری خستە سەر شانی باج دەرە ئەمریکیەکان بۆ خەرجیەکان شەڕ لە عێراق. بۆیە بەهای گشت کۆنتراکتەکانی کۆمپانیاکە بە زیاتر لە ١٨ ملیار دۆلار دەخەمڵێنرێت. ٧١

# بەشی دووەم

## هەراو هۆریای ئاوەدانکردنەوە

تۆربایـنـە هەڵمیـە زەبەلاحەکـەی وێستگەی کارەبـای نەجیبیـە خـامۆش بوو. گەر ئەو ئەندازیارە رووسیاییانەی کە وێستگەکەیان سی ساڵ لە مەوبەر دروسـت کردبـوو سـەیرێکی ئامێرەکانیـان بکردایـە ئـەوا بەزەحمـەت دەیانناسینەوە. چونکە بە درێژایی ساڵانی رابـردوو، ئەنـدازیارە عێراقیـەکان گەلێ لە پارچە ئەسڵیە رەنگ شینەکانی وێستگەکەیان بـە جۆرەها پارچـەی یەدەگی کاتەکی رەنگ سپی و رەساسی گۆریبوو.

گلۆپەکانی ئـەم بـەر و ئـەو بـەری شـەقامەکە کوژابوونـەوە. " یـەعروب جاسم" بەڕێوەبـەری گشتی کارەبـای ناوچـەی باشوور، کەسێکی رووخۆش‌و تەمەنیشی لە ناوەڕاستی شەستەکان‌و رێك پۆشبوو کـە قـاتێکی رەساسیەوە پۆشیبوو، بە پۆزشـەوە گـوتی: " بـە شێوەیەکی ئاسـایی رۆژانـە بیسـت‌و سـێ کاتـژمێر کارەبـا دەدەیـن، بـەلاّم ئـەمرۆ کێشەمان هەیـە. دەبوایـە لـە مـانگی تـشرینی یەکەمدا، کـاری چاککردنەوەو نۆژەنکردنـەوەی تۆربایـنـەکان تـەواو بکەین، کەچی نە پارچەی یەدەگمان هەبوو نە پارەش."

جاسم پێی گوتم، دەبوایە کۆمپانیـای بـەکتل پارچـەی پێویـستی دابین بکردایـە، کـە بنکـە سـەرەکیەکەی ئـەو کۆمپانیایـە دەکەوێتـە ویلایـەتی کالیفۆرنیاو بەرپرسە لە چاککردنەوەی سیستەمی دابینکردنـی وزەی کارەبـا بە پێی کۆنتراکتێکی تایبـەت بـە نۆژەنکردنـەوەی ژێرخـانی لـە عێـراق.٧٢ (

وتەبێــژ بــە نــاوی بــەكتل گــوتی، كۆمپانیاكــە تــەنیا لــە پێوانــەكردن و دەستنیشانكردنی جۆری ماددەو نەخشەی پارچە یەدەگەكان بەرپرسیارە، كڕین و گەیاندنی ئەو پارچانەش لە ئەستۆی هێزەكانی داگیركەر دایە.) ٧٣

تەنیا چەند رۆژێك بەر لەسەردانەكەم لە ناوەڕاستی كانوونی یەكەمی ٢٠٠٣، حكومــەتی ئــەمریكی رایگەیانــد كــەوا بڕیــاری داوە، ئــەو ولآتانــەی هەلۆێستیان دژ بــە شــەڕی عێـراق نوانـدووە بێبـەش دەكـرێن لـە زیادكردنی ئاشـكرای تایبــەت بــە دەســەبەركردنی گرێبەســتیەكانی ئاوەدانكردنــەوەی عێراق. ئاسەوارە سیاسیەكانی ئەو بێبەشكردنە، جا چ پارچە یەدەگەكان‌و بەلێنـدەرەكان‌و كۆمپانیـا لاوەكیـەكانیش بگرێتـەوە یـان نـا، ئـەوا "یـەعروب جاسمی" نیگەران كردبوو.٧٤ كە دەیگوت: "سێ لەسەر چواری وێستەگەكانی كارەبا لەلایەن روسیا، ئەلمانیاو فەرەنسا دروست كراون. كە بەداخەوە سێ رۆژ لەمەوبەر، سەرۆك بـۆش كۆمپانیاكـانی ئـەو سێ ولآتـەی لـە بەدەست هێنانی گرێبەستی لە عێراقدا بێبەش كرد."

لـە كـاتی گەڕانیـشمدا بــە نێـو وێـستگەی كارەباكـە، تێبینــی چـوار (ئەیركۆندێشن)ی تازەم كرد دانرابوون، كە دروشمی كارگەی ئەیركۆندێشنی (York)ی لەسەر بوو. "حامد سالم" بەڕێوبەری وێستگەكە، گوتی:" دوو هەفتە لەمەوبەر ئەو ئەیركۆندێشنانەمان وەرگرت- بەكتل بۆمـانی نـاردبوو، چـونكە ئامێرەكـانی خۆمـان لـە هاوینـدا بـە باشـی كاریـان نـەدەكرد، بـەلآم ئەوانیش تا ئێستا بۆیان دانەمزراندووین‌و ئێمـەش لـە زستاندا پێویـستیمان پێیان نابێت."

هۆكاری دواكەوتنەكەش، لەبەر مشت‌و مڕی نێوان كۆمپانیا و وێستگەكە بوو بەوەی كامیان بەرپرسیارن لە دامەزراندنی ئەو ئەیركۆندێشنانە.

ئەندازیارەكانی وێستگەكانی كارەبـای باشـوور بەختـەوەر بـوون، بـەوەی دەبوایە یـەك جـار پـۆزش بـۆ پـچڕانی كارەبـا لـە رۆژێكدا بهێننـەوە. كەچـی

هاوشانەکەیان لە بەغدا، "موحسین حەسەن" بەڕێوەبەری تەکنیکی بەرهەم هێنانی وزە لە وەزارەتی کارەبای عێراقی، ناچاربوو پۆزش بۆ میوانەکان بهێنێتەوە بەوەی بۆچی لە بەغدای پایتەخت کە یەك لەسەر چواری دانیشتوانی عێراقی لێیە، رۆژانە زیاتر لە دە کاتژمێر پچڕانی کارەبا دووبارە دەبێتەوە.

حەسەن کەسێکی خاکی (متواچع) بوو کراسێکی رەنگاوڕەنگی پۆشیبوو لەگەڵ چاکەتێکی قاوەیی، جۆرە پۆشاکێك کە رەنگبێ لەبەرهەر کەسێکی تری ئاسایی شارەکە بەرچاوت بکەوێ، دەڵێت: " بەکتل ئێمەی خستۆتە بارودۆخێکی زۆر ئاڵۆز. وەزیرەکەشمان پێیانی گوتبوو گەر خەڵکی توڕە بوون ئەوا گلەییمان لێ مەکەن. وەك دەزانی کارەبا کێشەیەکی گەورەو سەرەکیە بۆ خەڵکی عێراق، بۆیە دەبێ بە زوترین کات چارەسەری بکەن. لەسەردەمی رژێمی سەدامدا هەموو شتەکانمان بە خێرایی چاك دەکردەوە، بێ ئەوەی گوێ بدەینە جۆرایەتی کارەکان. چونکە کارەکانمان بە پێی پێوەرو ستاندارتەکان نەبوون، زۆر بە ناڕێکی ئەنجام دەدران."

یەکێك لەو هۆیانەی کە وای لە بەکتل کرد لە کارەکانی دوابکەوێت ئەوە بوو، تیمە کارەباییەکەی پێش ئەوەی دەست بە هیچ کارێك بکەن بۆ ماوەی دوومانگ خەریکی پشکنینی وێستگەی بەرهەم هێنانی کارەباو وێستگە ناوەندیەکانو هێڵە ڤۆڵت بەرزەکانیش بوون. ئەمەش بووە مایەی تووڕەبوونی ئەو کرێکارە عێراقیانەی کە دەیانگوت دەمانتوانی بە کۆمپانیاکە بڵێین پێویستیەکان چین. دزینو تێکدانی بە ئەنقەستیش هۆکارو کێشەی تربوون بۆ دواکەوتنی کارەکان. هەرکە بەکتل دەستی کرد بە گۆڕینی دە تاوەری کارەبای تێك دراو لە نزیك ناسریە، دە تاوەری تر لەو دەوروبەرە تێکدران. ٧٥

بۆیە بەکتل رەتی ئەوەی دەکردەوە کە ئەو بەرپرسیار بێت لەو

بارودۆخـه. "کلیـف مـۆم" سـەرۆکی کارەکـانی کۆمپانیاکـە لـە عێـراق، بـە پەیامنێری رۆژنامەی "سان فرانسیـسکۆ کرۆنیکل"ـی راگەیانـد: "خـەڵکێکی زۆر پێیان وابوو کەوا ئەمریکا بە ترێڵە پارە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، چونکە خـەیاڵکردنی ئـەوەی لەگـەڵ هاتنـە نـاوەوە بـۆ عێـراق دەمو دەست شـتەکان چاکدەبنەوە، شتێکی نا ماقوڵە." ٧٦

## بەکتل چیە؟

کۆمپانیای بەکتل توانی گرێبەستیەك لـە دەزگـای وڵاتـە یـەکگرتوەکانی ئـەمریکا بـۆ گەشـەپێدانی نێودەوڵەتی (USAID) بەدەست بێنێت، پـێش ئــەوەی جـۆرج بۆشـی سـەرۆکی ئـەمریکا کۆتـایی هـاتنی ئـەو ململانێیـە چـەکداریە رابگـەیێنێت کـە لـە نیـسانی ٢٠٠٣دا بـەرپابوو. ئـەو گرێبەسـتیە درێژکرایەوە و دواتریش لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٤ گرێبەسـتیەکی تـری بـایی ٢,٨ ملیار دۆلار پـێ بەخشرا. تایبـەت بـوو بـە چاککردنەوە و نوێکردنـەوەی تۆڕی ئـاو و ئـاوەڕۆو قوتابخانـەکان، بـەوەش بـەکتل بـووە دووەم گـەورەترین کۆمپانیا لە دوای هالیبێرتۆن لە عێراق. ٧٧

مانگێـــك بەرلەبەدەســـت هێنـــانی کۆنتراکتەکـــە، "رایلـــی بـــەکتل"ـــی ملیاردێرو گەورەی بنەماڵەی بەکتل، وەکو ئەنـدامی ئەنجوومـەنی هـەناردنی سەر بە سەرۆك بۆش سوێندی یاسایی خوارد بۆ ئامۆژگاری کردنی حکومەت لە دۆزینەوەو دروستکردنی بازاڕ بۆ کۆمپانیا ئەمریکیەکان لە دەرەوە. ٧٨

کۆمپانیـای هاوبەشـی خانــەوادەیی بـەکتل، یەکێکـە لـە گـەورەترین کۆمپانیاکـانی ئەنـدازیاری‌و ئاوەدانکردنـەوە لـە جیهـان، پرۆژەکانیـشی درێـژ دەبنەوە لە راکێشان‌و دامەزراندنی یەکەم بۆڕی نـەوتی درێـژ‌و سـتراتیژی لـە ئەلاسـکاو عەرەبـستانی سـعودیە، تـا بینـاکردنی ئـامێری بەرپەرچـدانەوەی ناوەکی (مفاعلات نوویە) لە کینشانی چین‌و هـەروەها بـەڕێوەبردنی پاڵاوگـە

نەوتیەکانیش لە زامبیا. کۆمپانیاکە لە ساڵی ١٨٩٨دامەزراوەو تائێستاش نزیکەی ٢٠٠٠٠ پرۆژەی لە ١٤٠ وڵاتی جیاواز لەهەرحەوت کیشوەرەکە ئەنجام داوە. لە ساڵی ٢٠٠٢، داهاتی بەکتل گەیشتە نزیکەی ١١,٦ ملیار دۆلار.٧٩ بە پاڵپشتی بەشێکی کۆنتراکتەکەی لە عێراق، بەکتل رایگەیاند کەوا رێژەیەکی تازەی داهاتی لە ساڵی ٢٠٠٣ تۆمارکردووە دوای ئەوەی بۆ ماوەی سێ ساڵ روو لە دابەزین بووە. کە لە ساڵی ١٩٩٩ داهاتەکەی گەیشتبووە ١٥,١ ملیار دۆلار، دواتر لە ساڵی ٢٠٠٢ بۆ نزیکەی ١١,٦ ملیار دۆلار دابەزی. ئینجا لە ٢٠٠٣ دووبارە بۆ ١٦,١ ملیار دۆلار بەرز بۆوە. ٨٠

دوای دانانی "رایلی بەکتل" وەك راوێژکاری سەرۆك بۆش، لە ٢١ نیسانی ٢٠٠٣ "تێری ڤالێنزانۆ" بەڕێوەبەری کارەکانی ئاوەدانکردنەوەی بەکتل لە عەرەبستانی سعودیە بەرەو پایتەختی کوێت چوو بۆ بینینی "جەی گارنەر" کە کارمەندی دانراوی پێنتاگۆن بوو بۆ سەرپەرشتیکردن‌و بەڕێوەبردنی عێراق، کە "پۆڵ برێمەر" لەو ئەرکە سەرکەوتووتربوو. کۆبوونەوەی هەردوو ناوبراو لە شالێیەکانی هیلتۆن‌و هۆتێلی شیراتۆن بەڕێوەچوون‌و تایبەتیش بوون بە پلان دانان بۆ کارەکانی ئاوەدانکردنەوەی عێراق لە دوای رووخانی حکومەتی سەدام. ٨١

ئەمە وەك بەدیهاتنی خەونێك بوو بەلای وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمریکاو سەرۆکی پێشوتری بەکتلیش"جۆرج شوالتز". کە لە وتارێکی بلاوکراوەیدا لە رۆژنامەی"واشنتۆن پۆست" لە ئەیلولی ٢٠٠٢، هانی ئیدارەی بۆشی دەدا بۆ ئەوەی پاڵپشتی لە هێرش بردنە سەر عێراق بکات: "دامەزراوەیەکی بەهێز هەیە بۆ پاڵپشتیکردنی کردەیەکی سەربازی خێرا لە دژی سەدام حوسێن‌و دواتریش پشتگیریکردنی هەوڵە فرەلایەنەکانی ئاوەدانکردنەوە دوای رووخانی ئەو رژێمە." ٨٢

بێگومان بەلای ناوبراو، هەروەك ساڵانی رابردوو بوو. بیست ساڵ لەمەوبەر، لە ٢٠ کانوونی یەکەمی ١٩٨٣، کاتێك"دۆناڵد رامسفێڵد" وەك

نوێنەری سەقامگیرکردنی ئاشتی لە رۆژهەلاتی ناوەراستو نێردراوی "جۆرج شوالتز" (وەزیری دەرەوەی ئەو کاتی ئەمەریکا لەسەردەمی رۆنالد ریگان)، بۆ بنینی سەدام حوسێن گەیشتە بەغدا. رامسفیلد داوای لە دیکتاتۆرەکەی عێراق کرد کە پشتگیری لە بەکتل بکات، لەو زیادکردنە ئاشکرایەی کە بۆ راکێشانو دامەزراندنی بۆریەکی نەوت لە عێراقەوە بۆ بەندەری عەقەبە لە ئوردون ئەنجام دەدرا. ٨٣

ئەمەش تەنیا شت نەبوو، چونکە"جاك شینان" جێگری یەکەمی سەرۆکی بەکتل، ئەندامی بۆردی سیاسەتریژی بەرگریە، کە گروپێکە لەلایەن حکومەتەوە پێك هێنراوە بۆ رێنوێنیکردنی پێنتاگۆن لە کاتەکانی شەردا. لە هەمان کاتیشدا بەکتل راوێژکاری هەردوو دەزگای فیدرالی بوو کە قەرزو بیمەیان بۆ کۆمپانیا ئەمریکیەکان دابین دەکرد لە دەرەوە. "دانیال چاو"، جێگرێکی تری سەرۆکی بەکتلە، لە هەمان کاتیشدا ئەندامی بۆردی راوێژکاری بانکی (Ex-Im)ە کە تایبەتە بە هەنارده و هاوردەی ئەمریکی. هەروەها "رۆس کۆنێللی" کە ماوەی ٢١ ساڵە لە بەکتل کارمەندە، ئێستا بەرێوەبەری کارەکانی کۆمپانیای وەبەرهێنانە تایبەتیەکانی دەرەوەیە (OPIC). ٨٤

بێگومان، "ئەندریۆ ناتسیۆس" فەرمانبەری کارگێری لە (USAID)، کە گرێبەستی ئاوەدانکردنەوەی عێراقی بەخشیبوو، دوو ساڵ بەرلەو رێکەوتە سەرپەرشتیو چاودێری بەکتلی دەکرد، وەکو بەرپرسی دەسەلاتی گومرگی ماساچوستس، لە چوارچێوەی گرێبەستیەکی تایبەت بە تەواوکردنی پرۆژەی رێگای سەرەکی ناوەراستی شاری بۆستن. ٨٥

گرووپی "وۆچ دۆگ" پێشبینی ئەوەی کرد کەوا ئەو پەیوەندیە ناشەرعیەی نێوان بەکتلو حکومەتی ئەمریکی، دەبێتە نەهامەتی بۆ عێراقیەکان. وەکو چۆن "جولییێت بێك" گەورە رێکخەری کاروباری هاولاتیان لە نووسینگەی کالیفۆرنیا، دەڵێت:"تەباییەکی زۆر لە نێوان

بەکتل‌و پرۆسەی بەتایبەتکردندا هەیە. وەکو چۆن خەڵکی بۆلیفیاو گشت شوێنەکانی تری جیهانیش کە بەکتل کاروپرۆژەی لێ ئەنجام داوە، دەزانن هەر کە ئەو کۆمپانیایە کاری لە هەر شوێنێك پێ بسپێردرێت، ئەوا دەتوانی پێشبینی ئەوە بکەیت کە تێچوونەکان بەرزدەبنەوەو لێپێچینەوەو کۆنترۆڵی ناوخۆییش نامێنێت." ٨٦ لەم دوواییانەدا بەکتل ٢٥ ملیۆن دۆلاری لە رێی دادگاوە بەدەست هێنا، دوای ئەوەی داوایەکی یاسایی لە دژی بۆلیڤیا بەرزکردبۆوە، بەوەی ئەو وڵاتە گرێبەستیەکانی تایبەت بە بەڕێوەبردنی تۆڕی ئاوی "کۆجابامبا"ـی لەگەڵ کۆمپانیاکە راگرتووە. لەو کاتەی کە بەکتل سەرپەرشتی ئەو پرۆژەیەی دەکرد، کرێی ئاو بۆ هاوڵاتیانی ئەوێ لەرادەە بەدەر بەرزببۆوە. ٨٧

بە هەمان شێوە هاوڵاتیان‌و باج دەرەکانی شاری بۆستنیش تووشی هەمان بەدبەختی ببوونەوە. پرۆژەی تۆنێلی رێگای سەرەکی ناوەڕاستی شاری بۆستن ( کە لە نێو خەڵکیدا بە "بیگ دیگ" ناسراو بوو)، بۆ دوو ویلایەت درێژ دەبێتەوە بە قوڵایی ٢٨,٣٤ مەتر لە ژێر شارەکە. لە ساڵی ١٩٨٥ تێچووی پرۆژەکە بە ٢,٥ ملیار دۆلار خەملێنرا. ئەو پارەیەش ساڵ بە ساڵ زیادی دەکرد. تا کۆی تێچوونەکە گەیشتە ١٤,٦ ملیار دۆلار، واتە ١,٨ ملیار دۆلار تێچووی هەر کیلۆمەترێك‌و شەش سەدونۆ مەتر بوو، بەوەش بووە گرانترین رێگا سەرەکیەکانی جیهان لە رووی تێچوونەوە. ٨٨

لە کالیفۆرنیاش تا ئێستا دانیشتوانی ئەو ویلایەتە نرخی ئەو زیادە تێچووەی پرۆژەی کارگەی ناوەکی "سان ئۆنۆفری" بۆ بەرهەم هێنانی کارەبا لە باکووری "سان دیاگۆ" دەدەنەوە. دوای ئەوەی کۆمپانیای ناوبراو کارگەیەکی بەرپەرچدانەوەی ناوەکی تێدا دامەزراند. ئەوە جگە لە کاریگەرە خراپەکانی ئەو پرۆژەیە بەسەر ژینگەی ناوچەکە. کارگەکە رۆژانە بڕێکی لەرادەبەدەری ئاوی دەریاکەی ئەوێ بە قەوزەو ماسی‌و بوونەوەرەکانی تریش کە لەو ئاوە دەژین بۆ سارکردنەوەی بەرپەرچ دەرەوەکان رادەکێشێت.

هەروەها ئەو کارگەیە بە تۆن ئەو گیایانەی کە لە قووڵایی دەریاکە هەن لەناو دەبات لە ڕێی دووبارە فرێدانەوەی ئاوی گەرم بوو بۆ ناو دەریاکە. ٨٩

کارێکی تری ئاوەدانکردنەوەی بێ ئاکامی بەکتل، لە کانی زێڕی (ئۆکەی تێد) بوو لە "پاپوا گینیای نوێ". دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٨٤، ئەو بەربەستەی کە بەکتل بۆ گرتنەوەو کۆکردنەوەی پاشەڕۆو خۆڵو خاشاکی دەرهاتوو لە ئەنجامی لێدانی کان دروستی کردبوو هەرەسی هێناو دارما، تەنانەت بەر لەوەی کانەکە هیچ زێڕێکیشی لێ دەربهێنرێ. لە ساڵی ١٩٩٦، کاتێك خەڵکی ئەو ناوچەیە داوایان لەسەر کۆمپانیاکە تۆمار کردو درایە دادگا، کۆمپانیایێکی ئوستورالی کە تایبەتمەندە بە بواری مامەڵەکردن لەگەڵ کانەکان بە ناوی (BHP)، رازی بوو لەسەر خەرج کردنی ١١٥ ملیۆن دۆلار بۆ کۆکردنەوەو گرتنەوەی پاشماوە ژەهراویەکەی کانەکە، کە ڕۆژانەی بڕی هەشتا هەزار تۆنی لێ فرێ دەدرایە نێو ڕووباری (فلای).٩٠

گرووپی کۆمپانیاکانی بەکتل و کارمەندەکانیشی، لە نێو گەورەترین بەخشەرن بۆ هەڵمەتە سیاسیەکان لە بواری کاروپرۆژەکانی ئاوەدان کردنەوە، ئەوە بە پێی لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجام دراو لەلایەن " Center for responsive Politics" کە سەنتەریکی سەربەخۆی ناحیزبیەو بنکەکەی لە واشنتۆنە، بەدواداچوون بۆ هەڵمەتە داراییەکان دەکات. ٩١

سەنتەرەکە بۆی دەرکەوت، لە دوایین خولی هەڵبژاردنەکاندا کۆمپانیای ناوبراوو کارمەندەکانیش بڕی ٢٧٧,٠٥٠ دۆلار هاوکاریو بەخششیان داوەتە کاندیدەکانو لیژنە حیزبیەکانیشیان؛ دیموکراتەکان بە ڕێژەی ٥٧٪ و کۆماریەکانیش ٤٣٪. ژمارە ئاشکرا کراوەکانی سەنتەرەکە ئەوە دەردەخەن کەوا بەکتل بەلانی کەم بڕی ١٦٦٠٠٠دۆلاری داوەتە لیژنە نیشتمانیەکانی سەر بە کۆماریەکان.

## برادەران هەواڵێکی خۆش

بۆ بەدەست هێنانی متمانە، بەکتل یەکێکە لەو کۆمپانیا کەمانەی کە بە شێوەیەکی یەکجار فراوان پشت بە بەڵێندەرە لۆکاڵیەکان دەبەستێتو کۆبوونەوەی دەوریشیان لەگەڵ ئەنجام دەدات بۆ روونکردنەوەی چۆنیەتی بەدەست هێنانی کار لێیەوە. زۆرترین پەیوەندیشی لەگەڵ دەزگا راگەیاندنە نێودەوڵەتیەکان هەیە، بەوەش بۆتە تاکە کۆمپانیا کە نووسینگەکانی لە نێو هۆڵی کۆنفرانسەکان لە بەغدا هێشتۆتەوە، ئەو شوێنەی کەوا سوپای ئەمریکی خولەکانی راهێنان، کۆبوونەوەکانو پرێس کۆنفرانسەکانی تێدا دەبەست بۆ جیهانی دەرەوە. لەگەڵ ئەوەش، کۆمپانیاکە لەبەردەم هاوڵاتیە عێراقیەکان کراوە نەبوو. چونکە گەیشتن بۆ نووسینگەکانی بەکتل ئاسان نەبوو. لە رۆژانی ئاساییدا نیو کات ژمێری دەخایاند بۆ برینی بەربەستەکانی دژ بە تەقینەوە خۆکوژیەکانی رێگای هاتنە ژوورەوە، کە سێ خاڵی پشکنین، تەلدڕی ئاڵۆزکاو، کیسە خۆڵ و بەربەستی کۆنکرێتی پتەو هەروەها کۆمەڵێك سەربازیشی لەخۆ گرتبوو.

لە کانوونی یەکەمی٢٠٠٣، لە کاتی سەردانی کردنم بۆ نووسینگەکانی بەکتل و USAID لە سەنتەری کۆنفرانسەکانی بەغدای توند پارێزراو، لە تەنیشت کۆشکی کۆماریدا، چاوم بە سێ پاسەوان کەوت کە تفەنگی رەشاشیان بەدەستەوە بوو، لە ناوەڕاستی رێڕەوەکەدا دەهاتنو دەچوونو بەردەوامیش سەریان بە هەموو لایەکدا دەسووڕاندو چاودێری دەورو بەرەکەیان دەکرد. لە ناوەڕاستی پاسەوانەکاندا، پیاوێکی بەتەمەنی لێبوو کە چاکەتێکی بەرینی لەبەردابوو. سیمای زیاتر لە سیاسەتمەدارێك دەچوو، بە زەردەخەنەو بەدەم رۆیشتنەوە خەریکی قسەکردنبوو لەگەڵ ئافرەتێك.

بە سەری ئاماژەی بۆ سەنتەری کۆنفرانسەکان کرد و گوتی: "شتێکی

نایابە". منیش پرسیارم لە پاسەوانەکان کرد ئەو کەسە کێیە، ئایا ئەندامی کۆنگرێسە؟ لە وەڵامدا گوتیان نەخێر، ئەوە باڵیۆز "تێد مۆریسە" کە بەرپرسی شاری بەغداو دەوروبەرێتی. بۆیە لێی نزیکبوومەوەو داوام لێکرد بۆئەوەی بۆ چەند دەقیقەیەك قسەم لەگەڵدا بکات سەبارەت بە کێشەکانی تایبەت بە کارەکانی ژێرخانی شارەکە. ئەویش بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی "بە دڵنیاییەوە".

مۆریس بە تەواوەتی جەختی لەسەر کارە ئیجابیەکان دەکردەوەو دەیگوت: " کاتێك کە هاتینە ئێرە، سەرتاپای شارەکە تاریك بوو، سەرتاپای شارەکە لە رەوشێکی ئەمنی خراپ دابوو، بەردەوام شەڕو پێکدادانیش هەبوو. بەڵام ئێستا لە هەموو شوێنەکانی شارداو لە گشت بوارەکانیش پێشڤەچوون بەرەو باشتر هەیە."

کاتێکیش پێم گوت، قسەم لەگەڵ بەڕێوەبەرەکانی وێستگەی کارەبادا کردووە و ئەوان بە جۆرێکی تر قسەیان دەکرد. ئەو لە وەڵامدا بۆمی دووپات دەکردەوە کەوا لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا هەموو کێشەکان چارەسەر دەبن، کە پێداگیری دەکردو دەیگوت:

شەش مانگ، ماوەیەکی کەمو ناواقیعیە بۆ تەواوکردنی کارەکانی ئاوەدان کردنەوە. چونکە رێگایەکی دوورمان لە پێشەو کاتێکی زۆریشی دەوێت بۆ بڕینی. سەیر بکەو بزانە چەند کات پێویست بووە بۆ ئاوەدانکردنەوەی بۆسنیا، راوەندە، سیرالیۆن، کەمبۆدیا، بۆڕۆندیو تەیمور. لە هەر شوێنێك حاڵەتی شەڕو ململانێی چەکداری هەبووبێت، ئەوا خەڵکی ئەو شوێنە بەگشتی بێ هودە دەبنو واش دەزانن دەکرێ شتەکان دەسبەجێ تەواو بکرێن. لە هیچ شوێنێکی ئەو جیهانەدا ئەو کارانە دەسبەجێو لە ماوەیەکی کورتدا تەواو نابن. چونکە ئەو جۆرە کارانە زیاتر پەیوەستن بە

مەسەلەی ئەندازەیی و فیزیکی، هیچ پەیوەندییەکیشی بە بەکتلەوە نیە. ٩٢

موحسین حەسەن، هاوڕا نەبوو لەگەڵ قسەکانی مۆریس، کە دەیگوت: "ئێمە، ئەندازیارە عێراقیەکان توانای چاککردنەوەی هەموو شتێکمان هەیە، بەلاّم پێویستیمان بە پارەو پارچەی یەدەگ هەیە، کەچی بەکتل تا ئێستا هیچیانی بۆ دابین نەکردووین. تەنیا شتێك کە بەکتل پێی دابین تا ئێستا بریتی بووە لە بەڵێنو هیچی تر. ئێمە هەر خۆمان توانیمان بێ بەکارهێنانی هیچ پارچە یەدەگێك، موەلیدە چوارسەد مێگاواتیەکە بخەینەوە کار، بەلاّم شتی زیاترمان پێویستە لە تەنیا بەڵێن پێدان گەر بمانەوێ -دوو هەزار و هەشت سەد- مێگاوات دابین بکەین بۆ ئەم شارە کە پێویستی بەبرە وزەیە."

بێگومان پرۆژەکانی تایبەت بە نۆژەنکردنەوەی ژێرخان، پێویستیان بە زیاتر لە بەڵێنی کرچوکاڵ دەبێت- پاك کردنەوەو بەکارخستنەوەی بەندەری ئوم قەسرو فڕۆکەخانەی بەغداش لەسەرووی کارە گرنگی پێدراوەکان بوون، ئەو پرۆژانەش هەرزوو بەئەنجام گەێنران، چونکە سوپا پێویستی بە هێنانو گەیاندنی کەلوپەل بوو بۆ دەسەلاّتی داگیرکەر. هەروەها لە بەهاری٢٠٠٣، لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا تاوەرەکانی مۆبایل دامەزرێنران، بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری MCI بۆ کاربەدەستە ئەمریکیەکانو راوێژکارە عێراقیەکانیان.

## ئوم قەسر

یەکێك لەو تەنیا پرۆژە ژێرخانیانەی کە لە وادەی خۆی تەواو کرا، پرۆژەی بەکارخستنەوەی بەندەری ئوم قەسر بوو، کە دەکەوێتە دیوی باکووری رۆژئاوای کەنداوی فارسی. ئەم بەندەرە گرنگیەکی زۆری هەبوو لە

هێنانی کەرەستەو پێداویستی قورس‌و گرنگ بۆ هێزەکانی داگیرکەر. لە ماوەی چوار مانگدا بەندەرەکە لە لایەن کۆمپانیای Great Lakes Dredging Company لە "ئێلینۆی" پاك کرایەوە، لە چوارچێوەی گرێبەستیەکی لاوەکیدا، دواتریش رادەستی کۆمپانیای ئەمریکی بۆخزمەتگوزاریەکانی بارکردن SSA کرا، کە کۆمپانیایێکە گەڵ لەو بەندەرە گەورەو سەرەکیانەی کە دەکەونە سەر زەریای هێمن لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەڕێوەدەبات.

بەندەرەکە لە ساڵی ١٩٥٨، لە لایەن نەتەوەخوازە عێراقیەکان دروست کراوە، ئەو بەندەرە سەرچاوەیەکی سەرەکی بازرگانی‌و هەناردن بووە. لە رێی ئەو بەندەرەوە عێراق دەستی کردووە بە ناردنی شتومەکی بەرهەمهێنراو لە کارگەکانی، بۆ کڕیارەکان لە گشت ولاتانی ناوچەکە. دواتر بەندەرەکە بووە هێمای پێشکەوتن‌و سەربەخۆیی‌و گرنگترین دەستکەوتەکانی شۆڕشیش لە عێراق. ٩٣ بەلام دوای پەنجا ساڵ، کەناڵە بەرتەسکە ئاویەکەی بەندەرەکە ماوەی دە ساڵ بوو پاکنەکرابویەوە، هەر بۆیە کەشتیە بارهەلگرە گەورەکان نەیاندەتوانی نزیکی بەندەرەکە ببنەوە. مەترسی تریش بریتیبوو لە چەك‌و تەقەمەنی نەتەقیو کە پاشماوەی شەڕەکانی رابردوو بوون، لەگەڵ پارچەو پاشماوەی دەیان کەشتی نقوومبوو.

کۆمپانیای "Great Lakes" ئامێرێکی پاك کردنەوەی زەبەلاحی بە ناوی "Aquarius" هێنا کە تایبەت بوو بە بڕین‌و هەلمژین‌و هەلگرتنەوەی بەردو ئاسن‌و پاشماوە قورسەکانی ناو کەناڵەکە، لە چوار مانگی یەکەمی کارکردنیدا، پاشماوەو زبڵی بە پانتایی ٣,٦ ملیۆن مەتر سێجای ژێر ئاوی کەناڵەکە دەرکردو فڕێی دەدایە سەر پانتاییەکی بەتاڵی لمیی لەودیو حەوزی کەشتیەکانەوە. لەوێشەوە بەلەم‌و کەشتی بچووك کە کرێنیان بەسەرەوە بوو، ئەو پاشماوە دەرهێنراوانە یاخود پارچەکانیان

بەرزدەکردەوە بۆ دەرەوەی ئاوەکە. ژێرئاوگەڕەکانیش (غواصین) بەدوای ئەو پارچە ئاسن‌و کانزایانەدا دەگەڕان، کە گومانی ئەوەیان لێ دەکرا بۆمب بن یان کۆنە موشەك، بۆیە بە ئاگادارییەوە لێوەی نزیك دەبوونەوەو دەیانپشکنین.

لە کۆتایی هاوینی ٢٠٠٣، "پاتریك لارکین"سەرپەرشتیکار لە کۆمپانیای بەکتل، یاوەری "دەیڤد بەیکەر"پەیامنێری سان فرانسیسکۆ کرۆنیکلی کرد، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئاگاداری کردارەکانی پاککردنەوەی بەندەرەکە بێت. کە بەیکەر لە نووسینێکیدا دەڵێت:"پارچە کەشتیە کۆنە ژەنگاوەیەکان بەسەر حەوزی کەشتیەکانی ئوم قەسردا هەڵواسراون لە ناوەڕاستی مانگی ئابدا، ئاو و قوڕاوی دەریایان لێ دەتکێتەوە. تەلە کانزاییەکانیش کە بە قەد کێبڵی تەلەفون ئەستوورن، پاشماوەی کۆنە کەشتیەکانیان لە ژێرەوەی کەناڵە ئاویەکە دەرهێناوەو بە هەوادا هەڵیان واسیون، لەت کردنی بەدەنی کۆنە کەشتیەکەش دەڵێی وایەرە بە نێو قاڵبی پەنیردا ڕۆدەچێت." ٩٤

هاوکات لەگەڵ کردارەکانی پاککردنەوەی بەندەرەکە، USAID لە بەرانبەر یەك ملیار دۆلار لە ساڵێکدا گرێبەستی لەگەڵ کۆمپانیای دەریاوانی SSAدا کرد کە کۆمپانیایێکی خانەوادەییە لە سیاتل - واشنتۆن، بۆ ئەوەی بەندەرەکە بەڕێوە ببات. "دەیڤد بەیکۆن" چالاکوان لە بواری داکۆکیکردن لە مافەکانی کرێکار، بە "Corp Watch"ی ڕاگەیاند کەوا SSA پێشینەیەکی خراپی هەیە لە پەیڕەوکردنی سیاسەتی دژ بە مافەکانی ئەو کرێکارانەی نێردرابوونە عێراق. لە ساڵی ٢٠٠٢، ئەو پەیوەندیە نزیکەی کە بە ئیدارەی بۆشەوە هەیانبوو، لە میانەی دانوستانەکانی تایبەت بە چارەنووسی کرێکارەکان لە نێوان دەزگای دەریاوانی هێمن PMA ( دەزگایەکی تایبەتە بە خاوەن کارەکان، کە SSA یەکێکە لە ئەندامە هەرە توندڕەوەکانی) لەگەڵ یەکێتی بارکردن‌و ئەمبارکردنی نێودەوڵەتی

(ILWU) ئاشكرابوو:

چەند هەفتەيەك بەرلە تەواوبوونى وادەى گرێبەستەكە لە ٣١ تەمموزدا، حكومەت راستەوخۆ هاتە ناو مەسەلەكە. "تۆم ريدج" وەزيرى دەوڵەتو دواتريش"ئێلێن تشاو" وەزيرى كار، بە لێژنەى رێككەوتنەكانى يەكێتيەكەيان گوت، حكوومەت رێ بە هيچ مانگرتنێك نادات. ئەوەشيان روونكردەوە كە بۆش دەستدەكات بە جێبەجێكردنى ياساى تافت-هارتلى (*ياسايەكە لە ساڵى ١٩٤٧ كۆنگرێسى ئەمريكى پەسەندى كردووە، تايبەتە بە رێگريكردن لەبەردەم مانگرتنو خۆپيشاندانى ئەنجام دراو لەلايەن يەكێتيو سەنديكاكانى كرێكاران، "وەرگێر"*) كە بە پێى ئەو ياسايە كرێكارەكانى باركردن ئەوانەى خۆپيشاندان يان مانگرتن ئەنجام دەدەن، رێگەيان پێ نادرێت تا ماوەى هەشتا رۆژ بێ وەستان لە كارەكانيان پشوو بدەن يان بوەستن. لەوەش زياتر ناوبراوان گوتيان كەوا گردبوونەوەى كرێكارەكان بە درێژايى لێوارى دەرياو بەندەرەكاندا، رەنگە بە قۆرخكردنێكى ناياسايى ئەو شوێنانە ئەژماربكرێت، واتە گەر كرێكارەكان لە بەندەرێكدا مان بگرن ئەوا كەشتيەكان دەچنە بەندەرێكى تر بۆ باركردنو داگرتنى بارەكانيان، بەمەش مانگرتنەكە مايە پووچ دەبێت.

لە كۆتاييشدا، كاربەدەستەكانى ئيدارەى بۆش گوتيان، حكومەت سەربازەكانى هێزى دەرياوانى لە شوێنى كرێكارە مانگرتووەكان دادەنێتو ئەركى داگرتنو باركردنى بار لە كۆنتێنەرە زەبەلاحەكان بەوان دەسپێرێت. مەبەستى بۆشو ئيدارەكەشى لەو هەموو گەفو هەرەشەيە، بەدەست هێنانى ئامانجێكى خێراو دەسبەجێ بوو- لەناوبردنى كاريگەرى يەكێتيەكە بۆ ئەوەى ئەنجامدانى مانگرتن لە

بەندەرەکاندا ئەستەم بێت.

کاتێکیش ILWU خۆی بە دوور گرت لەو وروژاندنانەی کە رەنگبێ وای لێبکەن بێتە نێو مانگرتنەکە، PMA دەرگای تێرمیناڵەکەی لەبەردەم کرێکارەکان داخستو رێگەی چوونە ژوورەوەی پێنەدان لە کۆتاییەکانی ئەیلولی ٢٠٠٢. ئینجا خاوەن کارەکانیش داوایان لە بۆش کرد کە یاسای "تافت-هارلی" جێبەجێ بکات، دوای تێپەڕبوونی دە رۆژ ئەوەی ویستیان هاتە دی. سەرەڕای ئەوەشی کەوا خاوەن کارەکان خۆیان دەرگای تێرمیناڵەکانیان لەبەردەم کرێکارەکان داخستبوو، کەچی ئیدارەی بۆش بە پشت بەستن بە بڕیارێکی دادگای فیدراڵ، فرمانی بە یەکێتیەکە دا بۆ ئەوەی بە پێی گرێبەستیە کۆنەکە بگەڕێنەوە سەر کارەکانیان، هەروەها بێ وەستان تا ماوەی هەشتا رۆژی بەردەوام کار بکەن. ٩٥

با بگەڕێینەوە عێراق، سەرەڕای ئەو هەوڵانەی کە (فیدراسیۆنی یەکێتیەکانی بازرگانی دیموکراتی کرێکارەکان Workers Democratic Trade Union Federation) لە حوزەیرانی ٢٠٠٣ دابووی بۆ دامەزراندنی رێکخراوێکی تایبەت بەو کرێکارانەی کە لە حەوزی کەشتیەکانو هۆیەکانی تری گواستنەوەش کاریان دەکرد، کەچی تا کۆتایی ٢٠٠٣ هیچ جۆرە یەکێتیەکی تایبەت بە کرێکارەکانی حەوزی کەشتیەکان لە ئوم قەسر پێک نەهێنرابوو. وەکو چۆن "موحسین مول علی" دامەزرێنەرێکی خانەنشین بووی یەکێتی کرێکارەکانی بارکردن بە بەیکۆن دەڵێت: " رێژەی بێکاری لە نێو خەڵکی بەسرەدا دەگاتە ٧٠٪، کۆمپانیا ئەمریکیەکانیش لە بەرانبەر ٧٠ دۆلار لە مانگێکدا کرێکاری عێراقی بەکاردەخەنو کرێکاری بیانیش (کرێکارە ئاسیایەکان) لە بەرانبەر ٣٠٠ دۆلار مانگانە، بەرزی راددەی بێ کاریش لە نێو عێراقیەکاندا ناچاریان دەکات بە

هەموو جۆرە کارێك رازی بن‌و لە بەرانبەر هەر مووچەیەکیش بێت، هەر بۆیەش ئەمەریکیەکان ئەو هەلە دەقۆزنەوە."

"موحسین مول علی" دوو ساڵی تەمەنی لە زینداندا بەسەر بردووە بە تۆمەتی هەوڵدان بۆ رێکخستن‌و دامەزراندنی یەکێتیەکی تایبەت بە کرێکارەکانی بەسرە (ساڵی یەکەمی زیندانی لەسەردەمی پاشایەتی بووە، ساڵەکەی تریشی لەسەردەمی رژێمی سەدامدا بووە). کەچی هەر بە نیازە دووبارە بچێتەوە ناوچەکەو دەست بە رێکخستنەوەی یەکێتیەکی تایبەت بە کرێکارەکانی حەوزی کەشتیەکان بکات. لە قسەکانی بەردەوام دەبێت‌و دەڵێت: "ئەوان دەیانەوێت سەرمایەداریمان بەسەردا بسەپێنن، بەرپرسیارێتی ئێمەش رەتکردنەوەو بەرپەرچدانەوەی پرۆسەی بەتایبەتکردنە، هەتا بۆشمان بکرێت ئەوا لە پێناو دەسەبەرکردنی خۆشگوزەرانی کرێکارەکانمان خەبات دەکەین." ٩٦

بۆ خراپتر کردنی رەوشەکە، نارەزایی دەربرین‌و گلەیی کردن لەلایەن خودی مامەڵەکارەکانەوە لە بەرانبەر کردارەکانی هەلقۆستنەوە کە بە ئاشکرا لە بەندەرەکە ئەنجام دەدران دەستی پێکرد. "بەهنام پۆلس" وەزیری گواستنەوەی عێراقی بە "نیوزویک"ـی راگەیاند، کەوا کۆمپانیای SSA زێدەرۆیی لە وەرگرتنی کرێ کردووە: "ئەوان لە بری داگرتنی یەك تۆن کەلوپەل ١٢ دۆلار وەردەگرن، کە ئەمەش زۆرە، چونکە لە بەندەرەکانی دوبەی‌و کوێت بۆ داگرتنی یەك تۆن کەرەستە تەنیا ٣ دۆلار وەردەگیرێت. بۆیە زۆر لە کەشتیەکان لەبەر گرانی نرخ روو ناکەنە ئێرە." ناوبراو هۆیەکەشی گێرایەوە بۆ ئەو گەرەنتیەی کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە کۆمپانیاکانی دەبەخشێت، بەوەی پارەیان پێدەدات بێ رەچاوکردنی ئەوەی چەندو چۆن کارەکانیان ئەنجام دەدەن. بۆ وەڵامی ئەوەش، "بۆب واترز" وتەبێژی SSA بە "نیوزویک"ـی راگەیاند:" ئەوانە هەمووی

قسەی پڕوپوچن، چونکە کۆمپانیاکە هەر لە بنەڕەتەوە کرێو نرخی بارکردنو داگرتنی بارەکانی گران دانابوو، بۆئەوەی بەندەرەکە بتوانێت پشت بە سەرچاوەی داهاتی تایبەت بەخۆی ببەستێت." ئینجا گوتی، وەزارەتەکەی پۆلس بەرپرسیارێتی بەندەرەکەی وەرگرتەوە، بەڵام نرخەکان هەر وەکو خۆیان مانەوە. ٩٧

## چاوەڕوانی و بێزاری

لەسەر ئاستی نێوخۆیشدا، عێراق چاوەڕوانی نۆژەنکرنەوەی بنەڕەتی دەکرد. چاوەڕانی دەکرد. چاوەڕوانی دەکرد. لەگەڵ کۆتایی هاتنی شەش مانگی یەکەم بەسەر داگیرکاریەکە، کە بە داخەوە هاوکات بوو لەگەڵ گەرمترین هاوین لەو ساڵەدا، خەڵکەکە بەرەو ئاقاری ئاژاوە و رووبەڕووبوونەوە دەچوون. "محمد کازم حەمادی" هاوڵاتیەکی دانیشتوی شاری بەسرایە، بە "سان فرانسیسکۆ کرۆنیکاڵ"ی راگەیاند: "گەر ئەوان پێیان وابێت ئێمە لەو جۆرە کەشو هەوایە راهاتووین ئەوا هەڵەن. چونکە ئێمە خەڵکێکی خاوەن رێزو رەوشتین. مافی خۆشمانە کە لە ژیانێکی سەردەمیانە بژین." ئەو دەیگوت کەوا بێزار بووە لە خەوتنی سەربان، لە هەوکردنی پێستی لەشیان بە هۆی بەرزی پلەی گەرمی کە دەگاتە ٥١ پلەی سەدی، هەروەها لە بینینی منداڵەکانی لەبەرئەو گەرمیە هۆش لەخۆبەرە بە نێو حەوشەی ماڵەکەیانەوە بە جلی ژێرەوە دەسووڕێنەوە"، کە لە درێژەی قسەکانی دەیگوت: "ئێمە داوامان لێ نەکردوون کە بێن، ئێمە هەموو پێداویستیە بنەڕەتیەکانمان دەوێت، گەر حەز بەو بارودۆخە ناکەن بابگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتوون."

ساڵێك دوای داگیرکردنەکە، کاتێك کە خەڵکی عێراق گەیشتنە ئاستێك لە نیگەرانیو دڵەڕاوکێ، ئیتر پرسیاری ئەوەی، ئایا بەکتل دەیتوانی کارەکانی

بوژاندنەوەی ژێرخانی خێراتر ئەنجام بدات یان نا، هیچ گرنگیەکی نەمابوو. عێراقیەکان دەیانگوت، رژێمەکەی پێشوو دوای شەڕی یەکەمی کەنداو لە ١٩٩١، لە ماوەی چەند مانگێکدا، زۆربەی شتەکانی چاککردەوە و وەگەڕی خستنەوە. هەرچەندە کە زەرەرو زیانەکانی ئەو کاتە فراوانترو زێتریش بوون، چونکە ئەمریکاو بەریتانیا، لە تۆپ باران کردنەکانیاندا دامو دەزگای ژێرخانی تایبەت بە بەرهەم هێنانی کارەبایان کردبووە ئامانج.

بەکتلیش لەلایەنی خۆیەوە پێداگیری لەسەر هەڵوێستەکەی خۆی دەکرد، بەوەی هەرچەندە وێستگەکانی کارەباو بەرهەمهێنانی وزە، لە ساڵی ٢٠٠٣ بۆمباران نەکرابوون، بەلاّم ئابلۆقەو پشتگوێخستنی ئەو وێستگانە بۆ ماوەی دە ساڵ کاریگەری خراپی بەسەر ئامێرەکاندا هەبووە، بۆیە کارەکانی چاککردنەوەو گۆڕینی پارچەکان، پێویستی بە پارەو کاتێکی زۆرتر دەبێت بە بەراورد لەگەڵ ساڵی ١٩٩١. لەگەڵ ئەوەش، خایاندنی کاتێکی زۆر بۆ ئامادەکاریەکان، نابێ ببێتە مایەی سەرسوڕمانی بەکتلو ئیدارەی ئەمریکیش، چونکە بە پێچەوانەوە رەخنەگرەکان دەیانگوت دەبوایە ئامادەکاری زۆرترو باشتر بکرایە لە کاتی ئەنجامدانی کارەکان.

لە راپۆرتێکی بلاّوکراوە لە ئابی ٢٠٠٢، لەلایەن مونتەدای سیاسەتەکانی جیهانی- بنکەکەی لە نیویۆرکە، هاتووە:

ژێرخانی خزمەتگوزاریە مەدەنیەکان بە جۆرەها شێوە لە دەست نەبوونی چاککردنەوەو وەبەرهێنان دەیان ناڵاند. بۆ نموونە، کەرتی کارەبا لە عێراق تا ئێستا ناتوانێت بە شێوەیەکی بەردەوامو جێگیر یەك لەسەر سێی بڕی کارەبای پێویست بەرهەم بێنێت، سەرەڕای ئەوەی خەرجیەکانی بودجەی حکومەت بۆ ئەو کەرتە لە رادەدەی خەمڵێنراو رەتی داوە. ئاکامی کەمی کارەباش زیاتر لە هاوینە گەرمەکاندا بەرجەستە دەبێت، چونکە خواردنو دەرمانەکان

تێکدەچن‌و ئاوێکیش کە پاک‌و شیاوی خواردنەوە بێت دەست ناکەوێت‌و ئاوەڕۆکان دەگیرێن‌و زەویە کشتوکاڵیەکان‌و باخچەکانیش بێ ئاودان دەمێننەوە. بە مانایەکی تر کاریگەری بەسەر گشت لایەنەکانی ژیان دەبێت. ٩٨

بە هەرحاڵ، ئەندازیارە عێراقیەکان گەر دەرفەتیان پێبدرێت، توانای چاککردنەوەی هەموو شتێکیان هەیە. "موحسن حەسەن" فەرمانبەر لە وەزارەتی کارەبا، هەردوو دەستی لە یەکتری نزیک کردەوە بۆ ئەوەی مەبەستەکەی دەربخات، گوتی: "ئەمریکیەکان بە پێی ستانداردو پێوەری زۆر بەرز کاردەکەن، کەچی پێوەرەکانی ئێمە نزمن، بۆیە پێویستە پەیڕەوی لە پێوەرێکی مامناوەند بکەین." منیش لێم پرسی، بۆچی کارەکانی بەکتل لە عێراقدا بە هێواشی ئەنجام دەدرێن، کەچی بۆ نموونە لە عەرەبستانی سعودیە بە ماوەیەکی زۆر کورت سیستەمی کارەبا دامەزرێنرا؟ لە وەڵامدا گوتی:"لێرە باردۆخەکە زۆر جیاوازە، ئاسایش بەرقەرار نیە، دزین‌و تالان و تێکدان زۆرە، بە گشتی بارودۆخەکە دژوارترە گەر بەراوردی بکەین بە شوێنی تر."٩٩

لەگەڵ ئەوەش گلەییەکان هەر لە بواری کارەبادا نەبوون، بەڵکو لەوەتەی داگیرکردنەکەوە زۆربەی هێڵەکانی تەلەفونیش لە کار کەوتبوون، تا دوایین سەردانی کردنیشم لە نیسانی ٢٠٠٤، هەندێ شوێن تا ئەو کاتەش هێڵەکانیان پچڕابوون‌و چاکنەکرابوونەوە- چونکە بەداڵەو بنکەکانی تەلەفون لەلایەن فڕۆکە ئەمریکی‌و بەریتانیەکانەوە زۆر بە ووردی کرابوونە ئامانج. ئەندازیارەکانی بەکتل بۆ ماوەی ساڵێک هەوڵی بەگەڕخستنەوەیان دەدا، بەڵام دزین و تێکدانی بەردەوام ڕێگر بوون لە دووبارە ئیش پێکردنەوەی ئەو خزمەتگوزاریانە.

## پاك كردنەوەی قوتابخانەكان

بارودۆخی قوتابخانەكانی كە بڕیاڕبوو بەكتل لە هاوینی ٢٠٠٣ چاكیان بكاتەوە، زۆر باشتر نەبوو. توێژینەوەیەكی ناوخۆیی ئەنجام دراو لەلایەن بەشی تاكەكانی سوپای ئەمریكی، لەسەر بەڕێوەبەری قوتابخانەكان‌و كارمەندەكانی وەزارەتی پەروەردەی عێراقی، بۆ ڕۆژنامەی "كۆكس" نێردرابوو كە دواتر لە كۆتاییەكانی ٢٠٠٣ بلاَوكرایەوە. بە توندی ڕەخنەی لە هەوڵەكانی بەكتل دەگرت بۆ نۆژەنكردنەوەی قوتابخانەكان لە عێراق.

یەكێك لەو سەربازە ئەمریكیانەی كە بەشداری لەو توێژینەوەیەدا كردبوو، دەڵێت: "پانكە تازە بەستراوەكان، لە جۆری هەرزان‌و دوای كاركردنیشیان بە ماوەیەكی كەم لەكار دەكەون، دوای پشكنینیشیان دەركەوت گشتیان بێ كەڵكن." سەربازێكی تریش سەبارەت بە قوتابخانەیەكی تر دەڵێت: "بۆیاغی قوتابخانەكە زۆر بێ كەڵك‌و ناشرینە، قوتابخانەكەش بەگشتی پێویستی بە پاككردنەوەیەكی سەرتاپایی هەیەو ئاودەستەكانیش زۆر پیسن."

زۆربەی ڕەخنەكانیش پەیوەست بوون بە كاری ئەو بەڵێندەرە عێراقیانەی كە لەلایەن بەكتلەوە گرێبەستیان لەگەڵدا كرابوو. وەكو چۆن یەكێك لەو كارمەندە عێراقیانەی كە لە بواری پلاندانان بۆ قوتابخانەكان كاری دەكرد، نووسیبووی: "بەڵێندەرەكان داوایان لە بەڕێوەبەری قوتابخانەكان كردبوو كەوا كەلوپەلی شكاوو ساغ ڕادەست بكەنەوە. ئەو بەڵێندەرانە لای ئێمە نەناسراو بوون، چونكە ئەوان سەردانی نووسینگەكانی ئێمەیان نەدەكرد. لە زۆربەی حاڵەتەكانیشدا كارەكانی بۆیاغكردن بە خێرایی ئەنجام دەدران بە جۆرێك زیانی زۆرتریان بە ڕووخساری دەرەوەی قوتابخانەكان دەگەیاند لەوەی ببنە توێژێكی پارێزگاریكار بۆ پێكهاتەی

بالأخانەکە. لە یەکێك لە قوتابخانەکاندا کاریگەری بۆیاغ کردنەکە ئەوەندە خراپ بوو، کە زەرەرو زیانێکی زۆری بە کەرەستەی تاقیگەی قوتابخانەکەش گەیاندبوو، بە شێوەیەك چیتر بە کەڵکی بەکارهێنان نەدەهاتن." ١٠٠

لەوەڵامی ئەمانەدا، کاربەدەستانی بەکتل بەرگریان لە کارەکانی خۆیان دەکرد. وەکو چۆن "گریگۆری هیوگەر" بەڕێوەبەری پرۆگرامی ئاوەدانکردنەوە بە پەیامنێری رۆژنامەی "کۆکس"ی گوت: "کارمەندەکانی بەکتل گرنگی بە کارەکان دەدەن. چونکە هەموومان خاوەن منداڵین، هەمووشمان لە قوتابخانە خوێندوومانە. لە وڵاتێکیشدا، کە گەلێ قەیران و ئازاری چێشتووە ئەوە کارێکی پڕ لە مانایە. بۆیە ئەوە سیستەم و خەڵکە کە گرنگی بەو کارو مەسەلانە دەدەن، لە بارودۆخێکی دژوارو پڕ لە ئاژاوەشدا بەجێ گەیێنراون. ئاژاوەیەك کە ئەنجامەکەی هەلومەرجێکی رێك ترو زۆر عێراقی تر دەبێت."

رۆژنامەی "کۆکس" تەنیا دەزگای راگەیاندن نەبووە کە لەسەر گەندەڵییەکانی نۆژەنکردنەوەی قوتابخانەکان بنووسێت. پەیامنێرەکانی "نیوزویك" دەڵێن سەردانی پێنج لە قوتابخانەکانی گەرەکی "کەمپ سارە"یان کردووە لە بەغدا. هەر پێنجیان لەو قوتابخانانە بوون کە لەلایەن ئەو بەڵێندەرە عێراقیانەی گرێبەستیان لە بەکتلەوە پێ بەخشراوە نۆژەن کراونەتەوە. دوای تەواو بوونی کارەکانیشیان هیچ یەك لەو قوتابخانانە ژمارەی تەواوی کتێب و تەختەی دانیشتن و تەختە رەشەیان بۆ دابین نەکرابوو. خۆڵ و خاشاك و پاشماوەش لە گشت لایەکی قوتابخانەکاندا پەرش و بلاوببوونەوە، هەندێك لە تەوالێتەکانیش شیاوی بەکارهێنان نەبوون و هەر تەختەیەکی دانیشتنیش کە بۆ دانیشتنی دوو قوتابی دروست کرابوو، چوار قوتابی لەسەری دادەنیشت."احمد ماجد جاسم" بەڕێوەبەری یەکێك لە قوتابخانەکان و لایەنگری ئەمەریکییەکانیش بوو، بە پەیامنێرەکەی گوت:

"ئەمریکیەکان کاری باشیان کردووەو خۆم بینیومە کارەکانیان چۆن بووە، بەلآم ئەوەی ئێستا باسیان لێوە دەکرێت بێگومان جێ دەستی ئەوان نیە."١٠١

"کەریم ئەلجەوهەری" پەیامنێری رۆژنامەی "ئەلئەهرام"ـی میسری لە میانەی گەڕان‌و سەردانیدا بۆ ژمارەیەك قوتابخانە، بە هەمان شێوە گوێبیستی گازاندە و گلەییەکان ببوو. دکتۆر "نبیل خضیر عباس" بەڕێوەبەری بەشی پلاندانان لە وەزارەتی پەروەردەی عێراقی، کە بەرپرسی نزیکەی چواریەکی قوتابخانەکانی بەغدایە، بە ئەلجەوهەری راگەیاند، هەموو هەفتەیەك لەگەڵ نوێنەری کۆمپانیای بەکتل کۆبۆتەوە بۆ ئەوەی گلەییەکان بگەیێنێت. گوتیشی پرۆگرامەکە هیچ روون‌و ئاشکرا نەبووەو بەدواداچوونیش بۆ هیچ کارێك نەکراوە. هیچ کەسیش لە وەزارەتی پەروەردە زانیاری نیە لەسەر بڕی ئەو پارانەی کەوا حکومەتی ئەمریکی بە بەکتلی داوە بۆ جێبەجێکردنی ئەم پرۆگرامە، تەنانەت وردەکاری لەسەر کاری ئەنجام دراوی یەك قوتابخانەش لەبەر دەستدا نیە. ١٠٢

خۆم سەردانی چوار قوتابخانەم کرد لە بەغدا، سەرەتا چووم بۆ قوتابخانەی "الحارثیة" کە بالآخانەیەکی نزمی رەنگ سپی بوو ٥٧٠ قوتابی سەرەتایی لەخۆ دەگرت. لەوێ چاوم بە "هدی صباح عبدالرازق" کەوت، بە پەرۆشەوە ئەو شوێنانەی کە بە خراپی چاك کرابوونەوە نیشان دەدام: ئاوی باران لەسەربانەکەوە دزەی دەکرد، نەبوونی کارەبا، بۆیاغە تازەکراوەکەش هەر زوو توێکڵی دابوو هەروەها زەوی قۆتابخانەکەش بە تەواوەتی رێك نەخرابۆوە.

ئەوەی زۆرتر "هدی عبالرازق"ـی پەست کردبوو، بڕی ئەو پارەیە بوو کە بۆ کارەکانی نۆژەن کردنەوە خەرج کرابوو، بە حەسرەتێکیشەوە دەیگوت:"لە توانام دایە هەموو ئەو شتانە تەنیا بە هەزار دۆلار چاك بکەمەوە، کەچی"جێف"(بەڵێندەرێکی بەکتلە) بیست هەزاری دۆلاری خەرج

کردووە." ناوبراو بۆ شکایەت کردن چووە ئەنجوومەنی ناوچەکە و دواتریش بۆ سەنتەری کۆنفرانسەکان بۆ ئەوەی چاوی بە سەرکردەکانی سوپا بکەوێت، کە دەیگوت: "کاتێك پێم راگەیاندن، ئەوان زۆر تووڕە بوون لەو شتانەی کراوەو قسەیان لەگەڵ (حەسەن) کرد کە ئەندامی ئەنجوومەنی ناوچەکەیە. بەلاَم هیچ شتێك رووی نەداو ئێمەش هیچ وەسڵێکمان بە پارە خەرجکراوەکان لا نەبوو، بۆیە ئەو جۆرە هەولاَنە بێ ئاکامن و ئەوانیش هیچ رێو شوێنێك ناگرنەبەر."

دواتر بەرەو قوتابخانەی "الوثبة" چووم، ئەو قوتابخانەیە لە نێو هەموو ئەو قوتابخانانەی کە سەردانیم کردبوون، خراپترینیان بوو. "احمد عبدالستار" کە ماوەی دوو ساڵ بوو لەوێ کاریدەکرد، تەوالێت و دەستشۆرەکانی نیشان دام. جۆری حەنەفیەکان مس بوون و دەرگاکانیش بە بۆیاغێکی قاوەیی تاریك رەنگ کرابوون، بەلاَم دەستشۆرەکان زۆر خراپ و بێ کەڵك بوون. دەتگوت ماوەی دە ساڵە دەستیان لێ نەدراوە، گشت دیوارەکانیش پێویستیان بە دووبارە بۆیاغ کردنەوە هەبوو، بە هەمان شێوەی قوتابخانەکەی تر ئاو لە دیوارەکانەوە دزەی دەکرد. بە گاڵتەوەش دەیگوت: "بیر لەوە دەکەمەوە ئێرە بکەمە مەلەوانگە، لە راستیدا لەوەتەی سەردەمی رژێمی سەدام هیچ شتێك نەگۆڕاوە، ئایا پێت وایە منداڵە ئەمریکیەکان رازی دەبن ئەو جۆرە تەوالێتانە بەکار بێنن؟" منیش پێم گوت، ئەو پارەیە لە ئەمەریکاوە هاتووە و لە بەرانبەریشدا ژمارەیەکی زۆری مامۆستا بێکار بوونە. کەچی ئەو پرسیارەکەی خۆی دووبارە کردەوە:" ئایا پێت وایە منداڵە ئەمریکیەکان رازی دەبن ئەو جۆرە تەوالێتانە بەکار بێنن؟ هیچ شتێکمان نیە نە کتێب، نە قرتاسیە هیچ شتێك، خۆ هەرنەبێ لە کاتی سەدامدا ئەو شتانە هەبوون. راستە مووچەکانمان زیادی کردووە، بەلاَم نرخەکانی بازاڕیش بەرزبوونەتەوە. کەچی کاتێك پرسیار لە بەڵێندەرەکە

دەکەم، بۆچی کارەکانتان بە تەواوەتی ئەنجام نەداوە، لە وەڵامدا پێم دەڵێت خۆ ئێمە لای تۆ کار ناکەین، ئێمە بۆ ئەمریکیەکان کار دەکەین."

سەردانێکی کورتیشم بۆ قوتابخانەی "الرجاء" ئەنجامدا، کە هێشتا کارەکانی نۆژەنکردنەوە تیایدا بەردەوام بوو. "جەمال سالح" پاسەوانی قوتابخانەکە، یاوەری کردم بۆ بینینی قوتابخانەکەو چۆنیەتی بەڕێوەچوونی کارەکان، ناوبراو پێی گوتم کە داوای لە بەڵێندەرەکە کردووە خانووەکەشی چاك بکاتەوە، بەلام بەڵێندەرەکە رازی نەبووە. بە خێرایی چاوێکم بە ژوورەکاندا خشاندو بینیم هاوسەرەکەی و دوو کچەکەی سەرقاڵی سوورکردنەوەی پەتاتەبوون بۆ ژەمی نیوەڕۆ. لەو لاوەش کرێکارەکان داوایان لێکردم بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ لەلایان بمێنمەوەو فەلافلیان لەگەڵدا بخۆم، بەلام سوپاسم کردن‌و داوای لێبوردنیشم کرد، چونکە بەپەلە بووم‌و دەبوایە سەردانی قوتابخانەکانی تربکەم بەرلە کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ کە کاتی تەواوبوونی دەوامە.

دواتر بەرەو قوتابخانەی "هاوا" چووم کە بەڕێوەبەرەکەی " بەتول مەهدی حسین" ئافرەتێکی بالابەرزو جل‌و بەرگێکی سەرتاپا قاوەیی پۆشیبوو لەگەڵ سەرپۆشێك لە رەنگی جلەکانی. هەرچەندە ناوبراو وا بۆ یانزە ساڵ دەچێت مامۆستایە لەو قوتابخانەیە، بەلام بە رواڵەت بچووکتر لە تەمەنی خۆی دەردەکەوت. دوای رووخانی رژێمی سەدامیش کەس‌و کاری قوتابیەکان دەنگیان پێدابوو بۆئەوەی ببێتە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە. بە هەمان شێوەی هەردوو بەڕێوەبەرەکەی تر، ئەویش پەرۆش بوو بۆ ئەوەی قوتابخانەکەم پیشان بدات‌و قسەم لە بارەیەوە بۆ بکات. کە بە هەمان شێوە بێزاری لە کاری بەڵێندەرەکان دەردەبڕی. دیوی دەرەوەی قوتابخانەکە تازە بۆیاغکرابۆوەو وێنەی گشت کەسایەتیە کارتۆنیەکانی "دیزنی لاند"یشی لەسەر کێشرابوو، عەلائەدین‌و بگرە کەسایەتی فریشتەو شازادەش. بەلام

ناوبراو پێی وابوو بەبەراورد لەگەڵ سەردەمی رژێمی سەدامدا هەلومەرجی ئێستا خراپتر بووە. بە تووڕەییەوەش دەیگوت: "UNICEF دیوارەکانی بۆ بۆیاغکردبووین‌و پانکەی یابانیشی بۆ بەستبووین، وەك چۆن دەیبینی لەسەر دیوارەکان وێنەی کەسایەتیە کارتۆنیەکانیشی بۆ کێشاوین، بەلام کە بەڵێندەرە ئەمریکیەکان هاتن پانکە یابانیەکانیان بردو لە بریشەوە پانکەی سوریان بۆ بەستین کە تەنانەت پێش ئەوەی ئیشیان پێ بکەین لە کار کەوتبوون."

خەریکی قسەکردن بووین کە پاسەوانی قوتابخانەکە "عەلی سەکران" هاتە لامان، ناوبراو نەختێك وشەی ئینگلیزی دەزانی. چەند جارێك بە چەکەکەی کە لە جۆری AK-٤٧ بوو ئاماژەی بەو کارانە دەکرد کە لەسەردەمی سەدامدا ئەنجام درابوون. منیش لە ناخمەوە هیوام دەخواست چەکەکەی سوار نەبێت!!

دواتر بەڕێوەبەرەکە بردمی بۆئەوەی تەوالێتەکانم نیشان بدات، کە سیستەمێکی تازەی لێ بەسترابوو- بۆڕی، حەنەفیەو ماتۆڕێکی هێنانی ئاویش. بەلام گرفتەکە لەوە دابوو، ماتۆڕی ئاوەکە ئیشی نەدەکرد کە ببووە هۆی ئەوەی تەوالێتەکان بۆنێکی ناخۆشیان لێ بێت لەبەر نەڕۆیشتنی ئاوەڕۆکەی. دواتر ناوبراو سەرپۆشی ئاوەڕۆکەی هەڵدایەوە، لەبەرنەبوونی کەناڵێکی رۆیشتن‌و بەتاڵکردنەوە لە ژێرەوەیدا پاشەڕۆیەکی زۆری لێ کۆببۆوە. ئینجا بێ ئەوەی چاوەڕێی کامێراکە بکات بە خێرایی بەرەو دەرگاکان چوو، دەشیگوت: "دەسکی ئەو دەرگایانە هەموویان شکاون‌و بۆیاغە تازەکەش خەریکە هەڵدەستێت‌و کارەباش نیە بۆ رووناك کردنەوەی قوتابخانەکە." کاتێکیش چووینە پۆلەکان، لە یەکێك لە پۆلەکان تێبینیم کرد تەختەڕەشەیەکی تازە هەڵواسراوە، بەلام بەڕێوەبەرەکە گوتی:" مامۆستاکان لەسەر ئەرکی خۆیان ئەوەیان کڕیوە." دوای تەواوبوونی

سەردانەکەم‌و خواحافیزی کردن، ناوبراو تا دەرگای دەرەوە لەگەڵم هات‌و ئاماژەشی بۆ ئەو پاشماوەیە کرد کە لە دوای تەواوبوونی کارەکان لەسەر ڕێگاکە لە دیوی دەرەوەی قوتابخانەکە فڕێدرابوون‌و گوتی: "ئەوان تەنانەت زبڵ‌و پاشماوەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا نەبردووە، هیچ دۆکیومێنتێکی دەورو تەسلمیشیان پێ نەداوین، بۆ ئەوەی بزانین چیان چاککردۆتەوەو چیان چاکنەکردۆتەوە. بۆیە ئێمە خۆمان دەبێ پارەی لابردنی ئەو پاشمانەوە بدەین. گەر راستیشت دەوێ بەرلەهاتنی بەڵێندەرەکان قوتابخانەکەمان لە بارودۆخێکی زۆر باشتردا بوو."

"فرانشیس کاناڤان" وتەبێژی بەکتل لە بەغدا، پێی راگەیاندم کە لێپێچینەوەی زۆریان لەگەڵدا کراوە سەبارەت بە ژمارەیەك قوتابخانەی کەوا لە ڕێی گرێبەستی کۆمپانیاکەیانەوە چاککراونەتەوە. ناوبراو دەڵێت کۆمپانیاکەیان ڕێنمایی سەبارەت بە شێوازو چۆنیەتی ئەنجامدانی کارەکان داوەتە بەڵێندەرەکانی، ڕێژەی ١٠٪ پارەی گرێبەستیەکانیشی دواخستووە تا دوای تەواوبوونی کارەکان بۆ ئەوەی دڵنیابێت لەوەی کەمتەرخەمی ناکرێت. کاتێکیش کە لێم پرسی، ئەوە لە نەریتی بەکتل دا نیە کارێك ئەنجام بداتو کارامەیی‌و لێزانی پێوە دیارنەبێت. لە وەڵامدا گوتی کۆمپانیاکەیان پێشینەی لە نۆژەنکردنەوەی قوتابخانەدا نیە: "ئێمە گرێبەستیمان لەگەڵدا کراوە، چونکە تەنیا کۆمپانیاین کە دەتوانین لە ماوەیەکی کەمدا هەماهەنگی‌و ڕێکخستن بۆ پرۆژەیەکی ئاوا بکەین."

سەبارەت بە بارودۆخی قوتابخانەکانیش، USAID هیچ پۆزشێکی لا نەبوو. یەکێك لە وتەبێژە رەسمیەکانی دەزگای ناوبراو پێی گوتم: "گەر بتەوێ وتارێکی بەهێز دەربارەی هەڵسانی بۆیاغ لەسەر دیواری قوتابخانەیەك بنووسیت‌و بۆچیش چاکمان نەکردۆتەوە تاکو ناوبانگی پێ دەربکەیت، ئەوا ئامادە نیم لێدوانت بۆ بدەم. ناشزانم ئاخۆ سەردانی ئەو

قوتابخانانەت کردووە کە دەزگاکەمان نۆژەنی کردوونەتەوە- بیستو شەش قوتابخانە لە کۆی ئەو پەنجاو دوو قوتابخانەیەی کە شکایەتیان لە جۆری نۆژەنکردنەوەکان لێ کراوە، هیچ پەیوەندیەکیان بە گرێبەستیەکەی دەزگاکەمانەوە نیە." بۆیە بۆم دووپات کردەوە، من تەنیا سەردانی ئەو قوتابخانانەم کردووە کە لە لیستی کۆمپانیای بەکتلدا هاتوون، هەر بۆیەش لیستەکەم پیشان دا. ئینجا ناوبراو دانی بەوەنا کەوا ناوەکانی لەو لیستە هاتوون ناوبانگێکی خراپیان هەیە، چەندین راپۆرتی رۆژنامەوانیش باسیان لە کەمو کورتی پرۆگرامی چاککردنەوەی قوتابخانەکان کردووە، کە کاربەدەستەکان هیواخوازبوون ناوبانگێکی باشی پێ دەربکەن.

"فرانشیس کاناڤان" لە دوا ئیمەیلیدا کە بۆی ناردبووم، نووسیبووی نەیتوانیوە ناوی ئەو قوتابخانانەی، لە بەغدا سەردانیم کردبوون لە لیستەکەی بەکتلدا بدۆزێتەوە. لە تێبینیەکیشدا نووسیبووی:"لەگەڵ ئەوەش، ناوی زۆر لە قوتابخانەکان گۆڕاونو ناوەکانیش کە وەردەگێڕدرێن بۆ سەر زمانی ئینگلیزی گۆڕانکاریان بەسەر دادێت." بۆیە رێککەوتین، بەیەکەوە پێداچوونەوەی ناوەکان بکەین، بەڵام لەسەردانی دووەممدا بۆ عێراق کێشەیەکی ترم هاتە- پێش: ئەو وەرگێڕە عێراقیەی کە پێشتر لەگەڵم بوو، لەبەر دژواری بارودۆخەکە بەغدای جێهێشتبوو.

کاناڤان لەگەڵ هاوکارەکەی "جۆناسان مارشاڵ" کە لە سان فرانسیسکۆوە هاتبوو، پێیان گوتم بەدواداچوون دەکەن، سەبارەت بەو قسە و باسانەی کە لەبارەی ئەو قوتابخانانەی من سەردانیم کردبوون دەکرێن. بۆیە مارشاڵ لە رێی چاوپێکەوتنێکی تەلەفونی لە ئایاری ٢٠٠٤ پێی گوتم: "بۆمان دەرکەوتووە بیست و هەشت قوتابخانەی نۆژەنکراوە کێشەیان هەبووە، بۆیە ناڵێم کەم و کورتیمان نەبووە. بەڵام پێشبینی هەبوونی کێشە و گرفتمان دەکرد و بە نیازیش بووین دوای تەواو بوونی کارەکان بیانپشکنین." منیش

پـێم گـوت، گـەر هـیچ دۆکیومێنتێـك لـە بەردەسـت نـەبێت بیـسەلمێنێ کۆمپانیاکـە پلانـی بـۆ بەدواداچـوون هـەبووە، ئـەوا وەکو گرتنەبـەری رێ و شوێنی پێویـستە، بـەلاّم دوای روودانـی شـتەکە. چونکە لـەو حاڵەتـە پەیـدا بوونی گرفـت، کێشەی تـر بـەدوای خۆیـدا دەهێنێت، کە وەکو پەتایـەکی لێ دێت گشت کارەکانی نۆژەنکردنەوە و ئاوەدانکردنەوە لە عێراق دەگرێتـەوە و لە ئاکامیشدا مشت و مـڕ و دواکـەوتنی زۆری کارەکانیـشی بـەدوادا دێـت. کـە بێگومـان ئاکامەکـەی زیـادبوونی نـاکۆکی دەبێـت لـە نێـوان عێراقیـەکان و دەسەلاّتی داگیرکەر و بەڵێندەرەکانیش، بەوەی کامیان بەرپرسیارن. ١٠٣

## ئاو لە هەموو شوێنێك هەیە، کەچی یەك دڵۆپ بۆ خواردنەوە نیە

لە ئایاری ٢٠٠٤، دوای تێپەڕبوونی ساڵێك لە داگیرکردن، کارگەی ئاوەڕۆی کەرخ لە بەغدا کە توانای لە خۆگرتنی پاشەڕۆی زیاتر لە دوو ملیـۆن کەسـی هەبوو، تا ئێستا بەکار نەخراوەتەوە. لەجیاتی ئـەوە، گۆمـاوی رەنـگ سـەوزو قاوەیی راستەوخۆ دەرژێتە دەوروبەری رووباری دیجلە. ئەوە لـە کاتێکدا کـە بە درێژای رێگەی سەرەکی بۆ بەسـرە، خـەڵکی شـار و شارۆچکەکان گـشتیان ئـاوی ئـەو رووبـارە بـۆ خواردنـەوە بـەکار دەهێـنن و هەنـدێ خـەڵکی تـریش مەلەو راوە ماسی لێ دەکەن.

"سـعد محمـد" بەڕێوەبـەری گـشتی بەڕێوەبەرایـەتی ئـاوی بەغـدا، لـە ناوەڕاستی کانوونی یەکەمی٢٠٠٣ پێی راگەیاندم: "هەر لەسەرەتاوە، ئـەمریکا وای دەزانـی عێـراق وەکـو ئەفغانـستان وایـە، ژێرخـانی دارِمـاوەو پـسپۆڕو شارەزاشی نیە. بەلاّم کاتێك هاتنە ئێرە هەستیان بـە جیـاوازی کـرد. گرفتـی سـەرەکیش لـەوەدا بـوو، ئـەو بـڕە پـارە دەستنیـشان کـراوە کـەم بـوو کـە بـۆ چـاککردنەوەی تـۆڕی ئـاوو و ئاوەڕۆکـان دانرابـوو لـەو ١٨ ملیـار دۆلارەی کـە ئەمریکا بۆ نۆژەنکردنەوەی ژێرخانی تەرخانی کردبوو." ١٠٤

لە نیسانی ٢٠٠٤، کاناڤان دانی بەوە دانا، کەوا سیستەمی ئاوەڕۆکان تا ئێستا چاکنەکراونەتەوە، بۆ ئەوەش روونکردنەوەی هەبوو: "لەسەردەمی رژێمی سەدامدا، کارگەکانی تایبەت بە چارەسەری ئاوەڕۆکان تەنیا پاشەڕۆکانی فرێ دەدایە نێو رووبارەکە، بۆیە ئێمەش ناتوانین لە ماوەی شەوو رۆژێکدا چاکی بکەینەوە." کاتێکیش کە قسەکانی ناوبراوم بۆ"وەزاح" وەرگێرەکەم گێرایەوە، زۆر پەست بوو گوتی: "پاشەڕۆکان تەنیا فرێ دەدرانە نێو رووبار؟!!!باشە کێ لە شەڕی یەکەمی کەنداو بۆمبارانی سیستەمی ئاوەڕۆی کرد؟ کێ ئابلۆقەی خستە سەر هێنانی کلۆر بۆ پاککردنەوەی ئاوی خواردنەوە بە بیانووی بەکارهێنانی لە دروستکردنی چەکی کۆکوژیدا؟" ١٠٥

چەند هەفتەیەك بەر لەوە، "Public Citizen" کە گروپێکی ناسوودمەندی ئەمریکیە، داوای ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی کرد دەربارەی ئەوەی بۆچی بەکتل ئەرکەکانی لە ساڵی یەکەمی گرێبەستیەکەی تەواو نەکردووە. "وێنۆناه هاوتەر" کە بەڕێوەبەری کەمپینی (ئاو بۆ هەمووان)ـە، گوتی: " ئەو پرۆژانەی بەکتل ئەنجامیان دەدات، پشتگیری داراییان لەلایەن باج دەرە ئەمریکیەکانەوە بۆ دابین دەکرێت، بێ ئەوەی هیچ جۆرە میکانیزمێکی چاودێری‌و بەدواداچوون هەبێت. لەوەش دەچێت کۆنتراکتە قازانج بەخشەکانی بەکتل توانای پارمەتیدانی عێراقیەکانیان نەبێت لە دەسەبەرکردنی ئاوی خاوێن، لە کاتێکدا کە زۆر پێویستیان پێیەتی. حکومەتی ئەمریکی نابێت پارە بداتە ئەو کۆمپانیا تایبەتیانەی کە تەنیا بە دوای دەسەبەر کردنی قازانجی زیاترن و پێداویستی خەڵکیش پشت گوێ دەخەن. دەسەبەرکردنی ئاویش پێویستیەکی جەوهەری خەڵکیە، بۆیە دەبێ کاری جدی بکرێت بۆ دابینکردنی." ١٠٦

بە پێی راگەیاندنی "Public Citizen"، یەکێك لە ئەرکە هەرە

سەرەکیەکانی بەکتل بریتی بووە لە دابینکردنی ئاوی خواردنەوە بۆ دانیشتوانی ناوچەی باشووری عێراق لە دوو مانگی یەکەمی دەسپێکردنی پرۆگرامەکەیان. لەگەڵ ئەوەش، ساڵێك دوای ئەوە چاودێرەکان دەڵێن کەوا بەڵگەو ئاماژەی کەم هەن لەسەر بە ئەنجام گەیاندنی ئەو کارە. زیادبوونی رێژەی تووشبوان بە نەخۆشیەکانی کۆلێرا، بەردی گورچیلەو زگچوونیش بەڵگەن لەسەر هەرەسهێنانی پرۆژەکەی بەکتل.

گرووپی ناوبراو شاری"حیللە"ی بە نموونە هێناوەتەوە، بنکەی چارەسەرکردنو دابەشکردنەوەی ئاوی شارەکە، یەکێك بوو لەو پرۆژانەی کەوا بە پێی راپۆرتی هەڵسەنگاندنی کۆمپانیای بەکتل، دەبێ لە ماوەی شەش مانگدا بەجێ بگەیێنرێ بۆ بەدەنگەوە هاتنی ئەو داواکاریە زۆرو بە پەلانەی ئاو. لە١٧ تشرینی یەکەمی٢٠٠٢دا ئەو شەش مانگەی کەوا کۆمپانیاکە دیاری کردبوو بۆ تەواوکردنی پرۆژەکە تەواو بوو."سالم حەسەن کادیل" سەرۆکی ئەندازیارانو بەڕێوەبەری بنکەکە، دەیگوت: تەنانەت لە رۆژانی جەنگیشدا توانای دابینکردنی ئاومان هەبووە بۆ هەموو ماڵێك. ئەو کات ئەندازیارەکان تەنیا بۆڕیو ترومپا لەکار کەوتووەکانیان دەگۆڕی. بەڵام ئەو ئاژاوەو تاڵانو دزینەی کە لە دوای شەڕی ئەوجارە سەریان هەڵدا، دارمانی ژێرخانی خزمەتگوزاری دابینکردنی ئاوی لێ کەوتەوە. سەرەڕای ئەوەی رێکخراوەکانی UNICEF، خاچی سووری نێودەوڵەتیو ژمارەیەك لە رێکخراوە مرۆییەکانی تریش، یارمەتیەکی زۆریان پێشکەشی ئەو کەرتە کرد، کەچی وێستگەکە تەنیا رێژەی ٥٠٪ پێداویستی دانیشتوانی شارەکە بۆ ئاوی خواردنەوە دابین دەکات.

تا بەهاری ٢٠٠٤، گوندەکانی دەوروبەر نە ئاویان هەبوو، نە بۆڕی ئاوی پێویستیشیان بۆ دابینکرابوو، دەشیانخواست کارەکان تەواو بکرێن. ناوبراو رایگەیاند: بەکتلو بەڵێندەرە لاوەکیەکانیش هیچ جۆرە پەیوەندیەکیان بە

وێستگەکەی نەکردووە، سەرەڕای سەرهەڵدانو بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکانی وەك کۆلێرا، زگچوو هەروەها بەردی گورچیلەشلەو ناوەچەیەدا.

ناوبراو بە گرووپی "Public Citizen" راگەیاند: بەکتل بە شێوەیەکی نابەرپرسیارانە هەڵسوکەوت دەکات " بەوەی پارەیەکی زۆر بێ هەبوونی پلان خەرج دەکات":

ئێمە زانیاری تەواو دەدەینە رێکخراوە ناحکومیەکانمان بە لەوەی دەست بەکارەکانیان بکەن، بەو جۆرەش ئەوان دەزانن کە دەبێ چی بکەن. بەکتل دەچێت دیوارەکان بۆیاغ دەکات، ئەمەش ئاوی پاك دابین ناکات بۆ ئەو خەڵکەی کە بە هۆی خواردنەوەی ئاوی پیس گیانلەدەست دەدەن. داوایان لێ دەکەین لە بری بۆیاغ کردنی بالاًخانەکان، ماتۆرێکی ئاومان بۆ بکڕن تا بتوانین خزمەتگوزاری بۆ ژمارەیەکی زۆرتری خەڵك دابین بکەین. لەوەتەی ئەمەریکیەکانیش هاتونەتە ئێرە هیچ گۆڕانکاریەك رووی نەداوە. دەشزانین بەکتل پارە بە فیڕۆ دەدات، بەڵام ناتوانین بیسەلمێنین. ١٠٧

کاتێکیش کە پرسیاری ئەو مەسەلەیەم لە "کاناڤان" کرد، رەتی ئەو تۆمەتانەی کردەوە:

تێنەگەیشتنێکی جەوهەری هەیە سەبارەت بە جۆرو شێوازی کارەکانمان. وەسفکردنیان بۆ گرێبەستە راستەقینەکەی USAID تەواوە، بەڵام ئەوە بریتی بووە لە لیستەکانی بازاڕکردنو کڕینی هەموو ئەو شتانەی کە دەیان ویست. بۆیە ئێمە خەملاًندنی خۆمان کردووەو پێشیان راگەێنراوە کە دەتوانرێ چ کارێك بە٦٨٠ ملیۆن دۆلار ئەنجام بدرێتو لە کاتێکی دیاریکراویشدا. پێویستیمان بە شانزە ملیار دۆلار دەبێت بۆ تەواوکردنی هەموو ئەو کارانەی کە ئەوان دەیانەوێت تەواو بکرێت. گرێبەستیەکە باس لە دروست

کـردن‌و چـاککردنه‌وه‌ی ۱۰۰پـردیش ده‌کـات، بـه‌لأم تـه‌نیا کـار له‌سـه‌ر ژماره‌یه‌کی که‌می ئه‌و پردانه ده‌که‌ین. تـا ئێستاش کاره‌کانی کارگه‌ی چاره‌سه‌رکردنی ئاومان ته‌واو نـه‌کردووه‌و کاریشمان تـا ئێستا له‌سـه‌ر دابه‌شـکردنی ئـاو نـه‌کردووه، بۆیـه بـه دڵنیاییـه‌وه سه‌رچـاوه‌کانی دابینکردنی ئاو هه‌تا ئێستاش خاوێن نین. ۱۰۸

## گرێبه‌ستیه‌کی داهێنه‌رانه

لـه‌و کاتـه‌ی نۆژه‌نکردنـه‌وه‌و چـاککردنه‌وه‌ی ژێرخـانی قوتابخانـه‌کان‌و ئاوه‌ڕۆکـان خرابـووه ئه‌سـتۆی کۆمپانیـای بـه‌کتل، کۆمپانیـایێکی تـر بـه نـاوی Creative Association International باره‌گاکـه‌ی لـه واشـنتۆنه، گرێبه‌سـتیه‌کی له‌لایـه‌ن رێکخـراوی USAID ـه‌وه بـایی ۱۵۷ ملیـۆن دۆلار له‌گه‌ڵدا کرا، بۆ چاکسازی له سیسته‌می په‌روه‌رده‌و فێرکردن له عێراق. ۱۰۹

ئه‌و گرووپه راوێژکاریه له‌لای ستافی USAIDـه‌وه به باشی ناسرابوو، چـونکه ژماره‌یـه‌ك لـه کارمه‌نـده‌کانی پێـشتر لـه USAID کاریـان کردبـوو. وه‌ك "فرانــك دال" به‌ڕێوه‌بـه‌ری پێـشووی به‌شـی پـه‌روه‌رده‌و فێرکردنـی رێکخراوه‌کـه لـه رۆژهـه‌لأتی ناوه‌ڕاسـت. کـه پێـشتریش گـه‌وره راوێـژکاری پـه‌روه‌رده‌و فێرکردنـی UNICEF بـووه لـه ئـوردون‌و هـه‌روه‌ها به‌رپرسـی پرۆگرامی نه‌ته‌وه‌یی هه‌مان رێکخراویش بووه له رۆژهه‌لأتی ناوه‌ڕاست.

چـه‌ند مـانگێکیش بـه‌ر لـه شـه‌ڕ، "فرانـك دال" له‌گـه‌ڵ به‌رپرسـه‌کانی USAID به‌شـداری کۆبوونه‌وه‌یـه‌کی کردبـوو بـۆ گفتوگـۆکردن ده‌ربـاره‌ی سیـسته‌می پـه‌روه‌رده‌و فێرکـردن لـه عێـراق. گومـانیش هه‌یـه لـه‌وه‌ی لـه کۆبووه‌نه‌وه‌کـه‌دا لـه رێـی "بـرۆس کراندلیمایـه‌ر" یاریـده‌ده‌ری پـشکنه‌ری وردبینـی گـشتی لـه USAID، ته‌زکیـه کرابـێ بـۆ ئـه‌وه‌ی گرێبه‌سـتیه‌که پێداچوونه‌وه‌ی بۆ بکرێت.

لە حوزەیرانی ٢٠٠٣، لە یاداشتنامەیەکی USAIDدا هاتبوو، بە پێی دۆکیۆمێنتەکان دەرکەوتووە:"تەنیا یەك لەو پێنج بەڵێندەرانەی کەوا بە دوای یەکتریدا بانگێشت کرابوون بۆ رکابەرکێیەکی راگەیەنراوی تایبەت بە دەسەبەرکردنی کۆنتراکتەکە، ئامادەی دانیشتنی یەکەم ببوو. لەوەش زیاتر، گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کەوا کاربەدەستانی نووسینگەی USAID پابەند نەبوون بە رێنماییەکانی تایبەت بە روونکردنەوەی شێوازەکانی خۆ بەدوورگرتن لە بەیەك گەیشتنی رێکخراوی بەرژەوەندیەکان (تچارب منقم للمصالح)." لەوە دەچێت کاربەدەستەکانی USAID بە نووسینگەی وردبینی گشتیان گوتبێت، پێویست ناکات "تۆژینەوەی بازاڕ" کە بە پێی رێساکانی دەسەبەرکردن داواکراوە ئەنجام بدرێت، چونکە کاربەدەستەکان پێشتر ئەوەیان دەزانی کە دەبێ کام کۆمپانیا هەڵبژێردرێت، وەکو چۆن لە یاداشتنامەکە هاتووە. ١١٠

هەر بۆ یادخستنەوەش، "Creative Association" پێشینەی هەیە لە یارمەتیدانی ئیدارەی ئەمەریکی بۆ دەستەبژێرکردنی ئەو ئەمریکیانەی کەوا گرنگی بە بواری پەروەردەو فێرکردن دەدەن لەو ناوچانەی شەڕو ململانێیان لێیە. کۆمپانیا راوێژکاریەکە پاڵپشتی دارایی لە هەریەك لە USAID و پێنتاگۆنەوە پێ گەیشت، بۆ یارمەتی دانی گەریلاکانی سەر بە "کۆنترا"، کە بەرهەڵستکاری کۆمەنیستەکانیان دەکرد لە نیکاراگوا، هەروەها دژ بە "ساندینیستاس"یش دەجەنگان، لە فڕێدانی چەك و راهێنانیان لەسەر کاری مەدەنی. لە ساڵی ١٩٨٩، لە کۆی٢٧ ملیۆن دۆلاری تەرخان کراو لەلایەن USAID، کۆمپانیاکە یەك ملیۆن دۆلاری وەرگرت، بۆ راهێنانو فێرکردنی بەرهەڵستکارەکانی سەر بە کۆنترا لەسەر کاری چاککردنەوەی رێگاکانو فریاکەوتنو چاککردنەوەی ئەو ماتۆڕو مەکینانەی بە سووتەمەنی کاردەکەن. ١١١

کۆمپانیاکـه تـوانی گرێبەسـتی هاوشـێوەی ئـەوەی لەسـەرەوە باسـکرا بەدەست بێنێت لـه چوارچێوەی "شـەڕی دژ بـه تـیرۆر" سـەرەڕای هـەبوونی گـەلێ لـه بەڵێنـدەری تـری شـارەزا لـەو بـوارە. بـۆ نموونـه، کۆمپانیاکـه لـه ئەفغانستان توانی سەنتەری ئۆماها بۆ دیراساتی ئەفغانی سەر بـه زانکـۆی نیبراسـکا (UNO) لـه زیادکردنێـك دووربخاتـەوە، کـه ئـەو سـەنتەره بـه هاوکـاری USAID بـۆ مـاوەی زیـاتر لـه ١٠ سـاڵ کـاری لەسـەر چاکسازی پەروەردەو فێرکردن لە ئەفغانستاندا کردووە. سەنتەرەکە لە میانەی ئەو دە ساڵەی کارکردنیدا لە ئەفغانستان، تەنیا لە ساڵەکانی خوێندنی ٢٠٠٢-٢٠٠٣دا، توانی ١٤,٢ملیۆن کتێبی خوێندن لـه چاپ بدات، هـەروەها کردنـەوەی خولی راهێنانی جیاواز بۆ نزیکەی ٢٧٤٠ مامۆستا.

لـه لێدوانێکیـدا بـۆ سـەنتەری Public Integrity، "رەحـیم یاسـر" یاریدەدەری بەڕێوەبەری سەنتەرەکە رایگەیاند، بەلایەوە سـەیر بـووە کاتێـك "Creative" گرێبەسـتی سـاڵی خوێنـدنی ٢٠٠٣-٢٠٠٤ بەدەسـت هێنـاوە: "زانکۆکەمان لەسەرەتای حەفتاکانی سەدەی رابـردووەوە سـەرقاڵی کارکردنـه لـه ئەفغانـستان، تەنانـەت لـه کـاتی شەڕیـشدا نووسـینگەی هـەبووەو بەردەوامیش بووە لە جێبەجێکردنی پرۆگرامەکانی. بەڵام پێم وایە لە ساڵی رابردوو USAID حەزی کردووە دەزگـاو دامـەزراوەی تـر بـەکاربێنێت، بـه بێ رەچاوکردنی ئەوەی ئاخۆ ئەو دەزگایە ئەزموونی لەو جۆرە کارەدا هەیـه یان نا."

دوای ئەوەی "Creative" گرێبەستیەکەی مسۆگەر کرد، ئیتر یارمەتی دانو بەهێزکردنی ئابووری ئەفغانستانی بـەلاوە گـرنگ نـەبوو. بۆیـه لـەبری چـاپکردنی کتێبـەکان لـه نـاو ئەفغانـستان، گرێبەسـتیەکی لاوەکـی لەگـەڵ کۆمپانیایەکی ئەندەنوسی مۆرکرد بۆ چاپکردنو گەیانـدنی کتێبـەکان لـەرێی فرۆکەوە.

## بەداخەوە، منداڵەکەت مردووە

بارودۆخی کەرتی تەندروستی زۆر باشتر نەبوو، سەرەڕای خەرجکردنی ملیۆنەها دۆلار لە بەڵێندەرە تایبەتیەکان بۆ ڕێکخستنەوەو نۆژەنکردنەوەی نەخۆشخانە گشتیەکان. لە نەخۆشخانەی یەرموك لە بەغدا، سەردانی بەشی لەدایکبوونی منداڵانم کرد کە تەنیا چوار منداڵی تازە لەدایك بووی لاوازو لەهۆشچوو لە نێو ئامرازە پلاستیکیەکانی کە تایبەتن بۆ هەناسەدان لە پاڵ دیوارێکی پلاستیکی هۆڵە نیمچە تاریکەکە دانرابوون. هەندێك لەو ئامێرانە لەلایەن میرنشینی یەکگرتووی ئیماراتی عەربیەوە بەخشرابوون‌و هەندێکی تریش لەلایەن ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە، ژمارەیەکیشیان لە ڕێڕەوی نەخۆشخانەکە لە دەرەوە خرابوونە پاڵ یەکتری. ئامێرەکان هەموویان کاریان دەکرد، بەلاَم شوێن نەبوو لێی دابنرێن، ئەوە جگە لە کەمی یان نەبوونی کارەبا و ئاوی پاك لە نەخۆشخانەکە، کە گرنگن بۆ بەکار خستنیان.

دکتۆرە "تالا ئەلئەوقاتی" بە هێمنی و لەسەرخۆیەوە و بە شێوازێکی واقیعیانە باسی لە کۆمەڵێك ئامار دەکرد. بە هەمان شێوە دەیەها جار ئامار و زانیاری داوەتە ڕۆژنامەنووس‌و چالاکوانان‌و هەروەها ئەندامانی کۆنگرێسیش، کەچی هیچ یارمەتی‌و هاوکاریەك نەگەیشت. کە دەیگوت:"ساڵی رابردوو، لە نێو هەشتا منداڵ بیستیان گیانیان لە دەست دا، کەچی ئێستا لە نێو پەنجا منداڵ بیست منداڵ گیان لە دەست دەدەن. بۆیە بارودۆخەکە بە بەراورد لەگەڵ پێش شەڕ لە هەموو لایەکەوە بەرەو خراپی دەڕوات." ناوبراو ماوەی چوار ساڵە ئەو بەشەی نەخۆشخانەکە بەڕێوە دەبات‌و ماوەی حەڤدە ساڵیشە دکتۆرە.

سەردانەکەشم بە دوو وتار پاڵپشتی کرا کە لە سەرەتای ٢٠٠٤

بلاّوکرابوونەوە- یەکیان لە رۆژنامەی "ئیندیپێندت"ی بەریتانیو ئەوی تریشیان لە "نیویۆرك تایمز"- هەردوو وتارەکەش باسیان لە هەلومەرجی ئەو نەخۆشخانەیەو نەخۆشخانەی ئەلئیسکان دەکرد، بەوەی کە داگیرکردنەکە بە شێوەیەکی سەرنج راکێشانە بارودۆخی تەندروستی خراپ کردووە. ١١٢

دواتریش دەرکەوت، بارودۆخەکە بەو خراپیە نەبوو وەك چۆن رۆژنامەنووسەکان باسیان لێوە دەکرد. بەڵێ، راستە لەو بەشەی نەخۆشخانەکە حاڵەتی مردنو گیان لەدەستدانی منداڵان هەبووە، بەلاّم تەنیا لەبەرئەوەی نیوەی بەشەکانی نەخۆشخانەکە داخرابوون بۆ کارەکانی نۆژەنکردنەوە. بۆیە کارمەندەکان بەو هیوایەن دوای تەواو بوونی کارەکانی نۆژەن کردنەوەو کرانەوەی بەشە داخراوەکانیش، رەوشەکە بەرەو باشی بچێت.

دایكو باوکە جەرگ سوتاوەکانیش بێچارە دەبوایە تەنیا سەیری مەرگی منداڵە تازە لەدایك بووەکانیان بکەن، چونکە وەزارەتی تەندروستی نەیدەزانی چۆن لە یەك کاتدا کارەکانی نۆژەنکردنەوە ئەنجام بداتو خزمەتگوزاریەکانیش دابین بکات.

لە پرسیارێکیشمدا بۆ دکتۆرە تالا: پێت وایە دوای تەواوبوونی کارەکانی نۆژەنکردنەوەی نەخۆشخانەکە، هەلومەرجی کارەکان باشتر دەبنەوە؟ لە وەلاّمدا ناوبراو گوتی: "ئێمە تا ئێستا کەلوپەلی پێویستو پارچەی یەدەگی ئامێرە پلاستیکیەکانی هەناسەدانمان نیە. هەروەها خوولی راهێنانی گونجاویش ئەنجام نەدراوەو بڕی دەرمانی پێویستیشمان نیە."

هەر لە میانەی قسەکانماندا، ناوبراو ئاماژەی بە کێشەیەکی تر کرد کە تۆمار نەکرابوو، ئەویش دابەزینی رێژەی داهاتی نەخۆشخانەکەیە لە وەرگرتنی رسومات، بەوەی ژمارەیەکی زۆری ژن لە ماڵەوە منداڵیان دەبێتو

نایەنــە نەخۆشــخانە لەبــەر نالــەباری ئاســایش‌و قــەرەباڵغی ڕێگاکــان، کــە مەترسـی دەخاتـە سـەر ژیانیـان. هـەروەها ڕێـژەی لەبارچـوونی لـەخۆوەش زیادی کردووە، چونکە ژنـەکان بەرلـەوەی بگەنـە نەخۆشخانە منداڵـەکانیان لەباردەچێت.

دکتۆر "هـادی ئـەلرزووقی" بەڕێوەبـەری گشتی تـازەی نەخۆشـخانەکە، گەشـبینتر بـوو. کـە بـە حەماسـەتێکەوە دەیگـوت: "ئێمـە مـاوەی ٣٠ سـاڵە پێشوازی لە نەخۆش‌و بریندارەدەکەین، بـە چـوار جەنگیـشدا تێپـەڕیوین. لـە شەڕی یەکەمی کەنداودا، ئەمەریکیەکان بۆمبـارانی نەخۆشـخانەکەیان کـردو سـاڵی پـاریش لـە شـەڕی دووەمـدا بـۆ مـاوەی دوو مـانگ بـە تانـك ئێرەیـان داگیرکردبوو بۆیە وەکو مەیدانی شەڕی لێ هاتبوو. بەلاَم بە بـەراورد لەگـەڵ پارساڵ ئێستا ڕەوشەکە زۆر باشترە. لێم پرسی چەند دەبێت کە لێـرە دەست بەکار بوویت؟ بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی دوو هەفتەیـە: "کارمەنـدەکانمان بـە باشـی کارەکانیـان ئـەنجام دەدەن، بـەلاَم فـشارەکە زۆرە، چـونکە ئێمـە خزمەتگوزاری بۆ نیوەی خەڵکی شاری بەغدا پێشکەش دەکـەین. بۆیـە دەبـێ پشوودرێژبین، بەوەی شتەکان لەگەڵ بەسەرچوونی کات بەرە بـەرە ڕێـچکەی خۆیان دەگرن." ١١٣

ئەستەمە ئەو منداڵانەی کە بـەر لـە وادەی خۆیـان لـە دایك دەبـن، لـەو چاوەڕوانیە ڕزگاریان بێت. لـە کۆتاییـەکانی٢٠٠٣، لـە نەخۆشـخانەی ناوەنـدی فێرکاری ئیسکان بۆ منداڵان ( لەو شوێنە ئامێرە پلاستیکیەکانی هەناسـەدان زۆر بوون و شوێنی فراوانیش هەبوو، کەچی ڕێژەی مردنی منـداڵان هـەر لـە بەرزبوونەوە دابوو)، دکتـۆر "حـافیز حسین"ـم بینـی خـەریکی ئیمزاکـردن بوو لەسەر بڕوانامەی مردنی منداڵێك، کە لە ئامێزی ئـەودا گیـانی لەدەست دابـوو، کاتێـك خـزم‌و کەسـی منداڵەکـە زانیـان مـردووە، ڕژانـە ژوورەکـەو بەرۆکی دکتۆرەکەیان گرت‌و کەوتنە مشت گرتن لە دەم‌و چاوی بۆ زیـاتر لـە

بیست جار. که دەڵێت:"هەست کردن بە شەرم دایگرتم، چونکە منداڵەکە گیانی لە دەست داو منیش لە بەردەم هاوکارەکانم لێدان‌و کوتانم خوارد" ١١٤

لە حوزەیرانی ٢٠٠٣، "ئەندریۆ ناتسیۆس" سەرۆکی USAID پلانێکی دارێشت بە ئامانجی کەمکردنەوەی رێژەی گیان لەدەست دانی منداڵە تازە لەدایك بووەکان لە عێراق بۆ ٥٠٪ ١١٥. بەڵام دوای نزیکەی دە مانگ، "عمار الصفار" جێگری وەزیری تەندروستی، پێی راگەیاندم کەوا ئامارەکان هیچ گۆڕانکاریەکیان بە سەردا نەهاتووە – بگرە لەماوەی داگیرکردنیشەوە هەر وەکو خۆیان ماونەتەوە. ١١٦

## ئایا ABT شیاوە بۆ نۆژەنکردنەوەی نەخۆشخانەکانی عێراق؟

"بۆب گوودویون" راوێژکاری دەسەڵاتی کاتەکی هاوپەیمانەکان بۆ کاروباری تەندروستی کە لەوەتەی هاوینی٢٠٠٣ـەوە لەگەڵ وەزارەتی تەندروستی عێراقیدا کاری دەکرد، بە"نیویۆرك تایمز"ـی گوت: "من بە هەموو وڵاتەکەدا گەڕاوم، بۆیە پێم وایە ئاستی تەندروستی ئێستا باشترە بە بەراورد لەگەڵ پێش جەنگ. گەلێ لە نەخۆشخانەکان مۆلیدەی کارەباو سیستەمی کێبڵ‌و وایەری کارەبای تازەیان بۆ دانراوەو لە دابەشکردنی داوو دەرمانیش دادپەروەریەکی زۆرتر هەیە لەوەی کە لەسەردەمی رژێمی سەدامدا هەبوو. کاتێکیش لە نیسانی ٢٠٠٣ هاتینە عێراق، بە سەر سیستەمێکی تەندروستی داڕماودا هاتین، چونکە بینای وەزارەتی تەندروستی بە تەواوەتی سوتێنرابوو." ١١٧

ساڵێك دواتر، بینای وەزارەتەکە لە بەغدا چاك کرایەوە- بەوەی گشت نهۆمەکان دووبارە بۆیاغکرانەوەو هەموو بەشەکانیش مێزی نووسینگەو دۆڵابی چاکیان بۆ دابین کرا، ئەوە لە کاتێکدا نەخۆشخانەکان لە چاوەڕێی خێرخوازو خۆبەخشەکاندابوون بۆ چاککردنەوەیان. بەکتل هەندێك کاری

نۆژەنکردنەوەی لاوەکی بۆ نزیکەی پەنجا بنکەی تەندروستی لەسەرتاسەری عێراق ئەنجام دا، بەلام بنکەو نەخۆشخانەکانی تریشی بۆ USAID جێهێشت.

USAIDیش لەلای خۆیەوە ماوەی سالێکی پێویست بوو تەنیا بۆ ئەوەی بزانێت کێ کردارەکانی چاککردنەوەی بنکە تەندروستیەکان و نەخۆشخانەکان ئەنجام دەدات. لە ئاداری ٢٠٠٤، گرێبەستیەکی بچووك بە بڕی ٢٧,٧ ملیۆن دۆلار درا بە هەردوو کۆمپانیای (URS) لە سان فرانسیسکۆو (گرووپی لویس بێرگەر) لە نیو جێرسی. بەشێکی کۆمپانیاکەی یەکەم، "ریتشارد بلۆم"ی هاوسەری "دیانا فێنستین" سیناتۆر لە کۆنگرێس خاوەنی بوو. لەگەڵ ئەوەشی کە"فێنستین" لە سەرکردە دیموکراتەکان بوو لە "کاپیتۆل هیل"، کەچی URS بڕی ١٠٧٠٠ دۆلاری بەخشیە هەلمەتەکانی هەلبژاردنی جۆرج بۆش. ١١٨

دوای مانگێك، لە کاتی سەردانی کردنێکمدا بۆ وەزارەتی تەندروستی، پرسیارم دەربارەی چۆنیەتی بەڕێوەچوونی کارەکانی نۆژەنکردنەوەی کەوا URS ئەنجامیان دەدات کرد. لە وەلامدا زانیم کۆمپانیاکە بە نیازە لە سالی ٢٠٠٥ دەست بەکارەکانی بکات.

لەلایەکی تریشەوە، لە ٣٠ ئاداری ٢٠٠٣، USAID بەجیا دوو گرێبەستی لەگەڵ Abt مۆر کرد (کە دەزگایەکی راوێژکاری کاروباری تەندروستیەو بنکە سەرەکیەکەشی لە شاری بۆستنی ئەمریکایە). بە مەبەستی گێڕانەوەی خێرای خزمەتگوزاری تەندروستی لە عێراق بۆ باری ئاسایی خۆی لە چوارچێوەی بەهێزکردن و پتەوکردنی تەواوی سیستەمی تەندروستی. کە یەکێکیان بەهاکەی ١٠ ملیۆن دۆلار و ئەوەکەی تریش ٤٣,٨ ملیۆن دۆلار بوو. لە ئاداری ٢٠٠٤، داوام کرد چاوپێکەوتن لەگەڵ ستافی Abt لە عێراقدا بکەم، بەلام داواکەم لەلایەن "کێس کۆلینز" فەرمانبەری پەیوەندیەکانی کۆمپانیاکە رەتکرایەوە. کاتێکیش رەزامەندی لەسەر

چاوپێکەوتنەکە درا، هیچ یەکێك لە کارمەندەکانی کۆمپانیاکە لە عێراق نەمابوون. چونکە دوای ئەوەی لە نیسانی ٢٠٠٤دا کردە سەربازیەکان لە فەللوجەو کەربەلاو نەجەف رێچکەیەکی توندیان گرتەبەرو رفاندنو بارمتەگرتن بە شێوەیەکی بەربلاّو تەشەنەیان کرد، ستافە نێودەوڵەتیەکەی Abt عێراقیان جێهێشت.

ئەوەی جێگای سەرسورمانیش بوو، لە کۆی سیو پێنج کاربەدەستی سیستەمی تەندروستی، کە چواریان بەڕێوەبەری چوار نەخۆشخانە بوون لە بەغدا، تەنیا سێ کەس دەیزانی Abt چیە!!!کە یەکەمیان، جێگری وەزیری تەندروستی بوو، بەلاّم پێی وابوو Abt رێکخراوێکی ناسودمەندی خێرخوازیە. (کەچی لە راستیدا، Abt یەکێکە لە گەورەترین کۆمپانیای راوێژکاری تەندروستی سوودمەند، وەکو چۆن لە وێب سایتی کۆمپانیاکە ناسێنراوە) ١١٩. دووەمیشیان سەرۆکی کۆمپانیایێکی داوو دەرمانی عێراقی بوو باسی خولێکی راهێنانی دەکرد کە خۆی بەشداری تیا کردبوو، لەلایەن Abtـەوە ئەنجام درابوو. سێیەم کەسیش: بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی منداڵو لەدایکبوونی بەسرە بوو، ئاماژەی بەو چاوپێکەوتنە دەدا کە لەلایەن کۆمپانیای ناوبراو لەگەڵیدا کرابوو سەبارەت بە پێداویستی نەخۆشخانەکەی، بەلاّم دواتر کۆمپانیاکە نەیتوانی بگەڕێتەوە بۆئەوەی پێداویستیەکان دابین بکات. ١٢٠

لە وێب سایتی کۆمپانیاکەشدا هاتووە، حەوت نووسینگەیان لە عێراقدا هەیەو لە چوار بواری سەرەکیش ئیش دەکەن: بەهێزکردنی وەزارەتی تەندروستی، مەشقپێکردنی کارمەندانی بواری تەندروستی، هێنانی کەلوپەلی پێویست بۆ نۆرینگە گشتیەکانو بنکە تەندروستیەکان، هەروەها دابینکردنی یارمەتی دارایی بۆ تاكو رێکخراوە عێراقیەکانیش لە پرۆژەی بچووك، وەك یەکێتی پەرستارانی عێراقی INA. کە کۆمپانیای ناوبراو بڕی ١٣٧٠٠٠دۆلاری داوە INA بە مەبەستی ئەنجامدانی کۆنفرانسێکی دوو

ڕۆژیو کڕینی کۆستەمو چەرچەفی سیسەمو دەستە جلی پەرستاری بۆ نەخۆشخانەی یەرموك. ١٢١

هەروەها کۆمپانیاکە دەڵێت، کارمەندانی نەخۆشخانەکانی بەسرەو ژمارەیەك نەخۆشخانەش لە بەغدا ڕێنوێنی دەکات بۆ بەهێزکردنیان لە بواری چاودێریکردنو بەهانا هاتنی خێرای پەتاو نەخۆشیە گوێزراوەکان. سیستەمەکەش بە جۆرێك داڕێژراوە، کە ڕاپۆرتی تەواو دەربارەی دەستنیشانکردنی نەخۆشیە گوێزراوەکە دەدات، کە زانیاری ڕاستو دروست لەسەر کاتو شوێنی نەخۆشیەکەو هەر زانیاریەکی تری بەدەست هاتووش لەخۆ دەگرێت. سەرەتا لە ڕێی تەلەفونەوە ڕاپۆرتێکی دەسبەجێ لەسەر نەخۆشیەکە دەدرێتو لە هەمان کاتیشدا دەخرێتە سیستەمێکی تۆمارکردنی داتا لە چوارچێوەی تۆڕێکی زانیاریدا.

بەلای زۆر لەو کارمەندە تەندروستیانەی کەوا لە بارودۆخێکی دژوار دانەبوون، پرۆژەکە شتێکی سەمەرە بوو. چونکە هیچ نەخۆشخانەیەك سیستەمی پەیوەندی نێوخۆیی تێدا نەبوو. ژمارەیەکی کەمی نەخۆشخانەکانیش تەلەفونیان هەبوو، وەکو بەشێك لە پەیوەندیەکانی MCI بەسەر بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکاندا دابەش کرابوو، کە توانای پەیوەندیکردنی بە تەلەفونی نۆرماڵەوە نەبوو. جگە لە ژمارەیەکی کەمی دکتۆرەکان نەبێت کە مۆبایلی"عراقنا"ـیان پێ بوو، تێچوونی پەیوەندیەکانیش دەکەوتە ئەستۆی خۆیان، چونکە خاوەن داهاتێکی باشتر بوون، بەوەی دوای نیوەڕۆیان لە نۆرینگە تایبەتیەکان کاریان دەکرد. دکتۆرە"تالا ئەلئەوقاتی" ڕوونی کردەوە، کەوا خێراترینو تەنیا ڕێگەش کە دکتۆرەکان پەیڕەویان لێدەکرد بۆ پەیوەندیکردن بە یەکتریەوە، بریتی بوو لە چوون یان ڕاکردن لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تری نەخۆشخانەکە.

لە ڕێی کەمێك گەڕان بە نێو ئەنتەرنێتدا، دەتوانرێ بابەتگەلێکی سەرنج ڕاکێشی پەیوەستدار بەو مەسەلەیە بدۆزرێتەوە: جێگری سەرۆکی

Abt بـۆ پەرەپێـدانی نێودەوڵـەتی "جانێـت بـالآنتین" کـە بەرپرسـی پرۆژەکانی عێـراقیش بـوو، لەوەتـەی سـاڵی ۲۰۰۲ـەوە لـە Abt دەسـت بـەکار بووە و پێشوتریش وەکو راوێژکارو یاریدەدەری کارگێری لە USAID کاری کردووە - هەر بۆیەش هەبوونی پەیوەندی لە نێوان هەردوو دەزگاکە نابێتـە مایەی سەرسوڕمان. لە کۆتاییدا، Creative Associates هەمان شێوەی پەیوەنـدی لەگـەڵ USAID هـەبووە. لـە سـاڵی ۱۹۹٦ تـا ۱۹۹۹ "بـالآنتین" بەرپرسـی کارەکانی USAID بـووە لـە روسـیاو پێشتریش لـە ۱۹۹۰ تـا ۱۹۹٤ هـەمان پۆسـتی هـەبووە لـە نیکـاراگوا. بەرلـەوەش پرۆفیـسۆری بـواری توێژینـەوەکانی سیاسـەتە سـتراتیژیەکانی نیـشتمانی بـووە لـە کۆلێـژی "National War"دا. ۱۲۲

وەکـو چـۆن لـە وێـب سایتی کۆمپانیاکـەدا هـاتووە، لـە ۲۰ نیـسانی ۲۰۰٤، نـاوبراو لـە چوارچـێوەی پۆسـتە تازەکەیـداو بەمەبەسـتی وتنـەوەی موحازەرەیەك بۆ شارەزاو کاربەدەستانی بواری تەندروستی کە لە سیو یەك ولآتـەوە هـاتبوون چـۆتە زیـورخ لـە سویـسرا. لـە بەشـێکی موحازەرەکەیـدا دەڵێت: "بەبێ رەچاوکردنی پێشینەی سیاسیتان، دوای کۆتایی هاتنی جەنگ، پێویـستیەکی زۆری خزمـەتگوزاری تەندروسـتی هـەبووە لـە عێـراق، هـەر بۆیەش لەگەڵ سەرەتای دەسپێکردنی کارەکانی ئاوەدانکردنەوە، دەزگای Abt خۆی گەیاندۆتـە ئـەوێو توانیومانـە مۆدێلێـك بـۆ چـۆنیەتی مامەڵـە کـردن لەگـەڵ هەلومەرجـەکانی دوای کۆتـایی هـاتنی ململانێیـەکان بهێنینـە دی، هـەروەها توانیومانـە دووبـارە سیـستەمی خزمەتگوزاریـە تەندروسـتیەکان ببوژێنینەوەو ئێستاش لە کارکردن دایە." هاوکات لەگـەڵ وتنـەوەی نـاوبراو بۆ موحازەرەکەی، زۆربەی کارمەندە نێودەوڵەتیەکانی Abt لە بەر نالەباری بارودۆخی ئاسایش، ماوەی چەند مانگێك بوو عێراقیان جێهێشتبوو.

## دەست لە کار هەڵگرتنی ڕێکخراوە ناحکومیەکان

مـن لێـرە نامـەوێ بڵـێم سیـستەمی خزمـەتگوزاری تەندروسـتی هـیچ گۆڕانکاریەکی بەخۆیەوە نەبینیوە. هەندێك دەڵێن بارودۆخەکە بـەرە بـەرە روو لەخراپیـە، لـە کاتێکـدا زۆربـەی خـەڵکی پێیـان وایـە تـا راددەیـەك بارودۆخەکە باشتر بووە. هیچ جۆرە کۆتو بەنـدێك نـەماوە لەسـەر هێنـانی داوو ودەرمـانو کردارەکـانی نۆژەنکردنـەوەش بـەردەوامن. سـەرەڕای ئـەوەی کۆمپانیـا ئـەمریکیـەکان زۆربـەی کارەکـانی ئاوەدانکردنـەوەیان تـەواو نـەکردووە، بـەڵام لایەنـە بەخـشەرە نێودەوڵەتیـەکانی وەك یابـانو کۆریـاو ئیسپانیا ئەو ئەرکەیان گرتۆتە ئەستۆی خۆیان.

یەکێك لە کارە هەرە وورە ڕووخێنەرەکان، کەمکردنەوەی ئەو ڕێکخراوە نێودەوڵەتیانـەی کـە مـاوەی دە ساڵ بـوو لـە عێـراق کاریـان دەکـرد بـۆ کـارو چالاکیەکانیان. بەشێك لە هۆکارەکانیش دەگەڕایەوە بۆ بێ ئۆمێدبوونیان لـە وەزارەتە تازە پێك هاتووەکە، هۆکاری تریش پەیوەست بـوون بـە تێکچوونی بـاری ئـەمنی. سـەبارەت بـە هۆکـاری یەکـەم، وەزارەتـی تەندروسـتی تـەنیا لەلایەن یەك حیزبـی سیاسیەوە کۆنترۆڵ کرابـوو، ئـەویش حیزبـی دەعـوەی ئیـسلامی بـوو، کـە لـە هـەمان کاتـدا دوژمنێکـی سەرسـەختی شـیوعیەکانو دۆسـتێکی نزیکـی ئێـرانیش بـوو. لـە سـاڵی ١٩٨٢، ئەنـدامانی ئـەو حیزبـە لـە هـەوڵێکی بـێ ئاکامیـان بـۆ رووخانـدنی رژێمـی سـەدام حوسـێن بینـای وەزارەتەکەیان تەقاندەوە. "عەمار ئەلسەفار" جێگری وەزیـری تەندروسـتی پێی راگەیاندم کەوا ئەو گەڕاوەتەوە عێراق بۆ ئـەوەی شـوێنی خـۆی لـە نێـو سیاسـەتمەدارە هەڵبـژێردراوەکان بکاتـەوەو بۆیـەش رازی بـووە ئـەو پۆسـتە وەربگرێت، چونکە بواری شارەزاییو کارکردنی خۆیەتی، کە دەڵێت: " نازانم چـۆن کەوتومەتـە نێـو ئـەو گێژەڵۆکـە، دەبـێ بـەرگری بکـەم چـونکە

بارودۆخەکە توندو دژوارە." ١٢٣

دواتـر، چـاوم بـە "یـەعروب ئەلـشیرەیدا" کـەوت، ڕێکخـەری پـرۆژە نێودەوڵەتیەکانی LIFE کە دامەزاوەیـەکی عێراقی- ئـەمریکیو کەنەدیـەو زیاتر لە دە ساڵە لـە عێـراق کـاری دەکـرد. ڕێکخـراوی نـاوبراو بـەڵێنی ١٥٠٠٠ دۆلاری پێـدرابوو لەلایـەن پـەیمانگای سێگۆشـەی نێودەوڵـەتی بـۆ توێژینـەوە RTI (بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە پەیمانگاکە سەیری بەشی چوارەم بکە) بەمەبەسـتی بەسـتنی کۆنگرەیـەك بـۆ دکتۆرەکـانی پارێزگـای بەسـرە بـۆ وتوێـژکردن دەربـارەی کێـشەکانی کـەرتی تەندروسـتی. کەچـی چـەند هەفتەیـەکیش دوای تـەواوبوونی کۆنگرەکـە، هـەر نـەتوانرا پـارە تـەرخان کراوەکـە دەسـەبەر بکرێـت. بۆیـە LIFE چـالاکیەکانی سـست کـردەوە لەبەرکـەم بوونـەوەی پـارەو خراپبـوونی بـارودۆخی ئـەمنیو ئـاژاوەی نێـو وەزارەتی تەندروستیش. ١٢٤

دواتـریش چـاوم بـە "حەسـەن راوی" کـەوت، ئەنـدازیارو بەڕێوەبـەری بوژاندنـەوە لـە فیدراسـیۆنی نێودەوڵـەتی مـانگی سـوورو خاچـی سـوور (IFRC). بـە درێـژایی چـەند سـاڵی رابـردوو، IFRC چلو شـەش بنکـەی تەندروستی دروست کـردووە، بـەڵام ئێـستا کارەکـانی کـەم کردۆتـەوەو تـەنیا ئیش لەسەر یەك بنکەی تەندروستی دەکات. کارمەنـدی راهێنـراو و شـارەزا دانـسقەنو دڵـەڕاوکێی بـارودۆخی ئـەمنیش کارمەنـدە نێودەوڵەتیـەکانی ڕێکخراوەکـەی ناچـارکردووە عێـراق جێبهـێڵن، هـەروەها لەبـەرنارێکی وەزارەتەکـەش، کارمەنـدە عێراقیـەکان کارەکانیـان لەگـەڵ وەزارەتـی تەندروستی راگرتـووە. نـاوبراو دەیگوت: "لـە مانگـەکانی ئـەیلولو تـشرینی یەکەمدا، ئامادەی چەند کۆبوونەوەیەك بووم لەگەڵیاندا، بـەڵام شـتەکان زۆر گۆڕانو ئێمەش دەستمان لێیان بەردا. بۆیە لـەبری ئـەوە، راستەوخۆ لەگـەڵ بنکـە تەندروسـتیە سـەرەکیەکان کارمـان دەکـرد." کـاتێکیش Abt هـات بـۆ

ئـەوەی لەسـەر کـەرتی تەندروسـتی کاربکـات، ئەمریکیـەکان تەنانـەت تەلەفونێکیـشیان بـۆ IFRC نـەکرد. راوی پێـی وابـوو گـەر دەرفـەتی پـێ بدرایـە ئـەوا زانیـاریو ئـەزموونی باشـی لەگەڵـدا دەگۆڕینـەوە، بەرچـاو ڕوونیشی دەکردن لەو هەڵانەی کە پێشتر تێی کەوتوون وەك: واقیعی ئەوەی جۆری دەرمـانی پێویـست بـۆ بەسـرە جیـاوازە لـەوەی لـە بـاکوور پێویـستە، هـەروەها لـەو کێـشەو گرفتانـەی کـە لـە ئـەنجامی بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـیو پەتا، بە هۆی ڕوودانی لافـاو کـە زۆر لـە باڵاخانـەو خانوەکانی دەگرتـەوە،... هتد. ۱۲۵

لـەوەش زیـاتر، دکتـۆر"قـورەیش ئەلقەیـسەر" سـەرۆکی یەکێـتی نەشـتەرگەرانی عێراقـی باسـی لـەوە دەکـرد کـەوا کێـشە و گرفتێکـی زۆر لـە بواری تەندروستیدا هەیـە، لـەوەش ناچێت بارودۆخەکە ڕوولـە باشـی بێـت: "گەر بتەوێ نەشـتەرگەری ئـەنجام بـدەیت، ئـەوا پێویـستیت بـە شـتی زیـاتر دەبێت لـە تـەنیا پزیـشکی نەشـتەرگەر، وەك دەرمـانی تـەواو بـۆ نەخۆشـەکە دوای نەشـــتەرگەریەکەو یەکەیـــەکی ژیانـــەوەی ئامادەباشـــیش بـــۆ چـاودێریکردنی نەخۆشـەکە. گرفتـی سـەرەکیش ئەوەیـە، جـۆرج بـۆش نـە دەرمـانی ڕاستـی پێیـەو نـە یەکەیـەکی ژیانـەوەی ئامادەکراویشی هەیـە بـۆ عێراق." ۱۲٦

## ئیمپراتۆریەتی بانکەکان

لـەو کاتـەی عێـراق لـە بـەهاری ۲۰۰٤ دەخزایـە نـاو ئـاژاوەو ململانێـی ناوخۆ، تەنیا ئەو بەڵێندەرە بیانیانە مانەوە کەوا پارەی کۆنتراکتـەکانیان لـە سوپای ئەمەریکیـەوە وەردەگـرت (وەك هـالیبێرتۆن) یـان لـە USAIDـەوە (وەك بەکتل). ئەویش لە پەرۆشیان بۆ یارمەتیدانی ئـەو بەڵێنـدەرە بیـانیو ناوخۆییانەشـی کـە ڕاسـتەوخۆ لەلایـەن باجدەرەکانـەوە یارمـەتی دارایـیـان

دەسـەبەر نـەدەکرد، بۆیـە حکومـەتی ئـەمریکی چـەند رێو شـوێنێکی بـۆ وەزارەتە عێراقیەکان رێك خست بۆئەوەی چەند ملیار دۆلارێك بە قەرز وەربگـرن بـۆ کرینـی شـتومەكو پێداویـستی لـە بەڵێنـدەرو کۆمپانیـا جیهانیەکان، ئەویش لە رێگەی رەهن دانانی داهاتەکانی نەوت لە رێی بانکی بازرگانی عێراقیەوە (TBI).

"حسێن ئـەلعوزری" سـەرۆکی بـانکی بازرگـانی عێراقـی لـە کـانوونی دووەمـی ٢٠٠٤ لـە شـاری کوێتـەوە رایگەیانـد، کـەوا بانکەکـەی بـڕی ٢,٤ ملیـار دۆلاری لە گـەرەنتی هـەناردەکان زیاد کـردووە، بـۆ گۆڕینـەوەی بازرگـانی لـە نێوان عێراقو ولاّتانی تری جیهانو کۆمپانیـا نێودەوڵەتیـەکانیش، هـەروەها بایی ٣٠٠ ملیۆن دۆلار چەکی بیمەی (رصيد ائتمان) دەرکردووە. ١٢٧

پێکهێنانی بانکەکـەش بەشـێکی بـۆ ئـەوەبوو تـاکو جێـی ئـەو گـەرەنتیـە بازرگانیە بگرێتـەوە کـە لەلایـەن نەتـەوە یەکگرتووەکانـەوە لـە چوارچێوەی بەرنامەی نەوت بەرانبەر خۆراك دامـەزرێنرابوو، کـە لـە سـاڵی ١٩٩٥ بەسـەر عێراقـدا سـەپێنرا لـە میانـەی سـزا ئابووریـەکانی سـەر رژێمـی سـەدام. بەرنامەکە چەند میکانیزمێکی دەگرتە خۆی، لە رێیانەوە دەتوانرا کۆنترۆڵی ئەو کەرەستە و پێداویستیە مرۆییانە بکرێت کە عێراق لە بەرانبەر نەوتدا دەیکـڕین، بـۆ ئـەوەی رێگـری بکرێـت لـە کڕینـی ئـەو شـتومەکانەی ئەگـەری بەکارهێنانیان هەبوو لـە دروست کردنـی چـەكو مەبەسـتی سـەربازی. کۆی گشتی داهاتی بەرنامەی نەوت بەرانبەر خۆراکیش، لە ناردنە دەرەوەی نەوت گەیشتە ٤٦ ملیار دۆلار. لە تشرینی دووەمی ٢٠٠٣ ئەو بەرنامەیە کۆتـایی پـێ هێنرا.

بە پێچەوانەی بەرنامـەی نـەوت بەرانبـەر خـۆراك، گـەرەنتی بازرگـانی سـەر بـە بـانکی بازرگـانی عێراقـی لەلایـەن دەزگاکـانی سـەر بـە نەتـەوە یەکگرتووەکانـەوە بـەڕێوە نـەدەبردرا، بـەڵکو لەلایـەن کـەرتی تایبـەتو

هاوپشتیوانەکانی لە چەند وڵاتێکی جیاوازی جیهاندا. گەرەنتی هەناردنەکان بۆ مسۆگەرکردنی پاڵپشتی دارایی بوو بۆ کرینی ماددەی خاو، داوو دەرمان، خۆراك، پەینی کیمیاییو کەلوپەلی تری پێویستو گرنگ. بە هەمان شێوەی گرێبەستەکانی نۆژەنکردنەوەی ژێرخانی، ئەو کۆمپانیا ئەمریکیانەی پەسەند دەکرد کە پەیوەندیان بە سیاسەتمەدارەکانەوە هەبوو. دیسانەوە لە گەرەنتی بازرگانی بانکی ناوبراویش، هەر کۆمپانیا ئەمریکیەکان بە باشتر دەزانران، تەنانەت گەر نرخی بەرهەمەکانیشیان هەرزانتر نەبوایەو جۆرەکانیشیان باشتر نەبوایە.

بۆ نموونە، ئەو حاڵەتەی دەزگای بیمەی هەناردەی ئەمریکی، کە پێشتر پەیماننامەیەکی لەگەڵ بانکی بازرگانی عێراقی TBI مۆر کردبوو. کاتێك کە"دەیڤد تشاڤێرن" گەورە کارمەندی ExIm، بۆ پێشکەشکردنی وتەیەك ئامادەی دانیشتنێکی کورت بوو لەگەڵ (پشکی نێودەوڵەتی بۆ تواناکانی وەبەرهێنەران لە عێراقدا Equity International for Potential investors)، لە وتەکەیدا گوتی: "ئەو داهاتەی کە لە فرۆشتنی نەوتی عێراقیەوە دەسەبەر دەکرێت، بۆ پاڵپشتی کردنی گەرەنتیە بازرگانیەکانی بانکی بازرگانی عێراقی بەکار دەهێنرێت. هەروەها ئەو گەرەنتیە بازرگانیانە بۆ هەناردەکارە ئەمریکیەکانیش مسۆگەر دەکەین." ١٢٨

لە کۆی ٢,٤ ملیار دۆلار کە لە بانکی بازرگانی عێراقی دانرابوو بۆ گەرەنتی هەناردەکان، ExIm پێنج سەد ملیۆن دۆلاری لەسەر شێوەی چەکی گەرەنتی پەسەند کرد. ئەو پارەیەی ExIm، بۆ ئەوەبوو کە وەبەرهێنەرو کۆمپانیا ئەمریکیەکان دڵنیا بکاتەوە بەوەی هیچ مەترسیەکیان لەسەر نیە. بۆیە گەر وەزارەتە عێراقیەکان دواکەوتن یان کەم تەرخەم بوون لە پێدانی پارە بۆ کۆمپانیا ئەمەریکیەکان، ئەوا داوا لە ExIm دەکرێت لە جیاتی ئەوان پارەکە بدات. ئینجا ExIm پارەکەی

خۆی لە پارەی تەرخانکراو بۆ پەرەپێدانی عێراق وەردەگرێتەوە، ئەو بودجە کارایەی عێراق کە ٩٥٪ پێك هاتبوو لە داهاتی فرۆشتنی ئەو نەوتەی کە لەلایەن دەسەلاتی داگیرکەرەوە کۆنترۆل کرابوو.

بە هەمان شێوە چەند لایەنێکی تری هاوپەیمانەکانیش بەشداری ئەو پرۆسەیان دەکرد. لەوانە، دەزگای گەرەنتی هەناردەی یابانی NEXI بە ٥٠٠ ملیۆن دۆلار، هەروەها دەزگای SACE ئیتالییش بە ٣٠٠ ملیۆن دۆلار. ئەوە لە کاتێکدا چەندین دەزگای تری گەرەنتی هەناردەکان لە سێزدە ولاتی ئەوروپییەوە بەشدارییان لە هەمان پرۆسەدا کرد.

"مارك بێلکا" سەرۆکی سیاسەتە ئابووریەکان لە حکومەتی عێراقی کاتیدا، دەڵێت: "گەر رێکەوتن لەگەڵ ئەو دەزگا جیاوازانەی گەرەنتی هەناردەکان ئەنجام نەدرابوایە، ئەوا بانکی بازرگانی عێراقی ناچار دەبوو تەنیا سەرقاڵی کرینی شتومەك بێت بۆ ولاتەکەی. عێراقیەکانیش تا ئێستا لە گشت جۆرە مامەڵە بازگانیەکاندا پارەی کاش بەکار دەهێنن، کە ئەوەش ماندوو بوونو دواکەوتنێکی زۆری تێدایەو هەروەها مەترسیشی زۆرە. بە دڵنیا بوون لەو راستیەی کە بانکی بازرگانی عێراقی ئێستا دەتوانێ (چەکی گەرەنتیە بازرگانیەکان- الصکوك الأئتمانیة التجاریة) دەربکات، ئەوا کردارەکانی کرینی شتومەك بۆ عێراقیەکان ئاسانتر دەبێتو کەشو هەوایەکی سەردەمیانەو دوور لە مەترسیش دەرەخسێت، هەروەها تێچوونەکانیش کەمتر دەبنەوە." ١٢٩

بەلام رەخنەگرانی ئەو پرۆسەیە دەڵێن، ئەگەری ئەوە هەیە هاوپەیمانەکانو بانکە نێودەوڵەتیەکانیش تەگەرە بخەنە بەردەم حکومەتی داهاتووی عێراق، لە رێی ئەو برە پارە نادیارانەی کە لەلایەن دەسەلاتی داگیرکەرەوە بە قەرز دراوەتە کۆمپانیاکانی کە لێیانەوە نزیکن. لەلایەکی تریشەوە چالاکوانانو داواکارانی شەفافیەت لە نێو حکومەتدا، گلەییان لەوە

هەبوو کەوا بەرنامەی پەرەپێدانی عێراق‌و پارەی تەرخان کراو بۆ ئەو بەرنامەیە هیچ شەفافیەتێکی تێدا نیەو ئەو بڕیارانەشی کە لە چوارچێوەی ئەو بەرنامەیە دراون هیچ جۆرە پێداچوونەوەو وردبینیەکی بۆ ناکرێت. بەم شێوەیەش ئەمریکا دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی ڕێساو بنەما دابنێت بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکان لە پارەی داهاتی نەوتی عێراق. "نەعومی پرنس" کۆنە وەبەرهێنەری بانکی‌و نوسەری کتێبی (پارەی خەڵکانی تر: هێرشێکی هاوبەش لە ئەمریکاوە- Other People Money: The Corporate Mugging of America) لە لێدوانێکی بۆ"میتش جیسێریچ" بێژەری هەواڵەکانی رادیۆی دەربڕینی ئازاد (Free Speech Radio)دا، دەڵێت: " هەمان ئەو نەوتەی کە موڵکی کەس نیە... زانیاریەکان لە بارەیەوە بەکار هاتوون بۆ ئەوەی گەڵێ شتی جۆراوجۆر لەگەڵ یەکتری بگونجێنرێت. تۆش کاریگەری هێزی ئەو نەوتە زیاد دەکەیت کە داهاتەکەی شەفافیەتی نیە."

بەهای کۆنتراکتی بەڕێوەبردنەکەش بۆ بانکی بازرگانی عێراقی بریتیە لە ٢ ملیۆن دۆلار بۆ ماوەی دوو ساڵ‌و شەش مانگ، ئەو پارەیەش درایە دەستەیەکی دارایی کە لە سێزدە بانك پێك هاتووەو نوێنەرایەتی چواردە دەوڵەت دەکەن‌و لەلایەن بانکی (JP Morgan Chase)یشەوە سەرپەرشتی دەکرێت. ئەو گرووپە لە تەمووزی ٢٠٠٣، توانی لە رکابەرکێیەکی زیادکردنی ئاشکرادا لە بەرانبەر چوار گرووپی تری دارایی نێودەوڵەتی، ئەو کۆنتراکتە بەدەست بێنێت.

JP Morgan Chase کە بنکە سەرەکیەکەی لە نیویۆرکە، لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٠ دامەزراوە، لە ئەنجامی یەکگرتنی یەکێك لە گەورەترین بانکە بازرگانیەکانی جیهان ( Chase Manhattan Corporation) لەگەڵ کۆمپانیاو بانکی وەبەرهێنانی ( JP Morgan &Company). لێرەوە رەخنەگرەکان تێبینی ئەوەیان کرد، کە هاتنی JP

Morgan Chase ئاماژەیە بۆ ئەگەری دەست بەسەرداگرتنی سیستەمی بانکی لە عێراق لەلایەن بانکە بیانیەکانەوە. دوو مانگ دوای دامەزراندنی بانکی بازرگانی عێراقی، دەسەلاتی داگیرکەر یاسای ژمارە ٣٩ دەرکرد: بە پێی ئەو یاسایە کۆمپانیاو کەسە بیانیەکان دەتوانن ببنە خاوەنی هەموو جۆرە سەرچاوەیەکی داهاتو سامانی سروشتی لە عێراقدا جگە لە نەوت نەبێت. دوای ئەوەش بە ماوەیەکی کەم، وەزیری دارایی عێراقی"کامل ئەلگەیلانی" دەستیکرد بە ئەنجامدانی چاکسازی گەورە لە سیستەمی بانکی عێراقیدا، وەك رێگەدان بە کۆمپانیای دارایی‌و وەبەرهێنەرە بیانیەکان بە مولکداریەتی ١٠٠٪ بانکە عێراقیەکان. بەوەش یەکەم جاربوو لەوەتەی پەنجاکانەوە، بانکە بیانیەکان بتوانن بێنە نێو سیستەمی دارایی عێراقی، ئەو سیستەمە داراییەی ببووە خالی هێزی دووەم خاوەن نەوتی یەدەگ لە جیهاندا.

بە پێی گوتەی پرنس، خاوەندارێتی بیانی بۆ بانکە عێراقیەکان بە تەواوەتی دەرگای لەبەردەم بەشداریکردنی بانکە عێراقیە ناوخۆییەکان لەو سیستەمە نوێیەی ئابووری داخست. ئەو بانکە عێراقیانەشی، توانیان خۆیان لە دەست بەسەرداگرتنی بیانیەکان بپارێزن، ئێستا دەبێ رکابەرکێی بازاڕ لەگەلّ ئەو بانکە بیانیانەو پاشکۆکانیشیان بکەن کە خاوەنی سەرچاوەو سەرمایەی بێ سنوورو توانای قەرزدانی نەبڕاوەن.

"رانیا میسری" بەڕێوەبەری پرۆگرامەکانی پەیمانگای لێکۆلّینەوەکانی باشوورو بەڕێوەبەری یاریدەدەر لە هەلّمەتی "وەستاندنی هەلقۆزەرەوەکانی شەڕ"، دەپرسێت: "ئایا ئەم جۆرە یاسایانە یارمەتی عێراقیەکان دەدەن لە بوژاندنەوە یان جۆرە یاسایکن رێگە لەبەردەم کۆمپانیاکان والا دەکەن تاوەکو سوودو قازانج لە سامانو سەرچاوەکانی داهاتی عێراق ببینن؟ ئەوە زیاتر مەیلی داگیرکەری پێوە دیارە لەوەی کە کارکردن بێت بۆ بووژاندنەوە."

## خزمەتکردنی تاکڕەوی

بێگومـان، JP Morgan Chase نـامۆ نـەبوو لەلایـەن نەخـشە داڕێژەرانی داگیرکاریەکە، بەوەی یەکێك بوو لەو حـەوت گـەورەترین دەزگاو کۆمپانیایانـەی کـە لـە مـاوەی بیـست سـاڵی رابـردوودا پـشتگیری "دیـك چێنی"یان دەکرد بۆ وەرگرتنی پۆستەکانی. ١٣٠

بانکەکە دەسبەجێ دوای داگیرکردنەکە رووی لـە عێـراق کـرد، بـەوەی پێشتر پەیوەندی نزیکی هەبوو لەگەڵ ئەو کۆمپانیانەی ملیارەها دۆلاریان لە بەرانبـەر کۆنتراکتـەکان وەرگرتبـوو. "راڵـی بـەکتل"سـەرۆکی بـۆردی بـەڕێوەبردنی بـانکی JP Morgan Chase، کـە ئەنـدامێکی خانـەوادەی بەکتلـە (خـاوەنی کۆمپانیـای بـەکتل)، "لی رایمۆنـد"یـش باڵادەسـتێکی تـری بەرچـاوی بـۆردی بانکەکەیـە، کـە پێـشتریش سـەرۆکی بـۆردی کۆمپانیای"ئێکسۆن مۆبیل" بووە. ١٣١

لـە ترسـی ئـەوەی نـەوەك رەخنـەگرەکان بڵێن JP Morgan Chase شیاو نیە بـۆ بـەڕێوەبردنی سیـستەمی بـانکیی عێـراق، دەبوایـە بگوترابوایـە کۆمپانیاکـە پێـشینەو شـارەزایی کـارکردنی هەیـە لـە رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت. بەوەی کە لە ماوەی سی ساڵی رابردوودا، بانکەکە یارمـەتی بـانکی نیـشتمانی قەتـەری دەدا، لـە رێـی بـەڕێوەبردنی داهـاتی هـەناردەکانی لـە نـەوتو گـازی سروشتی، بەو جۆرەش قەتـەر بـووە یـەکێك لە وڵاتـە دەوڵەمەنـدەکانی ئـەو ناوچـەیە، هـەروەها یارمەتیـدان لـە پتـەوترکردنی پێگـەی خانـەوادە پاشایەتیەکەی قەتەر. ١٣٢

قەتەر تەنیا یەکێك بوو لەو رژێمە نادیموکراسیانەی کەوا بانکی ناوبراو یارمـەتی دەدان لـە رووی بـەڕێوەبردنی سیـستەمی دارایـی. لـە راسـتیدا، کۆمپانیاکە مێژوویەکی درێژی هەبوو لە هاوکاریکردنو یارمەتیدانی رژێمـە

ناڕەواکـان، تـا کـاتی قەیرانـە بەدناوەکـەی دارمـانی کۆمپانیـای "ئینرۆڵـی" ئـەمریکی. توێژینەوەیـەکی ئـەنجام دراو لەلایـەن ئەنـدامێکی ئەنجوومـەنی بیمە لە کالیفۆرنیـا، ئەوە دەردەخـات کـەوا کۆمپانیا کۆنەکـەی Chase کە ئێستا بەشێکە لە JP Morgan Chase، یەکێك بووە لەو کۆمپانیانەی کە بیمەی ژیانیان داوەتە خـاوەن کۆیلـەکان لـە بـری کۆیلەکانیان. بـە پێـی ئـەم توێژینەوەیـە، کاتێـك کۆیلەیـەك دەمـرد کۆمپانیاکە قـەرەبووی خاوەنەکـەی دەکردەوە. وەکو چۆن "چارلۆت گێڵبەرت" وتەبێـژی بـانکی نـاوبراو ئامـاژەی پێ دەدا، بانکەکە هـەرگیز قـەرەبووی نەداوەتـەوە، کـە دەڵێـت: "پـێم وا نیـە هیچ جۆرە بنەمایەك هـەبێت تـاوەکو بەرپرسـیارێتی یاسایی بکەوێتـە سـەر شانی تەنانـەت بەشـێکی بانکەکـەش." ١٣٣ بـۆ بەختـەوەری نازیـەکانیش لـە جـەنگی دووەمـی جیهانیـدا، هـەردوو بـانکی Chase National و JP Morgan یارمـەتی هیتلـەریان دەدا لـە راگرتنـی حیسابە بانکیـەکانی ئـەو جولەکانـەی کـە مامەڵـەیان لەگەڵیانـدا هـەبوون، تەنانـەت دوای تـەواوبوونی جەنگیش حیسابەکانیان بۆ نەگێڕانەوە.

وەزارەتی دارایی ئەمریکی لە ساڵی ١٩٤٥ راپۆرتێکی سەبارەت بە چالاکی سیستەمی بانکی لە ئەمریکا لـە کاتی شـەڕدا ئامـادەکرد، کـە تیایـدا هـاتبوو: "تۆمارەکـانی تایبـەت بـە لقـی (Chase) لـە پـاریس بریتیـە لـە بەدەنگەوەچـوونێکی ناڕاگـەیێنراو بـۆ خواسـتی ئەڵمانـەکان و نیـازێکی ئاشکرایشە بۆ پتەوکردنی پێگەی خۆی لەگەڵیاندا." ١٣٤

رابـردووی ڤێزەونـی JP Morgan و Chase لـە یارمـەتی دانیان بـۆ حکومەتـە رەگەزپەرستەکان تـەنیا ئـەمریکاو ئـەوروپا ناگرێتـەوە. چـونکە کۆمپانیاکە داوایەکی یاسایی لە دژی تۆمارکرابوو، بەوەی لەسەردەمی رژێمـی ئەپارتایـد لـە باشـووری ئـەفریقیادا، یارمـەتی دارایـی دەسـەبەر کـردووە بـۆ فراوانکردنو بـەهێزکردنی تواناکانی پۆلیسو ئاسایش، ئـەوە لەکاتێکدا لـە

ساڵی ١٩٦٤، نەتەوە یەکگرتووەکان هانی گشت لایەکی دەدا بۆ ئەوەی پەیوەندیو هاوکاری لەگەڵ حکومەتی ئەو وڵاتە بپچڕێنن، چونکە تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی ئەنجام دەدا. ئەو کات JP Morgan رازی نەبوو لەبارەی ئەو مەسەلەیە لێدوان بدات، بە بیانووی ئەوەی هێشتا لە قۆناغی لێکۆڵینەوە دایە. ١٣٥

لەم دواییانەشدا لە ساڵی ٢٠٠٢، لێژنەی سەنەدو گۆڕینەوەی ئەمریکی باسی لە چۆنیەتی یارمەتیدانی JP Morganـی دەکرد بۆ کۆمپانیای "ئینرۆن" لە چاککردنەوەو دەستکاریکردنی تۆمارە داراییەکانی. هەروەها لێژنەیەکی سەر بە کۆنگرێسیش بۆی دەرکەوت کەوا JP Morgan و "سیتی گرووپ" دەیانزانی ئەو پارەیەی کە دەیدەنە "ئینرۆن"، بۆ چاککردنەوەی باری شڵەژاوی دارایی کۆمپانیاکە بەکاردەهێنرێت، زیاتر لەوەی مەبەستیان کاری هاوبەش بێت. ئەو دەستکاریکردنانەش بوونە هۆی بەرزبوونەوەیەکی زۆر لە نرخی وزە لە کالیفۆرنیا، لە هەمان کاتیشدا کەمبوونەوەیەکی بەرچاو لە بڕی وزەکە. ١٣٦

## کۆمپانیا نێودەوڵەتیەکانی دارایی

لە پاڵ گەرەنتیەکانی بازرگانی لە عێراقدا، پێشنیاری چەند سەرچاوەیەکی تری سەرمایەگوزاری کرا. سەرەڕای پێشوەچوونی بارودۆخی ئاسایش لە عێراق، ئەوا دەکرێ ببنە راستی گەر بەڵێنەکان بێنە دی. بە پێی راگەیاندنێك لەلایەن "ئەسعەد جابر" جێگری سەرۆکی پرۆسەکان، لە ناوەڕاستی ئاداری ٢٠٠٤، کۆمپانیای دارایی نێودەوڵەتی IFC لەگەڵ بەشێکی بانکی نێودەوڵەتی نیازیان وابوو لە حوزەیرانی ٢٠٠٤ بێنە عێراق. IFC لەلای خۆیەوە ٢٠٠ ملیۆن دۆلاری تەرخان کردبوو، وەك خاڵێکی دەست پێکردنیش، ٣٠ ملیۆن دۆلار بۆ بەرزکردنەوەی توانای کەرتەکانی تری

ئـابووری دانـرا، لەگـەڵ دەستنیـشان کردنـی ١٧٠ ملیـۆن دۆلاری تـریش بـۆ پاڵپـشتی کردنـی پـرۆژەی بـچووك و مـام ناوەنـد. لـە لێدوانێکیـدا بـۆ ریپۆرتـەرەکان، جـابر دەڵێـت: "ئێمـە دەتـوانین وەبـەرهێنان لـە گـشت کەرتـەکانی ئـابووری عێراقـدا بکـەین، بـە مـەرجێك پرۆژەکـە شـیاوی جێبـەجێکردن بێـت. لـە ئێـستادا عێـراق گـەلێ توانـا و بـواری وەبـەرهێنانی هەیە، بەلام حکومەتی باشیش (الحکومە الرشیدە) فاکتەرێکی تری گرنگە بۆ پێشکەوتن لە عێراقدا." ١٣٧

## بارۆنەکانی بەغدا

وەبـەرهێنان لـە عێـراق، بـە تـەواوەتی بـە سـەر کۆمپانیـا بیانیەکانـەوە قـەتیس نـەبووبوو. بـە پێـی راپـۆرتێکی سـەنتەری پـرۆژە تایبەتیـەکانی نێودەوڵـەتی CIPE (دەزگایـەکی ناسـوودمەندی سـەر بـە ژووری بازرگـانی ئەمریکیە)، عێراق دوازدە لـە بـەهێزترین خانـەوادەی سـەرمایەداری تێدایـە کە دەیەها ساڵە لە کەرتە جۆراو جۆرەکانی ئابووریـدا وەبـەرهێنان دەکـەن. مێـژووی هەنـدێك لـەم خانەوادانـە لـە کتێبێکـدا هـاتووە بـە نـاوی (چینـە کۆمەلایەتیـە کۆنـەکان و بزوتنـەوەی شۆرشـگێری لـە عێراقـدا) کـە "حـەننا بـەتاتۆ" نووسـیویێتی. ئـەم کتێبـە لـە سـاڵی ١٩٧٨ لـە ئـەمریکا بلاوکرایـەوە. هەرچەندە کتێبەکە باس لەو کەسانە ناکات کە لەسـەردەمی رژێمـی سـەدام حوسـێندا بـە هـۆی نزیکـی و لایـەنگریان بـۆ رژێمەکـە بوونەتـە خـاوەنی سەرمایە. بەلام نووسەر گریمانەی ئەوە دەکـات، رەنگبـێ ئـەو سـەرمایەدارانە پـشتگیریەکی زیاتریـان لەلایـەن حکومـەتی ئێـستای عێراقـەوە بکرێـت، بـە بەراورد لەگەڵ ئەوەی لەسەردەمی سەدامدا هەبوو.

لە نووسینێکی "ئەدریان گاتۆن" و"کلایتـۆن هێرست"، کـە لـە شـوباتی ٢٠٠٤ لـە رۆژنامـەی "ئینـدیپێنـدیت"ی لەنـدەنی بلاوکراوەتـەوە، هـاتووە: "

پەیوەندیەکانی کارو بەرژەوەندی بنەماڵە دەوڵەمەندەکانی عێراقی لە کەنداوو رۆژهەلاتی ناوەڕاستو بگرە ئەوروپاش، وای کردووە عێراق پێگەی خۆی لەگەڵ بنەماڵە فەرمانڕەواکانی ئەو ناوچەیە بەهێزبکات. هەروەها بنەماڵەی "ئەلبونیە" و "ئەلخوزەیری" و "کوبەیسی" بە درێژایی سەدەی رابردوو، بە هاوشێوەی خانەوادە ئەمریکیەکانی وەك "رۆکفێلەر" و "گێتس" و "فۆرد" هێزو پێگەیان لەرێی وەبەرهێنانی موڵكو زەویو وزار، کارەکانی بیناکردنەوە، تەکنەلۆژیاو پیشەسازیش توندوتۆڵ کردووە. ١٣٨

گاتۆنو هێرست دەڵێن: خانەوادەی ئەلبونیە، یەکێکە لە کۆنترینو بە تواناترین خانەوادەکانی عێراق کە مشت و مڕیکی زۆریان لەسەرە. گرووپی پیشەسازی ئەلبونیە، لەلایەن عبدالوهاب مەحمود ئەلبونیەوە سەرپەرشتی دەکرێت و ئێستاش خەریکی ئامادەکردنی کوڕەکەیەتی کە ناوی خەلیلە بۆ ئەوەی جێی بگرێتەوە. ئەم گرووپە لە ساڵی ١٩١٠ دامەزراوە و ئێستاش خاوەنی چوار هەزار کارمەند و زیاتر لە چل کۆمپانیا دەگرێتە خۆی، بواری کارەکانیشیان بریتیە لە نۆژەنکردنەوەی ژێرخان، خۆراك، کاری بانکی، بیمە، رستن و چنین، هەروەها هۆتێلیش. وەك هەر خانەوادەیەکی سەرکەوتووش لە کارەکانیاندا، پەرە بە پەیوەندیەکانیان دەدەن لەگەڵ کۆمپانیا بیانیەکان. بەوەی خاوەنی کارگەیەکی خواردنەوەی پیپسی و وەکالەتی ئۆتۆمێلیBMW، جگە لەوەش بە پێی راگەیاندنی خۆیان، لە دوا قۆناغەکانی گەیشتنن بۆ رێکەوتن لەگەڵ کۆمپانیاکانی IBM، هایوندایو ئێپسۆنیش. هەندێك لە ئەندامانی ئەو بنەماڵەیەش بەوە ناسراون کە پارەیەکی زۆر لە سامانەکەیان بۆ خۆشگوزەرانیو کڕینی شتی گرانبەها خەرج دەکەن. کە بەم دواییانە، خەلیل شانازی بەوەدەکرد کەوا خاوەنی کۆمەڵێك لە گرانبەهاترین ئۆتۆمبێلەکانی جیهانە. لەلایەکی دیکەوە "سەعدون ئەلبونیە" یەکێکە لە سێ بەڕێوەبەری کۆمپانیاکەو پشکداریشە

له دامەزراندنی کۆمپانیایێکی تۆمارکراو له سویسرا بەناوی "ژووری کەنداوی مـالیزیو سویـسریو ئـەفریقی" Malaysian Swiss Gulf and African Chamber (MIGA)، کـه بـه پێـی لیـستی ولاتـه یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا و ئەنجوومـەنی ئاسایـشی نێودەوڵـەتی، ئـەو کۆمپانیایە، کۆمپانیاییێکی پاڵپشتی کاری رێکخراوی ئەلقاعیدەیە. ١٣٩

یـەکێك لـه کارەکـانی کۆمپانیـای نـاوبراو، بریتـی بـوو لـه یارمەتیـدانی کۆمپانیای بەکتل بۆ تەواوکردنی رێگەی سەرەکی "ئەلمات" کـه درێژیەکەی نزیکـەی ١٧٧ کیلۆمـەتره و لـه سـنووری ئوردونـەوە درێژدەبێتـەوە بـۆ شارۆچکەی روتبه. ئەو رێگەیـه لەکاتی جەنگدا بۆمبـاران کرابـوو. نزیکەی پەنجا کارمەندی کۆمپانیـا عێراقیەکـه هەفتانـه حـەوت رۆژ و لـه ژێـر پلـەی گـەرمی ٤٢,٣ پلـەی سـەدی کاریـان دەکـرد بـۆ ئـەوەی لـه مـاوەی کـەمتر لـه مانگێکدا تەواوی بکەن. ١٤٠

کـاتێکیش کـه زانـیم گرووپـی ئەلبونیـه یەکێکـه لـەو کۆمپانیـا بەڵێندەرانەی کەوا گرێبەستیان لەگەڵ بەکتلدا هەیـه، داوای چاوپێکەوتنم کرد. دوای سێ جار دەستنیشانکردنی کات، بێ ئاکام له پرسگەی کۆمپانیاکـه چاوەڕوانیم دەکرد. ئەوە جگه له چەندین پەیوەندیکردنی تەلەفونی له رێی سەتەلایتەوە که تێچووەکەی زۆره. دوای ئەو هەموو هەولانه باشترین ئەنجام که پێی گەیشتم، چوونم بـوو بـۆ ئاودەستـەکەی نهۆمی دووەمـی بالاخانـەی کۆمپانیاکه. لەگەڵ ئەوەش دوای جێهێشتنم بۆ عێـراق لـه کـانوونی یەکـەمی ٢٠٠٣، ئیمایلێکی کۆمپانیاکەم پێ گەیشت که تیایدا پیرۆزبایی ساڵی نوێیان لێ دەکردم!!

بنەماڵەیەکی تری خـاوەن سـامانو هێـز، هـەروەها رکابـەری خانـەوادەی ئەلبوننیه، بنەماڵەی "ئەلخوزەیری"ـه، گرووپەکەی ئـەوان لەلایـەن "عـدنان ئەلخوزەیری" سەرپەرشتی دەکرێت، که له هەمان کاتیشدا سـەرۆکی یـەکێتی

بەڵێنـدەرانی عێراقیـە. وەکـو چـۆن گـاتۆن و هێرسـت باسـی لێوەدەکـەن، بنەماڵەکە خاوەنی گەورەترین کۆمپانیاکانی بیناکردنو بەڵێندەرایەتیـە لـە ناوچەکەو هەورەها خاوەنی کۆمپانیای "زوفار"ـە کە گەورەترین کۆمپانیـای دەرمانە لەو ولاَتە. گرووپی ناوبراو خاوەنی پێنج هەزار کارمەندەو ئێستاش بە نیازە خۆی لـە کۆمپانیـا رۆژئاواییـەکان نزیـك بکاتـەوە، بـەوەی هاوبەشـی لەگـەڵ کۆمپانیـایێکی نـەوتی بـەریتانی بـە نـاوی"Wood Group" و کۆمپانیایێکی بەڵێندەرایەتی ئەمریکیش بە ناوی "Shaw Group" بکات. بنەماڵەکـە لەلایـەن هێزەکـانی داگیرکـەرەوە رەخنـەیان لـێگیرا بـەوەی کـە "فیصل ئەلخوزەیری" سـەرۆکی کۆمپانیـای "زوفـار" لـە مونتـەدای ئـابووری جیهانی کە سالّی پـار گرێـدرا، هاوپەیمانـەکانی بـەوە تۆمـەتبار کردبـوو، کـە کاربەدەستە گەندەڵەکانی حکومەتیان بەکرێ گرتووە.

خەوام ئەلعەبدولعەباس، بنەماڵەیەکی تـری سامانداره لـە عێـراق، لـە ٢ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣، کۆنتراکتێکی کاری هاوبەش لە نێوان "فـاخیر فـەرەج محمـد" بەرێوەبـەری گـشتی فرۆکـەوانی نێوخـۆیی لـە وەزارەتـی گواسـتنەوە لەگـەڵ سـێ ئەنـدامی بنەمالـەی نـاوبراو ئیمـزا کـرا، بـۆ بـەرێوەبردنی کۆمپانیـایێکی تـازە پێکهێنـراو بـە نـاوی "کۆمپانیـای هێڵـی ئاسمـانی ئەلعێراقیە". پشکی حکومەتیش لەسەرمایەی ئەو کۆمپانیایە بریتیـە لـە ٢٥ ملیۆن دۆلار (دەکاتە کەمتر لە ٢٥٪) کە لەسەرمایەی هێڵی ئاسمانی پێشووی عێراق دەدرێت.

لە دۆکیۆمێنتێکی بلاّوکراوە لەلایەن رۆژنامەی "ئەلموئتەمـەر"ـی سـەر بە کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی INCدا کە لـە نوسینگەی سـەرۆك کۆمـاری پێـشوو سـەدام حوسـێندا دەسـتی بەسـەر داگیرابـوو، هـاتووە کـەوا گرووپـی بنەمالـەی خـەوام ئەلعەبدولعـەباس کـاری هاوبـەشو مامەڵـەیان لەگـەڵ دیکتـاتۆری پێـشوو هـەبووە. ئامـاژە بـەوە کـراوە، بنەماڵەکـە ئـەرکی

بەڕێوەبردنی هەردوو کۆمپانیای "ئەلهودا" و"عەلیا"ی خراوەتە ئەستۆ. کۆمپانیای "ئەلهودا" پشکداری ڕێکخراوی بە بازاڕکردنی نەوتی نیشتمانی بوو، ئەو ڕێکخراوەش بەوە تۆمەتبار دەکرا کە دەستی هەبووە لە بەقاچاغ ناردنە دەرەوەی نەوت لە کاتی ئابلۆقەی ئابووری سەر عێراق. ڕۆژنامەکە وێنەی ئەو دکیۆمێنتانەشی بلاوکردبۆوە کەوا بەڵگە بوون لەسەر تێوەگلانی بنەماڵەی ناوبراو لە بەقاچاغ ناردنە دەرەوەی نەوتو دانی بەرتیل بۆ کارمەندە عێراقیو بیانیەکانیش، هەروەها هاوردەکردنی خۆراکی بەسەرچوو لە چوارچێوەی بەرنامەی نەوت لە بەرانبەر خۆراکدا. ١٤١

گرووپێکی تریش، بریتیە لە گرووپی بنەماڵەی "ئەلکوبە"، کە لە ساڵی ١٩٥٣ دامەزراوە، لەلایەن "حیکمەت هادی کوبە"ـەوە بەڕێوە دەبرێت. خانەوادەکە لە ڕێی کارە خێرخوازیەکانیەوە ناووناتۆرەیەکی باشی بەدەست هێناوە. ئەویش بە دامەزراندنیان بۆ دەزگای "ئەلکوبە" کە ئیشی لەسەر پەرەپێدانی فێربوون، تەندروستی، خۆشگوزەرانی بۆ عێراقیەکان دەکرد. بوارەکانی کارکردنی خانەوادەکەش بریتین لە تەکنەلۆژیا، گەیاندنو پەیوەندیەکان، ئەندازیاریو بەڵێندەرایەتی. لەوەش زیاتر خاوەنی کارگەی کۆلا بوون لە شاری کوفەو کارگەی ئاوی کانزایی لە شاری بابل، کە هەردوو کارگەکەش لینکێکی هاوبەشیان هەبوو لەگەڵ کۆمپانیای پیپسی.

وێب سایتی گرووپی ناوبراو بە ئاشکرا ئارەزووی خۆی دەربڕی بۆ یارمەتی دانی دارایی دوای ئەو ئاژاوەو توندو تیژیەی عێراقی تێکەوت لە دوای ڕووخانی ژێمی سەدام. ئەمەش ئاماژەیەك بوو بۆ ئارەزوو دەربڕین بۆ یارمەتیدانی کۆمپانیا نێودەوڵەتیەکانو ڕێگەخۆشکردن لەبەردەمیان، لە هاتنیاندا بۆ ناو ئەو بارودۆخە هەنووکەییە ئالۆزانەی سیاسیو بازرگانی کە ڕووبەڕووی بازاڕی عێراقی بوونەتەوە. ١٤٢

دوایین گرووپ، بە گرووپی بنەماڵەی "مونیر سوکتیان" ناسراوە، کە

ساڵی ١٩٣٣ سەرەتای دەست کردنیان بوو بە ئەنجامدانی پرۆژە، کاتێک کە دەرمانخانەیەکیان لە تۆڵکەرەمی فەلەستین دانا. ئەمرۆش لەلایەن سێ کوڕی دامەزرێنەری کۆمپانیاکە بەڕێوە دەچێتو زۆربەی کارو بەرژەوەندیەکانیشیان لە ئوردونەو بواری کارەکانیشیان بریتین لە گەیاندنو پەیوەندیەکان، مادده کیمیایەکان، داو و دەرمان و پیشەسازی.

سەبارەت بە بنەماڵە سەروەتمەندەکانی تری وەك "شەنشەل" و" ئەلدولەیمی" و "ئەلخەربیت"، ئەوا خۆیان لە ناودەرخستن بە دوور گرتووە، هەروەها زانیاریەکی ئەوتۆشیان لەسەر دەست ناکەوێت. ١٤٣

# پوخته

زۆر ئەستەمە بتوانین ئەنجامێکی خێرا بەدەست بێنین، بەوەی ئاخۆ کاروپرۆژەکانی بوژاندنەوەی ژێرخان سەرکەوتوو بوونە یان هەرەسیان هێناوە. چونکە هەردوو ئەگەر، لایەنگرو پشتگیریان زۆرە. بەردەوام سوپاو USAID و دەسەلاتدارانی داگیرکەریش، باسی دەسکەوتو بەرهەمی کارەکانی خۆیان دەکەن، هەرچەندە هەندێکیان گومانیان لەسەرە، بەلام زۆربەشیان هەولی راستەقینەو خزمەتگوزاری گرنگیان بۆ عێراقیەکان دابین کردووە. ( یەك لەو دەسکەوتانەی کە باسی لێوە دەکرێتو گومانی لەسەرە، بریتیە لە چوونی کچان بۆ قوتابخانە، لە کاتێکدا لەسەردەمی رژێمی سەدامیشدا کچان هەر دەچوون بۆ قوتابخانەو رژێمەکەشی یەکێك بوو لەو رژێمانەی کەوا نەرمو نیانیان لەگەل مافی ئافرەتان دەنواند لەناوچەکە. بە هەرحال ئێستا بە بەراورد لەگەل ئەو کات، ژمارەی ئەوکچانەی دەچنە قوتابخانە کەمتر بۆتەوە، ئەویش لەبەر ئەو بارە نەگونجاوەی ئاسایش) رەنگبێ ئەو هاولاتیە ئەمریکیانەی کەوا خەرجی ئەو شەرە لە ئەستۆی ئەوان دایە، نارەزایی لە بەرانبەر ئەو بارودۆخە دەربڕن، بەلام پرسیارە راستەقینەکە ئەوەیە، ئایا هاولاتیانی عێراق چۆن بیر لە ئاکامەکان دەکەنەوە.

راپرسیەك لەلایەن سەنتەری لێکۆلینەوە و دیراساتی ستراتیژی عێراقی (کە سالێکە دامەزراوە)، ئەنجام درا. کە لە کۆتایی ئایاری ٢٠٠٤ بلاوکرایەوە. لە راپرسیەکەدا هاتبوو، ٩٠٪ خەلکی عێراق پێیان وایە ئەمەریکا هێزێکی داگیرکەرە نەوەك ئازادکار، هەروەها ٧٠٪ کەسەکان لەمەڕ هەندێك مەسەلە پشتگیریان لە موقتەدا سەدر دەکرد. زیاتر لە نیوەی ئەوانەشی کەوا راپرسیەکەیان لەسەر ئەنجام درابوو - کە ١٦٠٠ کەس بوون لە شیعە و

سوننەو کوردیش لە گشت ناوچەو هەرێمە سەرەکیەکانی عێراق- ئارەزوویان دەکرد سوپای هاوپەیمانەکان عێراق جێبهێڵن. بە بەراوردیش لەگەڵ راپرسیەکی تری ئەنجام دراو لە تشرینی یەکەمدا، تەنیا ٢٠٪ عێراقیەکان ئارەزووی دەرچوونی هێزەکانیان دەکرد. ١٤٤

زۆربەی عێراقیەکان، بگرە ئەوانەشی کە بەتوندی پشتگیری داگیرکردنەکەیان دەکرد، گلەییان لە بارودۆخەکە هەبوو. بێگومان گەلێکیشیان تورەبوون لە کەمی خزمەتگوزاریە سەرەکیەکانی وەك کارەباو تەلەفون. هەورەها ترس لە نادیاری چارەنووس‌و دوا رۆژبالی بەسەر بەتایبەتکردنی پیشەسازی کێشابوو. خەڵکیش ئومێدیان دەکرد ئاژاوەی نێو نەخۆشخانەکان‌و لەویش گرنگتر زیادبوونی مەترسی لەسەر شەقام‌و جادەکان کۆتاییان پێ بێت.

# بەشی سێیەم

# سەربازەکانی سامان

"مان بەهادور گۆرەنگ" کەمێك بە پەشۆکاویەوە پەنجەی خستبووە سەر پەلاپیتکەی تفەنگەکەی. دیمەنی بەغدا لە نهۆمی هەژدەهەمینی شێراتۆنەوە، کە یەکێکە لە بەرزترین بالآخانەکانی شارەکە، دڵرفێن بوو، سەرەڕای نەبوونی کارەبا لە زۆربەی گەڕەکەکانی شارەکە، جگە لە ژمارەیەکی کەمی گەڕەکە دەوڵەمەندەکان و هەندێك شوێنی کار نەبێت کە بە شەو موەلیدەیان لێ بە ئیش دەخرا. لە دواوەی "مان" لە چێشتخانەی هۆتێلەکە، ژمارەیەك لە کارمەندەکانی هالیبێرتۆن لە کاتی نانخواردندا خەریکی قسەکردن بوون. هەرکە لە مەسعەدەکە هاتمە دەرەوە، هەستم کرد بە گومانەوە سەیرێکی لێکردم، چونکە باجی تایبەتیم بە سینگمەوە هەڵنەواسیبوو، هەروەها شێوەشم لە خەڵکی ناو هۆتێلەکەی نەدەکرد.

دواتر زانیم، کەوا "گۆرەنگ" پێشتر سەربازێکی سەر بە هێزی (گورخا) بووە- کە گروپێکی سەربازی بەکرێگیراون. ئەو هێزە لە ساڵی١٨١٧ بۆ یەکەم جار لەلای سوپای بەریتانیەوە بەکرێ گیران، کە لە کۆمەڵێك کەسی چاونەترس و سەرکێشی هیمالایا پێك هاتبوو، وەکو چەکداری بەکرێگیراوی ناوخۆیی کاریان دەکرد. "گۆرەنگ" بۆ گروپێکی چەکداری کار دەکات، کە یەکێك بوو لە نێوان دەیەها کۆمپانیای ئەمنی لەو وڵاتە. کۆمپانیاکەی لەلایەن هالیبێرتۆنەوە بەکرێ گیرابوو بۆ پاسەوانیکردنی ئەو کارمەندانەی کە لە هۆتێلی شێراتۆن دابەزیبوون. هەرچەندە "گۆرەنگ" لە وڵاتەکەی

دوور بوو، بەڵام ئەوە یەکەم جاری نەبوو. پێشتر لە کاتی شەڕی ناوخۆی سیرالیۆن و دواتریش لە ئەنگۆلا وەکو پاسەوانی دەزگا نەوتیەکان کاری دەکرد. ١٤٥

پرسیارم لێ کرد، ئاخۆ دەتوانم بچمە کافتریاکە شتێك بۆ خواردنەوە بێنم، ئەویش بە دوودڵیەوە، بانگی یەکێك لە کارمەندەکانی هالیبیرتۆنی کرد بۆ ئەوەی مۆڵەتی لێ وەربگرێت. بێگومان وەڵامەکەش نەخێر بوو. ئینجا ناوبراو داوای لێکردم ئەوێ جێبێڵم و بە لوولەی تفەنگەکەشی ئاماژەی بۆ مەسعەدەکە کرد. بۆیە رووم وەرگێڕا و ئەوێم جێهێشت. لە کاتی چوونە خوارەوەشمدا، تێبینیم کرد کەوا چەکداری هاوشێوەی گۆرەنگ لە هەر هەشت نهۆمی هۆتێلەکە وەستابوون. هەمووشیان جلێکی شین و ئێلەگێکی گوللە نەبڕیان پۆشیبوو، تفەنگیش لەدەست، ئامادەباش وەستابوون.

رۆژی دواتریش، لە دیوەکەی تری شارەکە و لە ژێرزەمینی سەنتەری کۆنفرانسەکان، کە نووسینگەکانی بەکتلی لێبوو، چاومان بە "مانیرام گۆرەنگ" کەوت، ئەندامێکی تری "گۆرخا" لە دەرەوەی نووسینگەی قونسولی ئەمریکی. لە پێش وێنەکانی جۆرج بۆش و دیك چێنی و پاوەڵ وەستابوو. ناوبراو چاوی دەبڕیە هەر کەسێك لەوێ هات و چۆی بکردایە، لەسەربازە ئەمریکیەکان و کاربەدەستە عێراقیەکان و ئەو بەڵێندەرانەشی کەوا بەدەم قسەکردنەوە پەلەیان دەکرد لە رۆیشتن و باسی کارەکانی ئاوەدانکردنەوەی ئەو وڵاتەیان دەکرد. ناوبراو سەر بە هێزەکانی داگیرکەر نەبوو- باجە رەنگ سوورەکەی سینگی ئاماژە بوو بەوەی ناوبراو کارمەندی کۆمپانیایێکی تری ئەمنی تایبەتە بە ناوی"گلۆبەڵ ریسك". ١٤٦

بەلای هەردوو چەکدارەکەی "گۆرخا"ـەوە، کاری پاسەوانیکردن لە عێراق، سەرەڕای ئەوەی کارێکی بێزارکەر و ناخۆش بوو بەڵام مووچەیەکی

باشی هەبوو، بەوەی هەموو مانگێك دەیانتوانی ۱۳۰۰دۆلار بنێرنەوە بۆ ماڵەوەیان. هەرچەندیش نەدەگەیشتە ئەو مووچەیەی کە پێشتر لە سوپای بەریتانی وەریان دەگرت (دوو هەزار و پێنج سەد دۆلار لە مانگێکدا لە۱۹۹۰)، بەلاّم هەرچۆنێك بێت پێداویستیەکانیانی پڕ دەکردەوە، لەگەڵ چەند دەسکەوتێکی تریش- ئەو کارانە تەنیا بۆ ماوەی شەش مانگ بوون; چونکە لەو کاتەی کە ئەرك و کاری بەریتانیەکان لە شوێنی نامۆی وەك بۆرۆنی و هۆنگ کۆنگدا بوو، تەنیا سێ ساڵ جارێك مۆڵەتیان پێ دەدرا بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە ماڵەوە. مانیرام پێی گوتم، گرووپەکەی ئەو لەکاتی شەودا چەکدارەکانی خۆی لە کەمپەکان گل دەدایەوە و هەر هەشت کەسیش لە کابینەیەکدا، خواردنیش بە هەژمار بوو"بە ئینگلیزی" (جوانکردنی دەربڕینی وشەی رۆژئاوایی) لەلایەن چێشت لێنەرە هیندیەکانی سەر بە هالیبێرتۆن ئامادە دەکرا، ئەوانەی کە رۆژانەیان تەنیا سێ دۆلار بوو.

لە کاتێکدا مووچەی پاسەوانەکانی وەك "گۆرەنگ" بە پێی پێوەر و ستانداردی رۆژهەلاّتی ناوەڕاست مووچەیەکی بەرزە، کەچی مووچەی پاسەوانە عێراقیەکانی هەمان ئەو کۆمپانیانە زۆر لە هی ئەوان کەمتر بوو. "محمد ئەلحەسەنی" کە کەسێکی رووخۆش و بەرپرسی بەربەستە ئەمنیەکانی دەوروبەری هەردوو هۆتێلی شیراتۆن و فەلەستین بوو پێی گوتم، مانگانەکەی تەنیا ۱۰۰ دۆلارە، بەشی بژێوی خێزانەکەی ناکات کە لە هاوسەرەکەی و دوو منداڵ پێکهاتبوو. بەلاّم بەهەرحاڵ ئەوە زۆر باشترە لە نەبوونی هیچ داهاتێك، لە ولاّتێکدا کە رێژەی بێکاری دەگاتە ۷۰٪. بۆیە قسەی دڵی خۆی بۆ دەکردم و دەیگوت: "من دەمەوێ کار لەگەڵ کۆمپانیا ئەمریکیەکاندا بکەم، من خاوەنی پشتێنەی پلە دووی رەنگ رەشم لە وەرزشی کاراتێدا و سەریش لە تەقاندنی گشت جۆرەکانی چەکی وەك AK-47، M-16 و هەموو جۆرەکانی تریش، دەردەکەم. پێشم گەیشتۆتەوە کەوا

هەندێ لە هاوڕێکانم لـە کۆمپانیـای هـالیبێرتۆن پاسـەوانن و مووچەکەشیان دەگاتـە ٤٠٠ دۆلار لـە مانگێکـدا و هـی پاسـەوانە ئـەمریکی و ئەورووپیـەکان زۆرتریشە." ١٤٧

دواتـر بـەرەو دوو پاسـەوانی تـری چوارشـانە چووم، کـە هـەر یەکـەیان رادیـۆێکی بـێ تـەل و چـەکیان بەدەسـتەوە بـوو، بـە هێمنـی لەبـەردەم قاوەخانەیەکی ئەنتەرنێت وەستابوون. سیمایان لـە ئـەورووپی دەچـوو، لێیان نزیك بوومەوە و لێم پرسین خەڵکی کوێن، یەکێکیان کە شێوەی قسەکردنی ئینگلیزیەکەی لە بەریتانی دەچوو وەلامی دامەوە: "بەرێز، لەگەڵ شاندێکی بازرگانین". ئەوی تریان شێوازی قسەکردنەکەی لە سکۆتلەندی دەچوو گوتی لەگەڵ کۆمپانیای ئەمنی "Olive" کاردەکەین. ١٤٨

## پیاوە چەکدارەکان

بێگومان، ئەستەمە تێبینی ئەو چەکدارە سیما نامۆیانە نەکەیت کە لـە نێـو ئـەو دەوریانـەدا هـەبوون کـە بـە گشت شـوێنە هەسـتیارەکانی عێراقـدا دەگـەڕان. بـە پێـی خەملاّنـدنێکی نـاڕەسمی، ژمـارەی ئـەو کۆنـە سـەربازە بەکرێگیراوانە لە عێراق خۆی لـە بیـست هـەزار چـەکدار (ژمارەیـەکی کـەمی ژنــیش) دەدات، کــە خزمــەتگوزاری ئــەمنی دابــین دەکــەن بــۆ کۆمپانیــا تایبەتــەکان و دەزگــا حکومیــەکان و هــەروەها هێزەکــانی داگــیر کــەریش. زۆرینەی چەکدارەکانی ئەو کۆمپانیایانە عێراقین کە مانگانەکانیان لە نێوان ٦٠ تـا ٢٠٠ دۆلارە، لـە بەرانبـەر کـارێکی مەترسـیدار هـیچ جیاوازیـەکی نیـە لەگـەڵ کـاری پاسـەوانی بانکـەکان لـە هـەر ولاّتێکـی تـری دونیـا. لـە سـەیر کردنیـشم بـۆ کـۆنتراکتێکی تایبـەت بـە گرووپـی ٤ Flak، کـە کۆمپانیـاێکی بەریتانیە، بینیم کەوا تەنیا لە بـری کـاری دوو چـەکدار بۆ پاسـەوانیکردنی هـەر شـوێنێك بـۆ مـاوەی بیـست و چـوار کاتـژمێر، لـە مانگێکدا ٦١٠٦ دۆلار

وەردەگیرێت. کەچی مووچەی عێراقیەکان کە لە هەمان هەلومەرجدا کاردەکەن تەنیا ١٠٪ ئەو برە پارەیەیە. ١٤٩

ئەو کارمەندانەی کەوا لە نیپالو هیندستانو فیجی هاتوون، مووچەکەیان پلەیەك لەسەرووی مووچەی عێراقیەکانەوەیە ئینجا لەسەرووی ئەوانیش چەکدارەکانی کە لە تشیلیو ئەفریقیای باشوورو ولاتانی سۆڤیەتی پێشوو هاتوون. ئەو چەکدارانەشی کە لە بەریتانیا و ئەمریکاوە هاتوون مووچەکانیان بە رادەیەك بەرزترە کە لە هەندێ حاڵەتدا رۆژانەی هەندێکیان دەگەیشتە ١٠٠٠دۆلار. ئەو پاسەوانانە بەگشتی مەشقیان لەسەر پاراستنی شوێنە هەستیار و گرنگەکان وەرگرتبوو، لە هەمان کاتیشدا راهێنانیان بە سەربازەکانی سوپای ئەمریکیو عێراقیو، هەروەها پۆلیسی عێراقیش دەکرد. هەرچەندە ئەو چەکدارانە بەپێی توانا هەوڵ دەدەن نەچنە نێو ململانێیەکانەوە، بەڵام لە کاتی شەڕدا فێری چۆنیەتی مامەڵەکردن کراون.

کۆمپانیای ئەمنی "Olive" کە بنکەکەی لە مایفیەرە لە لەندەن، یەکێك بوو لەو کۆمپانیا ئەمنیانەی دەسبەجێ دوای سوپا هاتنە عێراق. کۆمپانیای ناوبراو لەسەردەستی "هاری لیگ بۆرك" دامەزراوە، دەکاتە برای دایەنی پێشووی هەردوو شازادەی بەریتانی "ویلیام و هاری"، کە زیاتر لە سەد سەربازی دێرینی شارەزاو لێزانی هێزی ئاسمانی تایبەت SAS (یەکەیەکی دەستەبژێری سەربازین، هاوشێوەی هێزە تایبەتیەکانن) راکێشابوو، بۆ کارەکانی پاسەوانیو ئامادەکردنی راپۆرتی لۆجستی لەسەر رەوشە ئەمنیەکان. رێك دوو رۆژ لە دوای شەڕ، کۆمپانیاکە سیو هەشت لەو سەربازە دێرینانەی هێزی ئاسمانی ناردە عێراق بۆ دامەزراندنی بنکەی کارو چالاکیەکان بۆ بەکتل. لەو کاتەدا "لیگ بۆرك" گوتی: "ئەوە مامەڵەکردنە لە نێو قەیران، لە کەشو هەوایەکی دوژمنانە، بۆیە پێویستیت بە

خەڵکانێك دەبێت بزانن چی دەکەن." ١٥٠

هەر زوو بەدوای ئەوانەوە، سەدان لە کۆنە سەربازەکان لە هیندستان‌و چیلی‌و باشووری ئەفریقیاو فیجی روویان لەو وڵاتە کرد. وەکو چۆن "کەی. پی. سەیدالاڤیا" سکرتێری گشتی لیژنەی هەماهەنگی سەربازە پێشووەکانی نەتەوەیی لە هیندستان باسی سەربازە هیندیەکان دەکات بۆ رۆژنامەی "هیندۆ": " زۆرینەی ئەو کۆنە سەربازانە، زۆر باش دەرك بە مەترسیەکانی ئەو جۆرە کارانە دەکەن.... بەڵام ئەوان ناچارن بەو جۆرە کارە رازی بن، چونکە لێرە هیچ کارێکیان دەست ناکەوێت گەر مووچەکەی ٢٠٠٠ روپیەش بێت (چل دۆلار) لە مانگێکدا."

وەرگرتنی چەکدار لەلایەن کۆمپانیایێکی ئەمنی لە کارکامۆری - کۆچی سەر بە شاری کیرالای هیندستانی (کە زمانی ئینگلیزی لەو شوێنە بە شێوەیەکی بەربلاو بەکار دەهێنرێت) کۆتایی پێهات لە چوارچێوەی هەڵبژاردنی چەکدار و پاسەوان بۆ کۆمپانیایێکی کوێتی تایبەتمەند بە دابینکردنی کرێکار بۆ هێزەکانی ئەمەریکا لە کەنداو، لە بەرانبەر مووچەیەکی مانگانە لە نێوان ١٠٠٠ تا ٢٥٠٠ دۆلار، کە تێچووی گواستنەوەو خواردن‌و دابینکردنی شوێنیش دەگرێتەوە. ١٥١

لە فیجیەوە سەدان چەکدار بە سەرکردایەتی مەیجەر "کیلیڤی ڤاکاساڤاگ" بۆ کارکردن لەگەڵ کۆمپانیای "گلۆبەل ریسك" هاتوونەتە عێراق. وەکیلی بەکرێگرتنی چەکدارەکانی کۆمپانیاکە، کۆلۆنێلی یەکەم "ساکیوسە رایڤۆس" بە رۆژنامەیەکی نێوخۆیی فیجی راگەیاندبوو: " ئەو کارەی ئێستا لە عێراق زۆر لە ئەرکی پاراستنی ئاشتی لە لوبنان‌و سینای باشترە. چونکە لەو شوێنانە سەربازەکانمان لەبەرگەرماو لە شوێنی کراوە دەوەستان‌و بەردەوام رووبەرووی مەترسی دەبوونەوە. بەڵام لە عێراق بارودۆخەکە جیاوازە. بەوەی کەش‌و هەوای کارکردن گونجاوترە. بۆیە

خەڵکێکی زۆر داوای کاریان پێشکەش کردووە، چونکە ئەو کۆنە سەربازانە پێویستیان بە یارمەتی دانی خێزانەکانیان هەیە."

"ریتاندرا ناس شارما" شۆفێری تاکسی لە "نادی" یەکێکە لەو سەربازانەی کە لە کۆمپانیاکە وەرگیراون، دەیگوت: "دەزانم ئەو جۆرە کارانە مەترسی زۆریان هەیە، بەڵام هەرچیەك بێ گەر باشتر نەبێت، ئەوا هاوشێوەی بارودۆخی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەبێت. بۆیە پێم وایە ئەوە دەرفەتێکە هاتۆتە بەردەمم لە ژیانمدا." ١٥٢

## بەرزترین ئاستی نرخی خزمەتگوزاریە ئەمنیەکان لە بەریتانیاوە

رەنگبێ گرانترین و بەهادارترین گرێبەستیە ئەمنیەکان، گرێبەستی ئەو کۆمپانیانەیە کە لە بەریتانیاوە هاتوون. "دەیڤد کلاریج"، بەڕێوەبەری کارگێری کۆمپانیای "Janusian Security Risk Management"، لە لەندەن بە رۆژنامەی "شیکاگۆ تریبیۆن"ی گوت، مەعمیلەکان دەبێ پێشبینی ئەوە بکەن رۆژانە ١٠٠٠٠ دۆلار لە بەرانبەر خزمەتگوزاریەکانی چوار پاسەوانی چەکدارو دوو ئۆتۆمبێلی زرێپۆش بدەن. بۆیە هەندێ لە چەکدارەکانمان کرێی رۆژانەیان دەگاتە ٥٠٠-٢٠٠٠ دۆلار، کە بەند دەبێ بە جۆری ئەرك و کارامەیی کەسەکان.

ناوبراو لە روونکردنەوەکەیدا گوتی، پێکهاتەو سیستەمی ئەو کۆمپانیانە زۆر لە سوپا دەچێت- بەوەی کارمەندەکانیان بە پێی شارەزایی و راهێنانەکانیان پلەیان پێ دەدرێت. هەروەها گەرەستەی سەربازی وەك هەلیکۆبتەر لە جۆری "کیۆوا واریەر"یان هەیە، مەشقیش بە فڕۆکەوانەکان دەکەن لەسەر فڕین لە ئاسمانی عێراقدا. لە کۆتاییشدا چەند مانگێك بڵاودەکرێنەوە بۆ راهێنان لەسەر دامەزراندنی سەربازگەکان و کارکردنی رۆژانەش لەگەڵ سەرکردە سەربازیە ئەمریکیەکان لەو ناوچانەی کە شەڕو

ململانێی سەربازیان لێیە.

"جۆن داڤیدسۆن" بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی تری ئەمنی بەریتانیە بە نــاوی "Rubicon International" کــە لــە عێــراق کاردەکــات و گرێبەستیــشی لەگــەڵ "BP" و "Motorola" هەیــە، بــە رۆژنامــەی "سکۆتــسمان"ــی ڕاگەیانــد، ئــەوان پێیــان باشــە کۆنــە ســەربازەکانی هێــزە تایبەتیەکانی سوپای بــەریتانی SAS بــەکرێ بگــرن:" ســەربازەکانی هێــزی تایبەت مەشقی تەواویان وەرگرتووە و کەمتریش ناسراون و خۆڕاگریشن. بــە بێ دەنگی و بە هێمنیش مەسەلەکان چارەسەر دەکەن."

ئــەو چــەکدارانە ســاڵانە نزیکــەی ۲۵۰۰۰۰ دۆلار بەدەســت دێــنن - ســێ ئەوەندەی ئەو داهاتەی لە بەریتانیا بەدەستی دێنن- لە بەرانبەر پاسەوانی کردنیان بۆ پیاوانی کارو خاوەن بەرژەوەندیە ئەمریکیە تۆقیوەکان کە لە عێراق کار دەکەن. دروست بوونی ئەو هەلومەرجە لە عێراق و کرانەوەی بازاڕ، گەلێ جار قەیرانی بچووکی بۆ هێزە سەربازیەکانی بەریتانیا ناوەتەوە. لە دەرئەنجامێکی رۆژنامەی "سکۆتــسمان"ــدا هاتووە: یەك لەسەر شەشی سەربازەکانی SASو SBS (هێزە تایبەتیەکانی دەریاوانی) داوای دەست لە کار کێشانەوە دەکەن بەمەبەستی کارکردن لەگەڵ کۆمپانیا ئەمنیەکانی بەریتانی لە عێراق. بەمەش حکومەتی بەریتانی تووشی دڵەڕاوکێ بووە، چونکە تێچووی ڕاهێنانو مەشقپێدانی هەر یەك لەو سەربازانە دەگاتە سێ ملیۆن دۆلار. ۱۵۳

بە پاسەوانی کردنیان لە لایەن پاسەوانە چەکدارە ئەمنیە تایبەتەکان، پیاوانی کاری ئەوروپیو ئەمریکی دەیانتوانی بە ئارەزووی خۆیان بەم سەرو ئەو سەری وڵاتدا بگەڕێن، کە دواتریش بە هاتو چۆکردنی نافەرمی هەلپەرستەکانی شەڕ ناسرا: پێك هاتبوون لە ژمارەیەك ماشێنی تازەی جۆری GMC سۆبەربان بلایزەری ڕەنگ سپی.

## بەرچاو، رێکخراوو کاریگەر

بەلاَم کۆمپانیا ئەمنیە تایبەتیەکان لە عێراق، زیاترن لەوەی کە تەنیا پاسەوانی ئەمنی بن لە نێو ماشێنی بەرزی زرێپۆش. دوای چەند رۆژێك لە داگیرکردنەکە، کاربەدەستێکی نەناسراو لە پێنتاگۆن بە " نیویۆرك تایمز"ی راگەیاند، ئەوان بە دوای شتێکدا دەگەڕێن زۆر کاراتر بێت لە هێزەکانی ئاشتی پارێزی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆئەوەی لە دوای رووخانی رژێمی سەدام بتوانێت ئەمنیەتی عێراق رابگرێت. کە دەیگوت: "ئێمە دەزانین پێویستیمان بە هێزێك هەیە، یەکگرتوو ترو زۆر کاریگەرترو دەسکراوەتریش بێتو بەرپرسیارێتیەکی ئەوتۆشی نەکەوێتە ئەستۆ." ١٥٤

لە ٧ نیسانی ٢٠٠٣، دوو رۆژ بەر لەوەی عێراق بە رەسمی "ئازاد بکرێت"، زانیارییەکم لەلایەن سەرچاوەیەکی نەناسراوەوە پێ گەیشت، بەوەی کۆمپانیایەکی ئەمنی بە ناوی "دایان کۆرپ" پێویستی بە چەند راهێنەرێکی لێزانی پۆلیس هەیە. کاتێکیش پەیوەندیم کرد بەو ژمارە تەلەفونەی کە لە زانیاریەکەدا هاتبوو، لایەنەکەی تری پەیوەندیەکە دەرچوو شوێنەکەی لە ناوچەی فۆرس وۆرسی ویلایەتی تەکساس بوو. ئەو شوێنەی کە چەکدارە وەرگیراوەکان وەلاَمی تەلەفونەکانیان دەدایەوە. کە کەسێك بە ناوی "هۆمەر نیومان" چەکدارێکی وەرگیراوی "Dyncorp" پێی گوتم: "هەر کە ئەوێ ترسی لێ نەما، دەسبەجێ دەچین، بۆ ئەوەش سەیری CNN بکە، گەر حەزیشت کرد کارمان لەگەڵدا بکەیت، ئەوا سەربوردەی ژیانی خۆتمان لە رێی فاکسەوە بۆ بنێرە." ١٥٥

ناوبراو ناونیشانی وێب سایتی کۆمپانیاکەشی پێ دام: (www.police-mission.com/iraq.asp)، لە رێیەوە زانیم کۆمپانیاکە بە دوای "کەسانێك دەگەڕێت کە خاوەنی شارەزاییەکی گونجاو بن

بـۆ بەشـداریکردن لـە هـەوڵێکی نێودەوڵـەتی بـۆ دووبـارە پێکهێنانـەوەی دەزگاکانی پۆلیس، دادوەری و بەندیخانـەکان لە دوای کۆتـایی هـاتنی جـەنگ لـە عێراقـدا." هـەروەها لـە سایتەکەدا هـاتبوو "کۆمپانیاکـە پێویـستی بـە خزمـەتگوزاری سـەربازی کـارا یـان پۆلیـسی تـازە خانەنـشین کـراو یـاخود پاسەوانی بەندیخانەکان هەیە، لەگەڵ پسپۆری شارەزاش لە بواری دادوەری." لـە کۆتاییـشدا، سـەرنجێك هـەبوو: "داواکـار پێویـستە هـەڵگری رەگەزنامـەی ئـەمریکی بێـت و مـاوەی دە سـاڵیش لـە ریـزی هێزەکـانی نێوخـۆیی کـاری کردبێت."

دەسبەجێ، پەیوەندیم کرد بە " تـشاك ویلکنس" وتەبێژی کۆمپانیـای نـاوبراو لـە ڤێرجینیـا، بـۆ ئـەوەی پرسـیاری لێ بکـەم ئـاخۆ کۆمپانیاکـە گرێبەسـتیەکەی بەدەسـت هێنـاوە یـان نـا؟ بـەڵام وەڵامەکـەی زۆر کـورت و پوخت بوو، کە گوتی: " هێشتا گرێبەستیەکە بەدەست نـەهاتووە." ١٥٦ دوای دە رۆژ لە پەیوەندیە تەلەفونیەکەم، کۆمپانیاکە گرێبەستی مەشق پێکردنـی پۆلیسی بەدەست هێنا ١٥٧. لەوەدەچوو کۆمپانیاکە زانیبێتـی گرێبەسـتیەکە دەسـەبەر دەکـات- چـونکە ئـەو کۆمپانیایـە چـەندین سـاڵ بـوو لـە کوێـت بـۆ دابینکردنـی پاسـەوانی چـەکدار، گرێبەسـتیان لەگـەڵ سـوپای ئـەمریکی هەبوو.١٥٨

## قسەو قسەڵۆك سەبارەت بە پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و فریودان

کۆمپانیـای"دایـان کـۆرپ" شـارەزاییو باکگراونـدێکی زۆری هەیـە لـە دابینکـردنو بـەکرێگرتنی پـۆلیسو چـەکدار لـەو شـوێنانەی ململانێـی چـەکداریان لێیـە: بـەوەی لـە بۆسـنە چـەکدارەکانی کۆمپانیاکـە، کرۆکـی هێزەکانی پۆلیسی ئەوێیان پێك هێنابوو. هەروەها بەشێك بوون لـە یەکـەی

پاسەوانی سەرۆکی ئەفغانی "حامد کەرەزای"، لە کۆلۆمبیاش فڕۆکەو فڕۆکەوانەکانی کۆمپانیای ناوبراو بە سەر دارستانەکانی ئەو وڵاتەدا دەگەڕان بە دوای کێڵگەکانی "کۆکا" بە مەبەستی رشاندنی ماددەی کیمیایی بەسەر کێڵگەکانی ماددە هۆشبەرەکانو لەناوبردنیان. لە ئەمریکاش "دایان کۆرپ" ئەرکی چاودێری کردنی سنووری مەکسیکیان خرابووە ئەستۆ. کۆمپانیاکە سەرپەرشتی گەڵ لە تاقیکردنەوەکانی جۆرەها چەكو تەقەمەنی پێنتاگۆنی دەکردو هەروەها ئەزموونکردنی گشت تاقمەکانی فڕۆکەو هەلیکۆپتەرەکانی سەرۆکایەتی، لەگەڵ پێداچوونەوەی هەموو ئەو رێو شوێنە ئەمنیانەی تایبەت بە سەربازو کارمەندە مەدەنیەکانی هێزی دەریاوانیش. ١٥٩

کۆمپانیای ناوبراو ساڵی ١٩٦٠ دامەزراوە، وەکو پرۆژەیەك لەلایەن دەستەیەك فڕۆکەوانی دەرچوو لە شەڕی دووەمی جیهانیدا کە لە رێی پەیوەندیەکانیانەوە لەگەڵ سوپا سەرقاڵی دامەزراندنی سەرچاوەیەکی بژێویی بوون لە رێی گواستنەوەی کەلوپەل لە رێی هێڵی ئاسمانیەوە. ناویان نا کۆمپانیای فڕۆکەوانی کالیفۆرنیای رۆژهەڵات، ئەو کۆمپانیا تازە دامەزراوە زوو دەستی بە دانانی پردێکی ئاسمانی کرد بۆ گەیاندنی پێداویستی سەربازی بۆ ئاسیا لە میانەی شەڕی کۆریا. لە ساڵی ٢٠٠٢ "دایان کۆرپ" کە بنکە سەرەکیەکەی دەکەوێتە رێستۆن لە ڤێرجینیا، ریزبەندی سێزدەهەمین کۆمپانیای وەرگرت لە نێو گەورەترین کۆمپانیاکان لە ئەمریکا، داهاتەکەشی گەیشتە ٢,٣ ملیار دۆلار. لە هەمان ئەو هەفتەیەی کە پۆستەکانی عێراق راگەیەنران، لە بەرانبەر نزیکەی یەك ملیار دۆلار، لەگەڵ کۆمپانیای "El Segundo" - کۆمپانیایێکی تایبەتە بە خزمەتگوزاری تەکنەلۆژی، لە کالیفۆرنیا- یەکیان گرت. ١٦٠

وەکو پێشوتریش ئاماژەم پێدا، کۆمپانیاکە هەرگیز بەدوور نەبوو لە

مشت و مڕ. له چوارچێوەی گرێبەستەکەی "پلانی کۆلۆمبیا" ۸۸ فڕۆکە و ۳۰۷ کارمەندی هەبوو - کە ۱۳۹یان ئەمریکی بوون- ئەرکەکەیان بریتی بوو لە لەناوبردنی کێڵگەکانی کۆکا لە کۆلۆمبیا. گۆڤاری- Soldier of Fortune سەربازی سامان- راپۆرتێکی دوور و درێژی بە ناوی - Colombia`s Coke-Bustin Broncos- ئەسپە ئەمریکیە لەناوبەرەکانی کۆکای کۆلۆمبیا- بڵاوکردەوە. ۱٦۱ وەك سەرنج دەربڕینێکیش، "جانیس شاکاوەسکی" نوێنەری ئیلینۆی لە لیستی دیموکراتەکان بە گۆڤاری " Wired" راگەیاند، بەکرێگرتنی کۆمپانیایێکی تایبەت، بۆ ئەوەی رووبەڕووی چەند ئەرکێکی جەنگی ببێتەوە، مانای گەڕانە بە دوای گرفت. بۆیە دەڵێت: " کارمەندەکانی "دایان کۆرپ" پێشینەیەکیان هەیە لە هەڵسوکەوت کردن وەك کاوبۆی. جا ئایا مەبەستی سوپای ئەمریکی لە بەتایبەت کردنی ئەرکە سەربازیەکانی، خۆدزینەوەیە لە مشت و مڕو لێپێچینەوەی رای گشتی، یان خۆلادانە لە شەرمەزار بوون- بۆ شاردنەوەی تەرمی سەربازە کوژراوەکان لەبەرچاوی میدیاکان‌و پەردەپۆشکردنی سوپاش لە بەرچاوی رای گشتی؟". ۱٦۲

بێگومان لە ئەیلولی ۲۰۰۱، ژمارەیەك لە جوتیارە ئێکوادۆریەکان، داوایەکیان لە دژی "دایان کۆرپ" بەرزکردەوە، بەوەی کۆمپانیای ناوبراو لە کاتی رشاندنی ماددەی کیمیایی بە سەر کێڵگەکانی مادده هۆشبەرەکان لە کۆلۆمبیا، زەرەر و زیانی بەو زەویە کشتوکاڵیانەی کە لە نزیك سنوورن گەیاندووە و بەروبوومەکانیانی لە ناو بردووە، هەروەها بۆتە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لە نێو مرۆڤ و ئاژەڵە ماڵداریەکانیش. لە هەندێ حاڵەتیشدا، بۆتە هۆی مردنی منداڵ. "راند بییرس" یاریدەدەری وەزیری دەرەوە، بە مەبەستی راگرتنی داواکەو رەتکردنەوەی تۆمەتەکان، دەسبەجێ هاتە ناو کێشەکە و بەو دادوەرەی کە داواکەی چووە بەردەم گوت:

"مەترسیەکی زۆر لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی و سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا هەیە."

لەوەش زیاتر، "کاسرین بۆلکۆڤاك" چاودێر لە هێزەکانی پۆلیسی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، لە ساڵی ۲۰۰۱ لە بەریتانیا داوایەکی دژ بە کۆمپانیاکە بەرزکردەوە بۆ ناڕەزایی دەربڕین لە بەرانبەر لادانی لەسەر کارەکەی بە شێوەیەکی ناڕەوا، دوای ئەوەی راپۆرتی لەسەر راهێنەرەکانی پۆلیس کە سەر بە دایان کۆرپ بوون لە بۆسنیا بەرزکردبۆوە بەوەی پارەیان بۆ ئەنجامدانی کاری سێکسی خەرج کردووە و مامەڵە و کڕین و فرۆشتنیشیان بە ئافرەتەکان کردووە. دوابەدوای ئەو راپۆرتانەش گەلێ لە کارمەندەکانی کۆمپانیاکە لەبەر گومان لێکردن لەسەر ئەنجامدانی کردەوەی نایاسایی ناچار کران دەست لە کار بکێشنەوە. بەڵام هیچ یەکێکیان نەدرانە دادگا، چونکە ناوبراوان (حصانە)یان هەبوو لە بۆسنیا.

ساڵێکیش بەر لەو رووداوانەی لەسەرەوە ئاماژەیان پێدرا، "بێن جۆنستۆن" ئەندازیاری فرۆکەوانی تایبەتمەند بە هەلیکۆپتەرەکان لە جۆری (ئاپاتشی) و (بلاك ۆك) لە کۆمپانیای"دایان کۆرپ"لە کۆسۆڤۆ، داوایەکی لە دژی خاوەن کارەکەی بەرز کردەوە. لە داواکەدا هاتبوو کەوا لە کۆتایەکانی ۱۹۹۹دا " جۆنستۆن زانیبووی کەوا کارمەند و بەرپرسەکانی دایان کۆرپ دەستیان لە چەند هەڵسوکەوتێکی لادەرانە و نامرۆڤانە و نایاسایی هەبووە بە شێوەیەکی نایاساییش هەڵساون بە کڕینی چەك و ئافرەت و پاسەپۆرتی ساختە، لەگەڵ بەشداریکردنیان لە کردەوەی تری دوور لە ئاکار." داواکە دەیگوت: "جۆنستۆن، بە چاوی خۆی کردارەکانی کڕین و فرۆشتنی ئافرەتی بینیووە کە هاوکار و سەرپەرشتەکانی تەنیا بۆ خۆشی و رابواردنی خۆیان ئەنجامیان دەدا. هەروەها شانازی کردنیان بە جۆرایەتی لە رووی تەمەن و بەهرەمەندی کۆیلەکانی کە کڕیویانن." ناوبراو بە گۆڤاری "Insight"

گوت: "دایان کۆرپ تا بڵێی لە بێ ئەخلاقیدا بێ وێنەیە، تا بۆشی بکرێت یاساو سنوورەکان دەشکێنێت."

هەروەها کۆمپانیاکەشی بەوە تۆمەتبار دەکرد کە پارەیەکی زیاتری خستۆتە سەر ئەستۆی سوپا بۆ کردارەکانی چاککردنەوەی ناپێویست و زێدەڕۆیی کردنیش لە مووچەدا: "ئەوەی لە بۆسنیەدا دەگوترا ئەوەبوو کەوا دایان کۆرپ تەنیا پێویستی بە جەستەیەکی زیندوو هەیە- ئەوە دروشمی کۆمپانیاکەیە. چونکە گەر رۆژانە هەشت کاتژمێریش کارنەکەیت، ئەوا خۆیان لە جیاتی تۆ ئیمزای دەکەن، بەو جۆرەش پارە لە حکومەت وەردەگرن. کارەکانیان سەرلەبەر فێڵ کردن و ساختەبازییە." ١٦٢

## ئێمە فرمان دەردەکەین و ئێوەش جێبەجێی دەکەن

"دایان کۆرپ" تێکەڵەیەك لەو پۆلیسە ئاساییانەی ئەمریکای راکێشابوو، ئەوانەی بەدوای دەرفەتدا دەگەڕان بۆ زیادکردنی داهاتەکانیان، بە هەمان شێوەش ژمارەیەکی کەم لە خوێنەرەکانی گۆڤاری "سەربازی سامان" ئەوانەی شانازییان بە جوامێربوونی خۆیان دەکرد و فیزیان لێدەدا کاتێك کە لە جادەکانی عێراق دەگەڕان و چاویلکەی لە جۆری Okley لە چاو و هەروەها سەرپۆشی (خوژە)ـی سەربازی لە جۆری Kevlar دیسانەوە ئێلەگی گوللە نەبڕیشیان لەبەر دابوو، خۆیان بە خاوەنی شوێنەکە دەزانی.

بێلایەنترین و وردترین وەسفکردنی کارمەندەکانی دایان کۆرپ لەلایەن "تاکەر کارلسۆن" رۆژنامەنووس لە گۆڤاری Esquire، کراوە، کە لە مانگی کانوونی یەکەمدا بۆ ماوەی دوو هەفتە لەگەڵ تیمێکی سەر بە کۆمپانیاکە گەشتی دەکرد، بەوەی بە درێژایی گەشتەکەی چەندین بەسەرهات و کردەوەی بێزارکەری دەبینی:

لە باشووری شاری ناسریەدا بۆ تێکردنی بەنزین وەستاین. بە

هۆی ئەو دزین و تالآنکردنەشی کە بۆڕیە نەوتیەکانی گرتبۆوە، هەروەها هێنانی ژمارەیەکی زۆری ئۆتۆمبێلی تازەش بۆ ناو وڵات (کە بە زیاتر لە سێ سەد هەزار ماشێن دەخەمڵێنرا لەوەتەی دەسپێکردنی شەڕ)، هەر وێستگەیەکی بەنزینیش تەنیا یەك بۆڕی بۆ راکێشرابوو. کە هەندێکیان درێژیەکەی لە میلێك زیاتر بوو. خەڵکی چەندین رۆژ سەرەیان دەگرت و شەو لای ماشێنەکانیان دەمانەوە تاوەکو نۆرەیان دەهات بۆ پڕکردنی تانکی ئۆتۆمبێلەکانیان. بەهۆی ئەو قەرەباڵغیەش نەدەکرا لە سەرەکان بوەستین چونکە وەستان لە یەك شوێن بە ئاشکرایی بۆ ماوەیەکی درێژ مەترسیدار بوو، بۆیە وێستگەکەمان داگیرکرد.

بە هەر چوار ئۆتۆمبێلکەو بە خێراییەکی زۆر چووینە نێو وێستگەکە. دوو لە چەکدارەکان چوونە لای ماتۆڕو سۆندەکانی بەنزین‌و دووەکەی تریش رێگەیان لە هاتنە ژوورەوەی ریزی ئۆتۆمبێلە وەستاوەکان گرت. چەکدارەکانیش لە ماشێنەکان دابەزین‌و بڵاوەیان کرد بۆ نەهێشتنی هاتنە ژوورەوەی ئۆتۆمبێلی تر. هەندێکی تریش لە دەوری ماتۆڕەکانی بەنزین وەستان. "کێلی" کە یەکێك بوو لە چەکدارەکان بە چاوی ئاماژەی بۆ کردم تفەنگەکەم ببەم و بچم بۆ چاودێری کردنی دیواری دواوەی وێستگەکە. لەو کاتەدا خەڵکێکی زۆر لە دەورمان کۆببونەوە، بارو دۆخێکی زۆر گرژ بوو.

بێگومان ئێمە لە پڕێکەوە هەڵمان کۆتایە سەریان‌و نۆرەو سرەکانی ئەوانمان بۆ خۆمان بردو ئاماژەیەکیش بوو بۆ ئەوەی بیریان بخەینەوە کەوا بە هێزی چەك دەتوانین ئەوەی بمانەوێت بیکەین، دەیکەین‌و ئەوانی تریش لەسەریانە بێ دەنگ بن و قەبوڵی بکەن. ١٦٤

دواتر ناوبراو وەسفی چەند بەڵێندەرێکی ناپەسەند دەکات کە چاوی پێیان کەوتووە:

لە عێراق خەڵکێکی مەدەنی چەکیان لە دەستە کە نابێت لە دەستیان بێت، هەندێکیان بە ئاسانی کێشە دروست دەکەن. جارێکیان درەنگە شەوانێك بۆ پیاسە چوومە دەرەوەی هۆتێلی" گاردینیا" کە پێشتر فەرمانگە بوو. منو "کێلی" لەو بەر شەقام لە دەرەوەی خانوێك وەستاین، منیش چووم بۆ ئەوەی بزانم کەس هەیە جلو بەرگەکانم بشوات. لەوێ کەسێکی بەریتانی لە ناوەڕاستی تەمەنیدا بوو وەستابوو. وتی ناوم "ریتشارد"ە، ئەندامێکی پێشووی ۲۲هەمینی SAS بوو. تفەنگێکی بەشانیەوە هەڵواسیبووو لە کاتی قسەکردنیشیدا لیکی لە دەمەوە دەهات چونکە سەرخۆش بوو، کاتێکیش گوێی لە قسەکردنی من بوو، کەوتە قسەکردن بە زاری (لەهجەی) ئەمریکی و گوتی: " لەگەڵ من وەرە هەی ئەمریکیە قۆزەکە، بۆ شوێنێکت دەبەم کە هەرگیز نەتبینیوە." منیش پرسیم وەکو کوێ دەبێت؟ خەریك بوو پێم بڵێت، بەلام وەستاو لێم نزیك بۆوە بە جۆرێك کە هەناسەی بۆ دەم و چاوم دەهات و لێمی پرسی: "تۆ ئایەرلەندی نیت، وا نیە؟" منیش گوتم نەخێر. ئینجا دەستی خستەسەر شانمو گوتی: "پیاوێکی باشی". ناوبراو لە "ئولەستەر" خەڵکێکی زۆری ئایەرلەندی کوشتبوو. بۆیە حەزی نەدەکرد ئایرلەندیەکی تریش بکوژێت.

دوای نزیکەی دە رۆژی تر عێراقم جێهێشت، دواتر زانیم کەوا ریتشارد سێ گوللەی بە کەسێکەوە ناوە کە دەبوایە پاسەوانی بکردبوایە، لەوە دەچوو بەهەڵە ئەو کارەی کردبێت، وا دیار بوو لە بیری چوبوو تفەنگەکەی لەسەر حاڵەتی تۆماتیکی لابداتو دەستی بە

پەلاپیتکەکە کەتووە و تەقیوە. کەسەکە نەمرد، ریتشاردیش لە کارەکەی دەرکراو لەئەنجامدا چیتر نەگەڕایەوە ریزی SAS. ١٦٥

( بەڵێندەرە ئەمنیەکان خاوەن کارێکن کە هەمان دەرفەتیان هەیە، کەچی "دێریك ویلیام ئادجی" سەربازی مارینزی شاهانە لە بەلفاست، کە بۆ ماوەی چوار ساڵ زیندانی کرابوو لەبەر یارمەتی دانی خەباتگێرە ئایرلەندیەکان لە "ئولستەر"، لەلایەن کۆمپانیایەکی ئەمنیەوە گرێبەستی لەگەڵدا کرابوو بۆ پاسەوانی کردنی کارمەندەکانی بەکتل. کاتێکیش کەوا رۆژنامەی "بەلفاست تێلیگراف" وردەکاری دەربارەی رابردووەکەی بلاوکردبۆوە، دەسبەجێ بەکتل گرێبەستیەکەی وەستاند.) ١٦٦

وەکو چۆن کارلسۆن دەڵێت، هەندێ جار چەکدارەکانی دایان کۆرپ زۆر بە سانایی بە دەستی خۆیان یاسایان جێبەجێ دەکرد:

لە شەوێکی کانوونی یەکەمدا، دوو لە چەکدارەکانی کۆمپانیاکە داواکراوێکیان لە دەوروبەری هۆتێلی "بەغداد"دەسگیر کرد، بە پێی وتەی چەند گەواهیدەرێك ئەو کەسە چەندین منداڵی رفانبوو، هەوڵیشی دەدا بیانفرۆشێتەوە. دوو چەکدارەکە هەموو گیانی دەسگیر کراوەکەیان نقوومی خوێن کرد، بەر لەوەی رادەستی پۆلیسی عێراقی بکەن. هەردووکیان رۆژی دواتر لەسەر نانخواردنی بەیانی ئەو بەسەرهاتەیان بۆ گێرامەوە لە سیماشیان دیاربوو کەوا بەو کارە دڵخۆش بوونە... بۆچی نا، چەکدارەکان هەموو کاتێك لە مەزاجێکی باشدا نابن!! بێ ئەوەی هیچ کەس دەرك بکات ئەوان ئامانجی خۆیان بە دەست دێنن. هەفتەیەکیش بەر لە گەیشتنم، ئەکتەری ناوداری ئەمریکی "شۆن پێن" بۆ نوێنەرایەتی کردنی رۆژنامەی " سان فرانسیسکۆ کرۆنیکەڵ" گەیشتە عێراق. کاتێك ناوبراو لە ناوەڕاستی بەغدا بە نیاز بوو لە ماشێنەکەی دابەزێت، دەستەیەك لە

چەکدارەکانی کۆمپانیاکە بۆ پشکنین وەستاندیان، چەکدارەکان لە رووی سیاسیەوە هاوڕا نەبوون لەگەڵ شۆن پین، سەرەڕای ئەوەش هاتنی ناوبراویان بەلاوە قەبوڵ نەبوو بۆ کاری رۆژنامەوانی، بۆیە کامێراکەیان لێ سەند و بۆ ماوەی چل و پێنج خولەك لەبەر باران رایانگرت، بە بیانوی سەرقاڵ بوونیان بە پشکنینێکی وردی ئامێرو کەلوپەلەکانی. کە نەیتوانی هیچ شتێك بکات، ئەوان چەکدار بوون ئەویش بێ چەك بوو. تەنیا بێ بەختیەك بوو بۆ ئەو. ١٦٧

## ترس، پەستیانی کردبوو

بارودۆخەکە بە خێرایی گۆڕانکاری بە سەردا دەهات. لە نیسانی ٢٠٠٤ سەردانێکی بەغدام کرد، رێك دوو هەفتە دوای رووداوی لە سێدارەدان و سوتاندنی چوار لە کارمەندەکانی "بلاك وۆتەر" لە فەللوجە. بۆیە بارودۆخەکە بە بەراورد لەگەڵ سەردانەکەی پێشوترم لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣ مەترسیدارتر بوو. کاروانی رۆژانەی ئەو چەکدارانەی کەوا ئێلەگی زرێپۆش و سەرپۆشی سەربازیان لە بەردابوو، کە هەموو بەیانیەك لە دەوروبەری شیراتۆن دەیانم بینی، بەڵگە بوو لەسەر ئەو گۆڕانکاریانە. هەرکە عێراقیەکانیش دەستیان کرد بە هێرشکردن بۆ سەر ئەو بەڵێندەرە ئەمنیانە، ئەو چەکدارانەی کەوا شانازیان بە پیاوەتی خۆیان دەکرد، حەپەسان و لە ناکاو دیار نەمان. ئیتر لە پڕێکدا هەموو خۆدەرخستن و خۆ فشکردنەوەکان جارێکی تر نەبینرانەوە.

"رۆجەر کارپێنتەر" یەکێکە لە چەکدارەکانی دایان کۆرپ کە خەڵکی کەنساس بوو، لە ١٧ ئاداری ٢٠٠٤ گەیشتبووە عێراق، بۆ ئەوەی پۆلیسی عێراقی و چەکدارەکانی کۆمپانیە ئەمنیەکان فێری تەکنیکەکانی بەرگری لە خۆکردن و شەڕ بکات. ناوبراو دوای مانگێك لە گەیشتنی بۆ عێراق،

رۆژنامـــەی Wichita Eagle کـــە لـــە شـــارەکەی خـــۆی دەردەچـــێت، چـاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا کردبـوو، لـەو چاوپێکەوتنەدا دەیگـوت، کـەوا لـە هۆتێلی ئەلسەدیر لە بەغدا نەچۆتە دەرەوە، کە دەورە درابـوو بـە تەلـدڕ و کۆسپی کۆنکرێتی و چەکداری ئامادەباش، وەکو چۆن دەڵێت:"ئـیتر ئـەوێ لـە هۆتێل نەدەچوو زیاتر لە قەڵایەکی پارێزراو دەچوو." ١٦٨

وەسـفێکی تـر لەلایـەن ئەندازیارێکـەوە کـرا کـە لـە شـارێکی باشـووری عێراق کاری دەکرد، بـەم جۆرە باسـی بەڵێنـەرەکانی دایـان کـۆرپ دەکـات: " ئــەوان بــریتین لــە دەســتەیەکی بــێ متمانــەو ترســنۆك‌و ماشێنەکانیــشیان شێتانە لێ دەخوڕی. کە پاسەوانی کارمەندەکانی {نـاوی کۆمپانیاکـە لادراوە} دەکرد لە نێو کەمپێکدا بێ ئەوەی بچنە شوێنی تر، تا دەتوانین بگەینـە ئـەو ئەنجامـەی کـە چـۆن لـە کـاتی هـاتو چـۆکانیاندا، ئـەو کاروانانــەی ماشـێنە ئەمنیەکان بە خێرایی بە ڕێگاوە دەڕۆن و بەردەوام خەڵکی بێـزار دەکـەن تـا دەگاتە ئەو رادەیەی هەموو کەسێك بکوژن. دایان کۆرپ پلە یەکی بە دەست هێناوە لە ناکارامەیی کارمەندەکانی. پەستم بـە بینینیـان لێرە، هەرچـەندە کـە ژمارەیـەکی کـەمیان مرۆڤـی باشـن بـەڵام ئـەوان تـەنیا ماوەیـەکی کـەم دەمێننەوە." ١٦٩

## کورد لە دژی عەرەب

لەگـەڵ هـاتنی نیـسانی ٢٠٠٤، یادکردنـەوەی ئـازادکردنی عێـراق، دایـان کـۆرپ تـەنیا کۆمپانیـا نـەبوو کـە بێتـە عێـراق. کۆمپانیـایێکی تـری ئـەمنی باشووری ئـەفریقیا بـە نـاوی " ئێـرینیس" سەرپەرشـتی دووەم گـەورەترین پــرۆژەی راهێنــان‌و مەشــق پێکردنــی لــە وڵاتەکــە دەکــرد، بــە مەبەســتی دروستکردنی هێزی ئەمنی تایبەت بە پاراستنی بۆڕی‌و پاڵاوگە نەوتیەکانی.

سەردانێکی پاڵاوگەیەکی سەرەکی نەوتم کرد لە بەغدا، ئەو شوێنەی کە

لە زۆربەی ناوچەکانی شارەکە دەناسرێتەوە بە هۆی ئەو بڵێسە ئاگرە پرتەقاڵیەی بەردەوام لە لوتکەی تاوەری پاڵاوگەکە بە رۆژو شەو هەڵگیرساوە. لە دەرەوەش پاسەوانە عێراقیەکان بە چەكو جل‌وبەرگە شینە بریقەدارەکانیان کە لەلایەن Cartierـەوە بۆیان دراوە، وەستاون بۆ دوورخستنەوەی کەسانی فزولی. "ئەمیر جاجو" یەکێك بوو لە پاسەوانەکان‌و دوو هێڵی زەردیشی لەسەر شانی بەسترابوو، کە دروشمی کۆمپانیای "ئێرینیس" بوو، ئاماژەی بۆ کردم تا دووربکەومەوەو پێی گوتم: "ببورە دەبێ مۆڵەت لە وەزارەتی نەوت بێنی."

بەلاّم من مۆڵەتم پێبوو بۆیە بەرەو دەرگا سەرەکیەکە چووم و لەلایەن "دەسار ئەلقەساب"بەڕێوەبەری پاڵاوگەکە بەخێرهاتنم لێکرا. ناوبراو پێی گوتم کاتێك لە نیسانی ۲۰۰۳ ئەمریکیەکان هاتنە نێو بەغدا، دەسبەجێ چەکم بەسەر کارمەندەکان دابەش کرد تاکو پاڵاوگەکە لە دزین و تالاّن بپارێزم، ناوبراو بەردەوام دەبێت و دەڵێت:

کاتێك کە سوپای ئەمریکی هاتنە ناوشار، چووم لەگەڵ سەرکردەکەیان قسەم کردو پێم گوت: "ئێستا پاڵاوگەکە لە ئەستۆی تۆ دایە، بۆیە دەبێ پاریزگاری لێ بکەیت." کەچی ئەو گوتی: "ئەوە ئەرکی من نیە، من کاری ترم هەیە دەبێ ئەنجامی بدەم، ئەرکی من تەنیا ئەنجامدانی پشکنین‌و گەڕانە." بۆیە منیش گوتم: "ئێرە ناوچەیەکی مەترسیدارە، گەر پارێزگاری لێ نەکەیت ئەوا دڵنیابە کەوا تالاّن چیەکان پاڵاوگەکە دەسوتێنن، ئێرە ملیۆنەها لیتر هایدرۆکاربۆن‌و هەزارەها ماددەی کیمیایی لێیە، بۆیە گەر بسوتێندرێ ئەوا دەبێ نیوەی شاری بەغدا چۆڵ بکرێت." ۱۷۰

دەزگاکانی تری نەوت لە باکوور و باشووری عێراق بەو شێوەیە پارێزگاریان لێ نەکرابوو- بۆڕیە نەوتیەکان و نووسینگەکان لە باکوور و

باشووری عێراق بەردەوام لەلایەن تالآن چیەکانەوە دەکرانە ئامانج، بەلآم لەگەڵ گرێبەستیەکەی کۆمپانیای "ئێرینیس"و مەشقپێکردنی بۆ چل هەزار پاسەوان لەسەرتاسەری ولآت کردارەکانی تالآن و دزین کەمبوونەوە.

لەسەردانێکیشمدا بۆ کێڵگە نەوتیەکانی کەرکوك لە باکووری عێراقدا، چاوم بە یەکێك لە پاسەوانەکانی "ئێرنیس" کەوت کە ناوی "مامەند کەسنەزانی" بوو. ناوبراو سۆفیەکی کورد و پێشمەرگەیەکی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی بوو کە لەلایەن جەلال تاڵەبانیەوە سەرکردایەتی دەکرا (لە زمانی کوردیدا مانای ئامادە بوون بۆ مەرگ - ئەو ناوە لەلایەن کوردەکان رەواجی هەبوو بە تایبەت ئەوانەی دەیان ساڵ بوو خەباتیان دەکرد لە دژی سوپای سەدام حوسێن لە باکووری عێراقدا). کەسنەزانی لە جیاتی پۆشاکی شین، کورتەك‌و شەرواڵ لەگەڵ جەمەدانی دەپۆشی.

ناوبراو دەیگوت: "ئەو ساڵ گەڵ سەرکردەم هەبووە، یەکەمیان یەکێتی بوو، دواتر کۆمپانیای "کیلۆگ براون ئەند روت"ی ئەمریکی هاتن. ئێستاش کۆمپانیایێکی بەریتانی هاتووە کە ناوی "ئێرینیس"ە، بەلآم گرنگ نیە کێ دێت و کێ دەڕوات، گرنگ ئەوەیە پارێزگاری لە نەوتەکە بکەین، گەر پارەشمان پێ بدەن ئەوا باشتریشە." ١٧١

کاری ئەمنی لەو جۆرە لە کێڵگە نەوتیەکانی باکوور لە رووی تیۆریەوە بۆ گشت عێراقیەك کراوەیە، بەلآم نزیکەی ٩٥٪ کارمەندەکانی خاڵەکانی پشکنین پێشمەرگەن، چونکە دەسەلآتی هاوپەیمانەکان متمانە بە عەرەبەکان ناکەن، ئەوەش جۆرێك لە دلگرانی لەلای ئەو نەتەوانەی کە کورد نین دروست کردووە. پەیامنێری هەواڵەکانی یەکێك لە وێستگە رادیۆییە ئازادەکان لێدوانی لەگەڵ گرووپێکی بێ کار لە کۆنە سەربازەکانی گەرەکێکی کۆنی هەژارنشینی شیعەکان لە کەرکوك ئەنجام دابوو، کە دوای نیوەڕۆیان بە چا خواردنەوە کاتیان بە سەر دەبرد. یەکێك لەوانە کە ناوی "ئیبراهیم ئەلجبوری" بوو تەمەن چل و سێ ساڵ، دەیگوت: "چووم بۆ لای

هاوپەیمانــەکان (دەســەڵاتی داگیرکــەر) بــۆ ئــەوەی داوا پێــشکەش بکــەم بــۆ کارکردن لەگەڵ کۆمپانیایێکی ئەمنی. من بە درێژایی ژیانم سەرباز بوومـە و بە تەواوەتیش دژی تیرۆریستەکانم، کەچی ئەوان گوتیـان کارمـان لا دەست ناکـەوێت. دواتـریش بینـیم ئەوانـەی لـە کۆمپانیـا ئەمنیـەکان کـار دەکـەن هەموویان کوردن." ١٧٣

بــەرزترین ئاســتی مووچــە و ڕۆژانــەی پاســەوانە کوردەکــانی کێڵگــە نەوتیـەکان بـە پێـی پلـەداری دەگۆڕێـت کـە دەگاتـە ١٢٠ دۆلار لـە مانگێکـدا، ئەویش بە حاڵێـك بەشی بـژێویان دەکات. گـەر بـەراوردیش بکرێـت لەگـەڵ مووچەی سەرپەرشتەکانیان کە زۆربەیان خەڵکی باشووری ئـەفریقیان ئـەوا دەگاتە ٥٠٠٠ دۆلار لە مانگێکدا.

## باشوورە ئەفریقاییەکان

بە هەمان شێوەی دایان کۆرپ، کۆمپانیای "ئێرینیس"ـیش مێژوویـەکی ناشرینی هەبوو. وێب سایتەکەشی وەسفی "بەڕێوەبەرایـەتی شارەزاییەکان" دەکــات لــە دابینکردنــی خزمــەتگوزاری ئــەمنی بــۆ دەیــەها کۆمپانیــای نێودەوڵەتی وەك "Ashanti Gold" و "BP-Amoco" دابین کردووە.

لە ئابی ٢٠٠٣، دەزگای (واسە) بۆ ئەوانەی تووشی نالەباری تەندروستی بوونە لە ئەنجامی کارکردنیان لـە کانـەکان (WACAM) کـە ڕێکخراوێکی ناحکومی غانابیە، ڕاپۆرتێکی بلاّوکردەوە تیایدا هاتبوو کـەوا کارمەنـدەکانی "ئێـرینیس" پێـشێلکاری مافـەکانی مرۆڤیـان کـردووە لـە کانێکی سـەر بـە کۆمپانیــای Ashanti Gold. ڕاپۆرتەکــە لەســەر گەواهیــدانی چــەند شاهیدێك بونیاد نـراوە. بـە پێـی قسەی شاهێدەکان، کارمەنـدە ئەمنیـەکانی کۆمپانیاکــە لــە نێــوان ســاڵەکانی ١٩٩٤ و ٢٠٠٢ هەڵــساون بــە لێــدان و ئەشکەنجەدانو کوشتنی کرێکاری کانەکان لە غانا. ڕاپۆرتەکە باسی ئـەوەش دەکات کەوا کۆمپانیا ئەمنیـەکان لـەوێ سـەگی پاسـەوانیان بەرداوەتـە گیـانی

کرێکارە سەرپێچیکارەکان. ١٧٣

لە ٢٨ کانوونی دووەمی ٢٠٠٤، چەند راهێنەرێکی باشووری ئەفریقایی سەر بە کۆمپانیای ناوبراو هاتن بۆ بەدواداچوونی رووداوی کوژرانی راهێنەرێك بە ناوی "فرانکۆیس ستریدۆم"و بریندداربوونی هاوکارەکەی " دیۆن گۆیس" لە ئەنجامی تەقینەوەی بۆمبێك لە دەرەوەی هۆتێلی شاهین لە بەغدا، دواتر دەرکەوت کەوا ناوبراوان هەردووکیان لە ساڵی ١٩٨٠ ئەندامی دەزگای پۆلیسی نهێنی سەردەمی رژێمی رەگەزپەرستی (ئەپارتایت) بوونە لە باشووری ئەفریقیادا.

"فرانکۆیس ستریدۆم" کاتی خۆی ئەندامی (کۆیڤۆیت) بووە - باڵێکی توندڕەوی وەحشیانەی سوپای ئەفریقیای باشوور- ئەو باڵە لە ساڵی ١٩٨٠ لە وڵاتی نامیبیا چالاك بووە بۆ یارمەتی دانی ئەو وڵاتە لە بەدەست هێنانی سەربەخۆیی. ١٧٤

"دیۆن گۆیس"یش کۆنە ئەفسەر بووە لە "ڤلاك پلاس" کە یەکەیەکی پۆلیسی نهێنییە لە باشووری ئەفریقیا. بە پێی رۆژنامەی "سەندای تایمزی"ی باشووری ئەفریقی، ناوبراو بەر لێخۆشبوونەکەی لیژنەی راستییەکانو ئاشت بوونەوە کەوت، دوای ئەوەی ددانی نا بە تەقاندنەوەی ماڵی ٤٠-٦٠ لە چالاکوانە سیاسییەکان لە (مامێلۆدی، ئەتێریدگڤیللا، سۆشنگوڤێ، ئۆکاسی، پترسبێرگ، تێمبیساو ئیکانگالا) لە ساڵی ١٩٨٦. هەروەها تەقاندنەوەی ئۆتۆمبێلێك بە مەبەستی کوشتنی "کاواندبیلی" وەزیری دەوڵەتو "پێت نتولی" چالاکوانی ANC، لەوەش زیاتر سووتاندنی بە ئەنقەستی ماڵی دکتۆر "فابیان ریبێرۆ" لە ماملۆدی لە ئاداری ١٩٨٦. ١٧٥

"گرای برانفیلد" هاوڵاتییەکی تری باشووری ئەفریقاییە کە لە کۆمپانیایێکی ئەمنی بە ناوی " هارت گرووپ" کاردەکات، لە ناوەڕاستی مانگی نیسان لە شاری کوت کوژرا. دوو رۆژ دواتر هەواڵەکان باسیان لەوە دەکرد کەوا ناوبراویش ئەندامێکی پێشووی پۆلیسی نهێنی بووە. ددانی بەوە

نابوو کەوا ئەندامی گرووپێك بووە بۆسەیان بۆ "جۆی کگوابی" نوێنەری سەرۆکی کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی داناوەتەوە و نۆزدە جار تەقەیان لێ کردووە دوای ئەوەی لە٣١ی تەمموزی ١٩٨١ لە ڕێگای گەڕانەوەی دابووە بۆ شارەکەی خۆی (هاراری). جگە لەوەش ئەندامی هێزەکانی بەرگری باشووری ئەفریقیا بووە بۆ پرۆژەی (Barnacle)، ئەو گرووپەش پاشماوەی گرووپێکی وەحشیانەی کوشتن بوو، بە ناوی نووسینگەی هاوکاری مەدەنیCCB. لە ساڵی ١٩٨٥ دەستی لە پلانێکدا هەبووە بۆ هەڵکوتانە سەر (گابۆرۆن) تیایدا چواردە کەس کوژران، کە منداڵی تەمەن پێنج ساڵیشی تێدابووە. ١٧٦

ئەوانە تەنیا بکوژەکانی سەردەمی ئەپارتایت نین هاتوونەتە عێراق. بەڵکو ئەندامی دەستەبژێری هێزەکانی پۆلیسی ئەفریقیای باشووریشن، ئەو هێزەی کەوا ١٠٠ پۆلیس دەگرێتە خۆی و پاسەوانی سیاسەتمەدارە پایەبەرزەکانی وەك سەرۆکی وڵات "تابۆ مبیکی" دەکەن. ئەو بەشەی کە سەر بە هێزی پۆلیسە، ئێستا ڕووبەڕووی قەیران بوونەتەوە چونکە نیوەی پۆلیسەکانی داوای خانەنشین بوونی پێشوەختە دەکەن بۆ ئەوەی بێنە عێراق و لەگەڵ کۆمپانیا ئەمنیەکاندا کاربکەن. چونکە ئەو مووچەیەی کە بەدەستی دێنن لە عێراق-٥٠٠٠ دۆلار لە مانگێکدا- یەکسانە بە مووچەی شەش مانگ لە وڵاتی خۆیان.

"هێنری بۆشۆف" شیکەرەوەی سەربازی لە پەیمانگای توێژینەوەی ئەمنی بە ڕۆژنامەی " سەندەی ئیندیپێندێنت"ی باشووری ئەفریقایی ڕاگەیاند: " دەست لەکارکێشانەوەی کارمەندەکانی یەکە تایبەتیەکان مایەی دڵەڕاوکێیە. لە دەستدانی ئەو شارەزایانە کاریگەری خراپی لێدەکەوێتەوە- چونکە ڕاهێنان و مەشق پێکردنیان ساڵێك دەخایەنێت." ١٧٧

## کێ لە پشتی ئێرینیسەوەیە؟

بە پێی ئەفسانەیەکی یۆنانی، "ئێرینیس" بریتیە لە سێ خواوەندی مێینە کە بە یاوەری (هادیس و پێرسیفۆن) پاسەوانی جیهانی ژێرەوە دەکەن. لە عێراقیش، کۆمپانیای "ئێرینیس" کۆنتراکتێکی بایی ٨٠ ملیۆن دۆلار لەلایەن دەسەلاتی داگیرکەرەوە پێدراوە، بۆ پاراستنی ژێرخانی نەوت لەو ولاتە. بە پێی "نەت رۆیس" کە رۆژنامەنووسێکە خەلاتی (پولیتزەری)ی بە دەست هێناوەو لە رۆژنامەی "نیوزدەی" کار دەکات، کۆمپانیاکە بە هەمان شێوەی ئەفسانەکەی ئێرینیسی یۆنانی، مێژوویەکی نادیاری هەیە." ١٧٨

هەرزوو دوای دەرچوونی گرێبەستیەکە، کۆمپانیاکە دەستی کرد بە وەرگرتنی کۆنە چەکدارەکانی میلیشیاکەی (احمد چلبی)،"هێزەکانی عێراقی سەربەخۆ"، بەوەش قسە و قسەلۆك و گومانی سیاسەتمەدارە عێراقیەکانی تر زیادی کرد لە مەڕ هەولەکانی (احمد چەلەبی) بۆ پێکهێنانی هێزێکی چەکداری تایبەت بەخۆی. ( زیاتر لە هەزار کەس لە ریزی هێزەکانی عێراقی سەربەخۆ وەرگیران لە بەهاری ٢٠٠٣. دواتریش لەرێی پێنتاگۆنەوە گوێزرانەوە بۆ کەمپێکی راهێنانی سەربازی لە هەنگاریا بە مەبەستی ئامادەکردنیان بۆ جەنگی دژ بە سەدام حوسێن. هەر زووش دوابەدوای داگیرکردنی عێراق ئەو هێزە لەلایەن کۆنگرەی نیشتمانی عێراقیەوە هەلوەشێنرایەوە.)

احمد چەلەبی، نەوەی یەکێك لە خانەوادە دەولەمەندەکانی عێراقە و پێشینە سیاسیەکەشیان درێژدەبێتەوە، تا رووخانی رژێمی پاشایەتی لە عێراق لە سالی ١٩٥٨. ناوبراو تا کاتی داگیرکردنەکەش لە لەندەن ژیانی بەسەر دەبرد. هەروەها سەرۆکی کۆنگرەی نیشتمانی عێراق (INC) بوو،

بەر لە داگیرکردنەکە ملیۆنەها دۆلاری پێدرابوو بە مەبەستی نانەوەی ئاژاوە لە نێو رژێمی سەدامدا. تا ئەو کاتەشی کە سوپای ئەمریکی هەڵی کوتایە سەر نووسینگەکانی ناوبراو لە ٢٠٠٤، خەڵکی عێراق بە بەکرێگیراوێکی ئەمریکیان دەزانی‌و ئەگەری ئەوەش هەبوو جڵەوی دەسەلات لە عێراقدا بگرێتەدەست.

لە رووی تەکنیکیەوە گرێبەستیەکە درایە کۆمپانیای ئێرینیس لە عێراق، بە پێی گوتەی "دەیڤد براوس" بەڕێوەبەری کارگێری کۆمپانیاکە، ئێرینیس کۆمپانیاێکی ئەمنی تازە پێکهێنراو بوو لە دوای داگیرکاریەکە، لە ئەنجامی سەفقەیەکی یەکگرتنی ئالۆزی بانکیی، کە لەسەرەتای دامەزراندنی بە "نور" ناسراو بوو، "نور"یش لە مانگی ئایاری رابردوو لە ولاتە یەکگرتووکانی ئەمەریکا وەك کۆمپانیایێکی یەکگرتوو پێکهێنرا. دامەزرێنەری "نور" کەسێك بوو بە ناوی "ابوالهدی فاروقی" کە هاوڕێ و هاوبەشی "احمد چەلەبی" بوو. دوای چەند رۆژێك لە بەدەست هێنانی گرێبەستیەکە لە کۆتایی مانگی ئاب، "نور" بووە هاوبەش‌و پشکداری کار لەگەڵ ئێرینیس‌و گرێبەستیەکەش چاککرایەوە بە شێوەیەك کە"نور"یش بگرێتەوە.

سەرچاوەیەکی ئاگادار لە هەندێك کاروباری ناوخۆی هەردوو کۆمپانیاکە بە "نەت رۆیسی" راگەیاند کەوا (احمد چەلەبی) دوو ملیۆن دۆلاری وەرگرتووە لە بەرانبەر پارمەتیدانی بۆ ئامادەکردن و مۆرکردنی گرێبەستیەکە. بەلام (چەلەبی) لە رێی چاوپێکەوتنێکی کورت لەگەڵ رۆژنامەی "نیوز دەی" ئەو تۆمەتەی رەت کردەوە، بە هەمان شێوە کاربەدەستێکی بەرزی کۆمپانیاکەش ئەو تۆمەتەی رەت کردەوە. هەروەها (چەلەبی) نکۆڵی لەوەش دەکرد کە هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ کۆمپانیا ئەمنیەکە هەبێت.

سەرەڕای ئەوەش، لەوەدەچوو INC پەیوەندیەکی تۆکمەی لەگەڵ ئێرینیس هەبووبێت. بۆ نموونە، "فیصل داغستانی" پشکدار و دامەزرێنەر و بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە لە عێراق، دەکاتە کوڕی "تەمارە داغستانی" کە چەندین ساڵ کەسایەتی نزیكو متمانە پێکراوی (چەلەبی) بووەو رۆڵێکی گرنگی گێڕاوە لە دامەزراندنی INC.

لە هەشتاکاندا، کاروپرۆژەکانی فاروقی نزیکەی ١٢ ملیۆن دۆلاری لەلایەن بانکێکی (احمد چەلەبی) لە واشنتۆن وەرگرت. هەر لەو بارەیەوە حکومەتی ئوردونی دەڵێت کەوا ئەو بانکە بەشێك بووە لە پیلانێکی گەورەی پارەخواردن، کە لەلایەن (احمد چەلەبی) و بانکەکەی لە ئوردون (بانکی پێترا) پلانی بۆ دارێژرابوو. کاتێکیش لە ١٩٨٩ بانکەکە هەرەسی هێنا، حکومەتی ئوردونی ناچاربوو بڕی ٢٠٠ ملیۆن دۆلار تەرخان بکات بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەوانەی پارەیان خستبووە بانکی ناوبراو، ئەویش بۆ رێگە گرتن لە هەرەسهێنانی گشت سیستەمی بانکی.

دەسەڵاتدارەکانیش لە ئوردون گلەییان هەبوو کەوا بەشێکی زۆری پارە داواکراوەکە، لە بانکی عەممانەوە راکێشرابوو بۆ بانکی پێترای نێودەوڵەتی. بە پێی تۆمارەکانی تایبەت بەو کێشەیە لە دادگا، لە ئایاری ١٩٨٩ سێ مانگ بەر لە داخستنی بانکی پێترا لەلایەن حکومەتی ئوردونیەوە، بانکە بێ پارەکەی کۆمپانیاکانی فاروقی بڕی ١٢ ملیۆن دۆلاری بانکی پێترای نێودەوڵەتی قەرزار بووە.

## ژیان لە مەترسیدا

بەدەرلە ئابڕوچوونە داراییەکان، لەوە دەچێت ئەو کۆمپانیا ئەمنیانە لە زۆر لایەنی تریش هەرەسیان هێنابێت. چونکە لەگەڵ هەبوونی ئەو هەموو هێزە چەکداریە، پێشبینی دەکرێت بارودۆخی ئەمنی لەسەر زەوی

باشتر بێت. بەڵام عێراقیەکان بە جۆرێکی تر باس لەو مەسەلەیە دەکەن.

لە یەکەم رۆژی سەردانی کردنمدا دوای "ئازادکردنی" عێراق، لە کانوونی یەکەمی ۲۰۰۳، چاوم بە "غەزوان ئەلموختار" کەوت کە ئەندازیارێکی عێراقی خانەنشینەو ماوەی چەندین ساڵیشە چالاکوانە لە بزوتنەوەی بەرەنگاربوونەوەی سزادان. ناوبراو پێی گوتم، ماوەیەکی کەم لەمەوبەر زەلامێکی کوژراوی لەسەر شەقام دۆزیبۆوە کە بە هۆی گوللەیەك لە کەللەی سەری، خەڵتانی خوێن ببوو. وەکو چۆن باسی لێوە دەکات، تەرمی کوژراوەکەی بۆ بنکەی پۆلیس برد، بەڵام تووشی حەپەسان هات کاتێك پۆلیس ئامادە نەبوو لێکۆڵینەوە بکات:"ئێمە چیمان بە سەر هاتووە؟ کۆمەڵگاکەمان شارستانیەتیو مرۆڤایەتی نەماوە، تەنیا لە وڵاتێکی پڕ لە ئاشووبو ئاژاوەدا دەژینو ئیتر لەسەرخاكو ناو ماڵی خۆمان پارێزراو نین."

دوای چەند مانگێکی تر لە گەڕانو سوڕان، دەرکم بەوە کرد کەوا خەڵکی ئاسایی بە تەواوەتی ئەمنو ئاسایشیان لە دەست داوە. سینەماکان گشتیان داخراون، باخچەی ئاژەڵ و گشت گۆرەپانەکانی یاری مندااڵنیش چۆڵن، لێوارو قەراخەکانی رووباری دیجلەش پڕێتی لە گازینۆو چێشتخانەی داخراو، ئەوانەی کاتی خۆی لە بۆنەکاندا مۆسیقای لێ دەژێندرا. نەوەك لەبەر ئەوەی ئەو چالاکیانە رێگریان لێ دەکرێت، بەڵکو لە ترسی تەقینەوەو هێرشەکانی ئەمریکیەکان و تاوانەکانیش. کە هەموو ئەو مەترسیانە لەسەردەمی رژێمی دیکتاتۆریدا نەبوون. تەنانەت پۆلیس ئەرکی رێکخستنی رێگاوبانو هاتو چۆی ماشێنەکانیشان ئەنجام نەدەدا. ئەوان تەنیا رۆژانە سەیری ئاڵۆزبوونی بارودۆخەکەیان دەکردو خەریکی جگەرە کێشانو قسەکردن بوون لەگەڵ یەکتری.

لەسەردانەکەی ترمدا بۆ بەغدا، لە نیسانی ۲۰۰٤. سەردانی شوێنی پاراستنی تەرمەکانم کرد. بە نێو رێڕەوە کپ و بێ دەنگەکاندا دەڕۆیشتم،

دیوارە رەنگ پەمەییەکانیشی ئاوێتە ببوون لەگەڵ رووناکی گلۆپەکانی سەر ریڕەوەکە، کە هەستێکی تێرامانی پێ دەبەخشی. لەوێ چاوم بە دکتۆر "قەیس حەسەن سەلمان" بەڕێوەبەری ئامار کەوت. ناوبراو چەند ئامارێکی بۆ خوێندمەوە کە تایبەت بوون بەو تەرمانەی کە بۆیان هێنرابوون و بە گوللە کوژرابوون:"لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٣-١٣ حاڵەتمان هەبوو، لە شوبات- ٦ حاڵەت، لە ئاداریش- ١٨ حاڵەت. کەچی لە شوباتی ٢٠٠٤ گەیشتە ٢٩٩ حاڵەت، لە ئاداریش- ٤١٣ حاڵەت." رێژەی کارەساتەکان لە دوای شەڕدا بە شێوەیەکی مەترسیدارانە بە رادەی ٢٥ ئەوەندە بە بەراورد لەگەڵ رابردوو بەرز بۆتەوە. زۆربەی کوژراوەکان قوربانی کردارەکانی تاوانن‌و هەندێکی تریشیان پەیوەندی بە سیاسەتەوە هەیەو ئەوانی تریش قوربانی هێرشەکانی ئەمریکیەکانن.

## دزەکردن INFILTRAION....

بەلام ئایا هێزەکانی پۆلیس ئەرکەکانی خۆیان ئەنجام نادەن؟ گومانەکان لە زیادبووندا بوون لە بەرانبەر ژمارەیەك لەو کەسانەی دەچوونە ریزی هێزەکانی پۆلیس، بەوەی نیازو مەرامی تریان هەبێت. ئەو مەسەلەیەش لەو کاتە هاتە بەرباسکردن، کاتێك کە " فێرن هۆلاند" پارێزەر لە واشنتۆن‌و "رۆبەرت زینگیس" فرۆشیاری ئامێرو بەرنامەی کۆمپیوتەری لە ڤێرجینیا، لە٩ ئاداری ٢٠٠٤ بە دەستی چەند چەکدارێکی عێراقی لە نزیك شاری کەربەلا کوژران. ئاشکرابوونی رووداوەکەش دڵەڕاوکێیەکی زۆری نایەوە، کاتێك کە دەسەڵاتی داگیرکەری ئەمریکی رایگەیاند چەکدارە بکوژەکان پۆشاکی پۆلیسی عێراقیان لەبەردابووە، بەلام سەرسوڕمانەکە لەوەش زیاتر بوو کاتێك سوپای ئەمریکی بۆی ئاشکرابوو، پێنج لەوانەی دەستیان لە کوشتنی ناوبراواندا هەبووە ئەندامی راستەقینەی هێزەکانی پۆلیسی

عێراقی تازە پێکهێنراو بوون. ١٧٩

ئەوەش یەکەم جار نەبوو، سوپای ئەمریکی و دەسەڵاتی داگیرکەر لەلایەن پۆلیسی عێراقیەوە ببنە ئامانج. مانگێك لە مەوبەر، کاتێك سەربازەکانی بەتالیۆنی یەکەمی سەر بە فەوجی پیادەی بیستو دوو، خەریکی پشکنینی ماڵێك بوون لە گوندی "قادسیە" رووبەڕووی تەقەلێکردن بوونەوە. ئەوانیش تەقەیان لەو شوێنە کرد کە هێرشەکەی لێوە هات، دوای کۆنترۆڵکردنی شوێنەکە بۆیان دەرکەوت کەوا یەکێك لە کوژراوەکان ئەندامی هێزەکانی پۆلیسی عێراقی بووە بە پلەی رائد. ١٨٠

کەس نازانێت چ شتێك هانی ئەوانەی داوە - ئایا رق و کینەیە بەرانبەر داگیرکەر یان یارمەتیدان و پاڵپشتی نهێنی هێزە چەکدارەکانە- بە هەرحاڵ دەرکەوت کەوا ئەو پۆلیسە نوێیانە کەمتر دڵسۆزن، ئەویش لە بەر پەست بوونیان بە هۆی کەمی مووچەکانیان. چونکە مووچەی پۆلیس لە مانگێکدا ١٢٠ دۆلار بوو ئەوە لە کاتێك مووچەی سەربازەکان نیوە ئەوەندە بوو، کە زۆر کەمتریشە لەو کرێو رۆژانەیەی کە لە کۆمپانیا ئەمنیە تایبەتەکان یاخود لە کرێکاری وەریان دەگرت.

## .... یان جێهێشتن DESETATION

رەنگبێ هیچ پرۆژەیەکی ئەمنی، ئەوەندەی مەشق پێکردنو راهێنانی بەتالیۆنی یەکەمی سوپای تازەی عێراق ناو و ناتۆرەی خراپی نەبووبێت. دەسەڵاتدارەکانی داگیرکەری ئەمریکی دوای کۆنترۆڵکردنی عێراق لە نیسانی ٢٠٠٤، هەموو ئەو چوارسەد هەزار سەربازەی سەر بە سوپای عێراقی سەردەمی رژێمی سەدامیان دەرکرد. ئینجا دەستیان کرد بە داڕشتنی پلان بۆ راهێنانو ئامادەکردنی چل هەزار سەربازی تر، کە تا ٣٠ حوزەیرانی هەمان ساڵ دابەش دەبوونە سەر بیستو حەوت بەتالیۆن، بەڵام هەر

لەسەرەتاوە ژمارەیەکیان لەدەست دا.

بە پێی راگەیاندنێکی "دۆگ کومێنگ" کە ئەفسەرێکی ئوستورالیەو سەرۆکی راهێنەرانی ئەکادیمیای مەشق پێکردنە لە قەرەقوش، کە دەکەوێتە باکووری رۆژهەلاتی شاری بەغدا بە دووری نزیکەی ۱۰۰ کم:"لەگەڵ هاتنی ئەو رۆژەی کە دەبوایە یەکەمین گرووپ کە لە ۹۰۰ سەرباز پێك هاتبوو بۆ یەکەم ئەرکیان دەرچوونایە، ۴۸۰ سەرباز لەبەر کەمی مووچەو مەشقپێدانی نەگونجاوو ئامێری قەڵپو هەندێ هۆکاری تریش کارەکانیان جێهێشت. لەوەش خراپتر، ئەوانەی کە مابوونەوە لە سوپا، هێشتا فێری ئەوە نەببوون چۆن خۆیان رێك بخەنو چۆنیش وەلامی پەیوەندیەکانی رادیۆی بێ تەل بدەنەوە. ۱۸۱

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانیشە ئەو کۆمپانیایەی کەوا گرێبەستی لەگەڵدا کرابوو بۆ ئەو کارە کۆمپانیای "ڤینێل" بوو، کە بۆ ماوەی بیستو پێنج ساڵ راهێنانی بە یەکەی گاردی نیشتمانی سەر بە هێزە چەکدارەکانی عەرەبستانی سعودیە دەکرد. هەر بۆیەش ناکرێ ئەزموونی کۆمپانیای ناوبراو لەگەڵ سوپای سعودی بکەینە بەڵگە لەسەر ئەوەی کۆمپانیاکە شیاوترینو کارامەترین کۆمپانیایە بۆ ئەو کارە. ئەویش لە بەر ئەوەی، یەکەم: ئەو یەکەیەی گاردی نیشتمانی سوپای سعودیە کەوا شانازی بە توانکانیان دەکەن، هەرگیز بەشداریان لە هیچ جۆرە شەڕێك نەکردووە تاکو تواناکانیان بسەلمێندرێ، بۆیە ناتوانرێ هیچ حوکمێك بدرێت ئاخۆ مەشقو راهێنانەکانیان ئاکامی هەبووە یان نا. دووەمیش: کەلوپەلەکانی کۆمپانیای ناوبراو لە عەرەبستانی سعودیا دووجار لە کاتی مەشقکردنەکاندا هەرەسیان هێناوە.

مەیجەر ژەنەراڵ "پاول ئیاتۆن" کە لەگەڵ کۆمپانیای ناوبراو لە بنکەی راهێنانی قەرەقوش کاری دەکرد دەیگوت، گلەیی لە کۆمپانیاکە

کـردووه بـەوەی مووچـەیەکی زۆر کـەمی دەدایـە سـەربازەکان- ٧٠ دۆلار لـە مانگێکدا. (بـە پێـی کۆنتراکتەکـە کۆمپانیاکـە لـە بەرانبـەر ئـەو کـارەی دا ٤٨ ملیـۆن دۆلاری وەرگرتـووە). لـەوەش زیـاتر نـاوبراو گازانـدەی لـە شـێوازی مەشقپێکردنی کۆمپانیاکە هەبووە، چونکە شـێوازەکانی مەشـقپێکردنی کـەوا پەیرەویان لێ دەکرا زیاتر بۆ مامۆسـتای زانکـۆ دەشـیان لـەوەی بـۆ سـەرباز و ئەفسـەری سـوپا بـشێت، لـە لێدوانێکیـشیدا بـۆ رۆژنامـەی (واشـنتۆن پۆسـت) دەیگـوت: " سـەرباز دەبـێ لەسـەر دەسـتی سـەرباز مەشـق وەربگـرن، چـونکە ناتوانیت داوا لە کەسـێکی مـەدەنی بکـەیت ئـەرکی سـەربازی ئـەنجام بـدات." راهێنەرەکانی کۆمپانیاکە لە بری ئەوەی مەشق و ئەرکی سـەربازی تونـد بـە سـەر راهێنـراوەکـان بـسەپێنن، کـاتی پـشوو و مۆڵـەتی کراوەیـان پێـدەدان و هانیشیان دەدان سەیری فلیمەکانی سلڤەستەر ستالۆن و جاکی شان بکەن.

سەرچـاوەیەکی تـری گـرژی لـە نێـو بەتالیۆنەکـە، بریتـی بـوو لـە تێکـەڵکردنی سـەپێنراوی سـەربازی کـوردو عـەرەب (دوژمنـە دێرینـەکانی یـەکتری). پـلان دانـەرە ئـەمریکاییـەکان پێیـان وابـوو لـە توانایـان دا هەیـە مـۆدێلێکی تـازە لـە وڵاتێکـی فـرە نەتـەوەو ئـایین بـەدی بێـنن، بۆیـە بەتالیۆنەکـەیان بـەو شـێوەیە پێـك هێنـا: رێـژەی ٦٠٪ عـەرەبی شـیعە، ٢٠٪ عەرەبی سوننە، ١٠٪ کورد و ١٠٪ نەتەوەکانی تر. ئەو هەوڵە هـەر لـە یەکـەم رۆژیـەوە هەرەسـی هێنـا، چـونکە کۆرسـی راهێنانـەکان بـە زمـانی ئینگلیـزی بوون و دەبوایە بۆ زمانی عەرەبیو دواتریش بۆ زمانی کوردی وەربگێردرێ. هەر لەدوای تێپەڕینی چەند هەفتەیـەکی کـەم لـە دەسـپێکردنی مەشـقەکان، سەد سەربازی کورد دەسـتیان لـە کـار کێـشایەوە ئـەویش لەبـەر نـاڕازیبوونی سـەرکردە عەشـایرەکانیان بـەو تێکەڵـە ئیتنـی و نەتەوەییـەی بەتالیۆنەکـە. لەوەش زیـاتر سـەربازەکان گلـەییان هـەبوو لـە جـۆری پۆشـاکەکانیان بـەوەی سـەیر دەردەکـەوتن و لـە کـاتی شوشتنیـشیان بـچووك دەبوونـەوە، هـەروەها

چەك‌و تفاقەکانیش لە کارکەوتبوون‌و تەقەیان پێ نەدەکرا. ١٨٢

سوپای ئەمریکی، وەکو کاردانەوەیەك بۆ گرفتی هەڵهاتن و جێهیشتنی سەربازەکان، گرێبەستیەکەی کۆمپانیای "ڤینێڵ"ی هەڵوەشاندەوەو داوای لە سوپای ئوردونی کرد ئەرکی مەشقپێکردنی سوپای عێراقی بگرێتە ئەستۆ. ئەو بەسەرهاتانە بوونە هۆی ورووژاندنی چەند یادگاریەکی بێزارکار لەلایەن چاودێرە سیاسیەکانەوە، بەوەی لەسەردەمی شەڕی سارد دا، موجاهیدە ئەفغانیەکانی کەوا ئەمەریکا پاڵپشتی دەکردن خزێنرابوونە نێو سەربازەکانی سوپای ئەفغانی کە لەلایەن یەکێتی سۆڤێتەوە مەشقیان پێ دەکرا، تاوەکو قەناعەتیان پێ بکەن بۆ ئەوەی چەکەکانیان فڕێ بدەن‌و سوپاکە جێبهێڵن. ئایا هەمان هەلومەرج لە عێراقیش دووبارە دەبێتەوە؟

## خەڵکی مەشق پێدەدەین تاوەکو پەنجە بنێنە سەر پەلاپیتکەکان

سەرەڕای کۆنتراکتە هەرەس خواردووەکەی "ڤینێل"، کۆمپانیاکە شانازی بەو مێژووە دوورو درێژەی دەکرد لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ سوپای ئەمریکی. کۆمپانیاکە لە ١٩٣١ لەسەردەستی "ئەی ئێس ڤینێل" دامەزراوە، سەرەتای کارەکانیشی بریتی بوو لە دانانی شۆستەی ڕێگاوبانەکان لە لۆس ئەنجلۆس. لەو کاتەوە کۆمپانیاکە چەندین پرۆژەی گەورەی حکومی‌و نێوخۆیی گرتە ئەستۆ. ڤینێل بەڵێندەری سەرەکی ئۆپەراسیۆنەکانی سوپا بوو لە ئۆکیناوا، کە پێداچوونەوەی بۆ پلانەکانی هێزی ئاسمانی دەکرد لە دوورگەی (گوام) لە سەرەتای پەنجاکاندا. هەروەها ناردنی سەربازو کەلوپەلی سەربازیش بۆ بەرەکانی جەنگ لە میانەی شەڕی کۆریادا. ١٨٣

کۆمپانیاکە، کە ئێستا بنکەکەی لە (فەیرفاکس- ڤێرجینیا)-یە هەر لەسەرەتاوە لەلایەن تۆڕبەندێکی هاوبەش خاوەنداریێتی کراوە، دیارترینیان

"جـەیمس بێکـەری سـێیەم" وەزیـری دەرەوەی پێـشوو لەسـەردەمی سـەرۆکایەتی جۆرج بۆشـی بـاوك، هـەروەها "فرانـك كارلۆتـشی" وەزیـری بەرگری پێشوو لەسەردەمی سەرۆك رۆناڵد ریگان.

رەنگبێ گرنگترین گرێبەستی سەربازی كە ڤینێل بەدەستی هێنابێت، كۆنتراكتەكـەی سـاڵی ١٩٧٥ بـوو، كاتێـك كـە پێنتـاگۆن یارمـەتی كۆمپانیـای ناوبراوی دا بۆ بردنەوەی گرێبەستیەكی تایبەت بـە مەشقپێكردنی حـەفتاو پێـنج هـەزار سـەربازی سـەر بـە گـاردی نیـشتمانی سـعودی، ئـەو یەكـە سـەربازیەی كـەوا پیاوەكـانی لـە سوارچـاكە رەوەنـدەكانی نیمـچە دوورگـەی عەرەبی پێك هاتبوون‌و خرابوونە خزمەتی سوپا بۆ یارمەتیدانی عەشیرەتی "ئالـسعود" لـە حـوكم كردنـی ئـەو وڵاتـە لەسـەرەتاكانی سـەدەی رابـردوودا. وتـارێكی گۆڤـاری "نیوزویـك"، كـە بڵاوكردنەوەكـەی هاوكـات بـوو لەگـەڵ بەدەسـتهێنانی كۆمپانیـای "ڤینێـڵ" بـۆ كۆنتراكتەكـە، باسـی لەسـەرەتاكانی كۆمپانیای ناوبراو دەكرد بۆ دامەزراندن‌و وەرگرتنی چەكدار لە ریزەكانیـدا، بـە هاوكـاری كۆلـۆنێلێكی پێـشووی سـوپای ئـەمریكی بـە نـاوی "جـەیمس دی.هۆلانـد" كـە چـاوێكی لەدەسـت دابـوو، لـە نووسـینگەیەكی بـچووك لـە شـەقامی ئـەلهامبرا لـە لـۆس ئـەنجێلس. بـە پێـی وتارەكـە: "نـاوبراو سـەرەتا دەستی كرد بە كۆكردنەوەی ئەو سـەربازە دێرینانـەی كـە بەشـداری جـەنگی ڤێتنامیـان كردبـوو، بـۆ ئەنجامـدانی ئـەركێكی ناتـەبا: كـە بریتـی بـوو لـە مەشـقپێكردنی سـەربازە سـعودیەكان بـۆ بـەرگریكردن لـە بـیرە نەوتیـەكانی كـەوا (هێنـری كێـسنجەر) وتبـووی ئەگـەری ئـەوە هەیـە ئـەمریكا دەسـتیان بەسەردا بگرێت."

ئەفـسەرێكی پێـشووی سـوپای ئـەمریكی لـە لێدوانێكیـدا بـۆ گۆڤارەكـە دەڵێت: "ئێمە چەكداری چـەتە نـین، چونكە ئێمـە خۆمـان پەنجە ناخەینـە سەر پەلاپیتكەی تفەنگـەكان، بـەڵكو مەشـق بـە خـەڵكی دەكـەین بـۆ ئـەوەی

ئـەوان پەلاپیتکـەی تفەنگـەکان دابگـرن." هـەر لـەم بارەیـەوە یـەکێك لـە هاورێیەکانی ناوبراو بە گاڵتەوە دەڵێت: "رەنگبێ بەو کارە ببینـە چـەتەی جێبەجێکار." ١٨٤

## بلاك وۆتەر: پاسەوانی ئەمنی یان سوپایەکی راستەقینە؟

لە رۆژێکی سافی نیسانی ٢٠٠٤، پۆل برێمەر لە بەغداوە سەردانی شاری موسڵی کرد لە رێی فرۆکەی C-١٣٠، لەوێشەوە بـە هەلیکۆبتـەرێکی جۆری "هـۆك" گەیـشتە کۆمپاوەنـدی "ئـەلریفاح پـالاس" بـۆ کۆبوونـەوە لەگـەڵ نوێنەرە نێوخۆییەکانی شارەکە بە مەبەستی گفتوگۆکردن دەربـارەی یاسـای حکومەتی کاتی.

هەردوو رۆژنامەنووسی (نیویـۆرك تـایمز)، "جۆن بێرنـز" و "جـەیمس داو" بەوجۆرە وەسفی کۆبوونەوەکەیان کرد:

لە شوێنی کۆبوونەوەکـەدا، کـە پـۆل برێمـەر کۆبوونـەوەی لەگـەڵ نزیکەی ١٣٠ لەو عێراقیانە کرد کە بە توندی پـشکنینیان بـۆ کرابـوو، پاسەوانەکانی بلاك وۆتەر ئامادەبوونێکی چڕیان هەبوو، بـە درێـژایی دیوارەکـــانیش بـــە چـــەکەکانیانەوە روو لـــە میوانـــە عیراقیـــەکان ئامادەباش وەستابوون.

رەنگبێ زۆرترین شت کە بووبێتە مایەی حەپەسان لـەو سـەردانە، ئەو ئاماژەیە بوو کە ناردی سـەبارەت بـەو قەیرانـەی کـە رووبـەڕووی پـرۆژەی ئەمریکیـەکان دەبێتـەوە لێـرە: ئـەو راسـتیەی کـە دەڵێـت پارێزگـاریکردنی ئـەمریکا بـۆ عێراقێکـی دیموکراسـی، بەنـدە بـە پاراســتنی ســەلامەتیو ئــەمنی خــودی ئەمریکیــەکانو حاکمــە مەدەنیەکـەی کـە تـەنیا لـە نـاو کۆمپاونـدێکی سـەربازی پـارێزراودا دەتـوانێ هەڵوێـستی خـۆی بـۆ عێراقیـەکان روون بکاتـەوە، لەبـەردەم

جەماوەرێکی پێکهاتوو لە میوانی بانگێشکراو، کە وادیارە، زوو دۆستایەتی خۆیان بۆ ئەمریکاو پرۆژەکەشی دەربڕیوە. ئەمەش پێی دەگوترێت دیموکراسیەتی ژێر زرێپۆش. ١٨٥

کۆمپانیای "بلاك ۆتەر" لە ساڵی ١٩٩٨ لەلایەن چەند سەربازێکی پێشووی هێزی دەریایی ئەمریکی دامەزرێنراوە. لە سەر پانتایی شەش هەزار ئاکەری (واتە ٢٤,٣ کم دوجا) تەرخانکراو بۆ راهێنان و مەشقکردن، شارراوە لە نێوان کۆمەڵێك کێڵگەی ئەسپ و دارستانەکانی سنۆبەر لە باکووری کالیفۆرنیادا. کۆمپانیاکە رووبەر و پانتایی دەستنیشان کردبوو بۆ تاقیکردنەوەی چەکی بەهێز، هەروەها باڵاخانە و نموونەی کەشتیەکی سێ نهۆمیش بۆ راهاتن و پراکتیزە کردنی کردە و ئەرکە سەربازیەکان. لە ساڵی ٢٠٠٢ کۆمپانیاکە، کۆنتراکتێکی پێنج ساڵی بە دەست هێنا بایی ٣٥,٧ ملیۆن دۆلار لە بەرانبەر مەشقپێکردنی دە هەزار سەربازی سەر بە هێزەکانی دەریایی لەسەر چەك کردن و دەست بە سەرداگرتنی کەشتیە جەنگیەکان. ١٨٦

لەگەڵ کۆتایی ئاداری ٢٠٠٤، کۆمپانیاکە بووە مانشێتی رۆژنامەکان، کاتێك کە چوار لە کارمەندەکانی (وێسلی باتالۆنا، سکۆت هێلڤێنستۆن، مایکل تیگ و جێرکۆ زۆڤکۆ) کوژران، دوای ئەوەی لە نێو شەقامێکی فەللوجەدا کەوتنە بۆسەوە. ١٨٧

بلاك ۆتەر رایگەیاند، ئەو کاروانەی ناوبراوانی دەگواستەوە، لە جێبەجێکردنی ئەرکی دابینکردنی ئەمنیەت بوون بۆ Compass. کە گرێبەستی بۆ دابینکردنی خواردن بۆ سەربازە ئەمریکیەکان هەبوو. هەرچەندە کە هیچ جۆرە ماشێنێکی تایبەت بە گواستنەوەی خۆراك لە نزیك شوێنی ئەو رووداوە نەبینرابوو. ١٨٨

بە هەمان شێوەی "ئێرینیس"، بلاك ۆتەریش چەکداری لە ئەفریقیای باشوور و وڵاتانی تریش بە کرێ گرتبوو. لە لێدوانێکیدا بۆ یەکێك لە

پەیامنێرەکان، "گاری جاکۆن" سەرۆکی کۆمپانیای بلاك ۆتەر، گوتی: "ئێمە ئەم سەر و ئەوسەری جیهان دەکەین، تاوەکو کەسی کارامە و شارەزا دەدۆزینەوە." هەروەها بە پێی رۆژنامەی (گاردیان)ـی بەریتانی: لە ئاداری ٢٠٠٤ کۆمپانیاکە شەست لە کۆماندۆس و خەڵکی تری شارەزا لە وڵاتی تشیلی بە کرێ گرت - زۆربەیان مەشقی سەربازیان لەسەردەمی حکومەتی عەسکەری بە سەرکردایەتی (ئۆگیستۆ پینۆشێت) بینیبوو- و لە رێی فرۆکەوە هەموویانی گەیاندە کەمپەکەی مەشقپێکردنی باکووری کالیفۆرنیا، وەکو ئامادەکاری بۆ وەرگرتنی کار لە عێراق. ١٨٩

چەند رۆژێکیش دوای ئەوە رۆژنامەی "واشنتۆن پۆست" لەسەر زاری یەکێك لە کارمەندەکانی کۆمپانیاکە وەسفی رووبەڕبوونەوەیەکی سەربازی کرد کە لە نزیك شاری نەجەف روویدابوو: "بەر لەوەی پاڵپشتی سەربازی بگاتە سوپای ئەمریکی، بلاك ۆتەر هەلیکۆپتەرەکانی خۆی ناردە نێو جەرگەی شەڕەکە، بۆ ئەوەی چەك و تفاق بگەێنێتە کۆماندۆسەکان و لەوێشەوە مارێنزە بریندارەکان لەگەڵ خۆیدا بێنێتە دەرەوە. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا هێڵێکی رون و ئاشکرا نیە بۆ ئەوەی رۆڵی کۆمپانیاکە جیابکاتەوە، کە ئایا کۆمپانیایێکی تایبەتە بە دابینکردنی پاسەوانی ئەمنی، یاخود دەبێت بەشدار بێت لە شەڕو پێکدادانە چەکداریەکانیش."١٩٠

ئایا ئەو کۆمپانیا تایبەتانە بەشدارن لە جەنگ؟ ئایا دەکرێ بەشێکیش بن لە نەخشە و پلاندانان بۆ کردە سەربازیەکان؟ گەر بەشداری کۆبوونەوەکانی تایبەت بە پلان دانان و نەخشەرێژی سەربازی نەکەین، ئەوا وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە قورس دەبێت... لەگەڵ ئەوەش، ئەو جۆرە چەك هەڵگرتنەی کارمەندەکانی ئەو کۆمپانیانە، پێچەوانەی بەندەکانی گرێبەستیەکەیانە، بەڵام دەکرێ بە ئاماژەیەکیش دابنرێت بۆ بینینی رۆڵێکی زۆرتر لەوەی کە ئیمزایان لەسەر کردووە.

## سوپای بەرانبەر

دوابەدوای زیادبوونی رادەی کردارەکانی بەرهەڵستی لە نیسانی ٢٠٠٤، دەسەڵاتدارانی داگیرکەر دەرکیان بە هەبوونی میلیشیا و هێزی چەکداری شارراوە کرد، کە ئامادەن لە کاتێکی کورتدا چەك هەڵگرن و بجەنگێن. ئەگەری ئەوەش هەبوو بەوەی هەندێکیان لەلایەن پۆلیس و سوپای عێراقیەوە پاڵپشتی ژێربەژێریان دەکرا، یان ژمارەیەکیان لە بەرژەوەندی هەردوو لا کاریان دەکرد.

لە باشووری عێراقدا دوو میلیشای شیعی دژ بە یەکتری هەن، میلیشیای بەدرو سوپای مەهدی. سوپای مەهدی خاڵی هێزەکەی ناوچەی سەدرە - کە ناوی پێشەوایەکی ئایینی لێنراوە، پێشبینیش دەکرێت پێشەوایی شەڕێکی چاوەڕوان کراو بکات- سوپای ناوبراو لە ناوچەکەی خۆیدا خاوەنی دادگاو بەندیخانەی تایبەتی خۆشیەتی. ١٩١

لە مانگەکانی نیسان و ئایاری ٢٠٠٤، چەکدارەکانی سوپای مەهدی لە شاری کەربەلادا دەستیان کرد بە شەڕ لە دژی سوپای ئەمریکی و لایەنگرانی (ئایەتوڵا علی سیستانی). کە دواتر توانیان کۆنترۆڵی شارەکانی کوفە، کوت، نەجەف، کەربەلا و چەند شارێکی تریش بکەن. لەلایەکی تریشەوە رێکخراوی بەدر هەیە کە باڵی سەربازی (ئەنجوومەنی باڵای شۆرشی ئیسلامیە لە عێراقدا)، بە سەرکردایەتی (حەسەن ئەلعامری)، ئەو هێزەش راستەوخۆ هاوکاری و پاڵپشتی هێزەکانی پۆلیسی دەکرد لە بەسرە.

لە نیسانی ٢٠٠٤، بە پێی چەند راپۆرتێکی بڵاوکراوە کە سەرچاوەکانیان نەناسراو بوو: هاوکات لەگەڵ کۆنترۆڵ کردنی سوپای مەهدی بۆ شاری نەجەف و گورز وەشاندنی موجاهیدەکانیش بۆ سوپای ئەمریکی لە فەللوجە، پۆلیسەکان دەسبەجێ جل و بەرگە رەسمیەکانیان فڕێ دەداو

دەچوونە ریزی ئەو میلیشیا چەکدارانە.

لە چیاکانی باکوریش، دوو هێزی پێشمەرگە هەن-یەکێکیان سەر بە جەلال تاڵەبانیو ئەوی تریشیان سەر بە مسعود بارزانیە- سەرەڕای ئەوەشی ئەو هێزە لە ئێستادا وەکو هێزێکی یەکگرتوو دەردەکەوێت، بەلام ئەوانیش مێژوویەکیان لە دژایەتی کردنی یەکتری هەبووە.

جگە لەو میلیشیانەی لەسەرەوە باسیان لێوە کرا، گرووپێکی تریش هەیە کە (ئەیاد عەللاوی) سەرکردایەتی دەکات، ئەویش "هاوپەیمانێتی نیشتمانی عێراقی"ـیە کە لە میانەی داگیرکردنەکەدا لەلایەن دەزگای هەواڵگری ناوەندی ئەمریکیەوە CIA پشتگیری دەکرا، بەلام دواتریش بە هاوشێوەی "هێزە عێراقی سەربەخۆ"ـی سەر بە ئەحمەد چەلەبی، هەڵوەشێنرایەوە. ١٩٢ لەگەڵ ئەوەش، هەروەك هێزەکانی عێراقی سەربەخۆ، دەکرێ بگوترێت شێوازێکی تریان وەرگرتووە نەوەك هەڵوەشێنراونەتەوە. چونکە ئێستا وەزیری ناوخۆی عێراقی سەر بە "هاوپەیمانی نیشتمانی عێراقی"یە، کە زۆرینەی هێزە ئەمنیەکانی ئەو وڵاتە سەر بەو وەزارەتەن. وەکو چۆن "ئینتیفاز قەنبەر" وتە بێژی "کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی" بە نیویۆرك تایمزی راگەیاندبوو: "لە هەندێك شوێن و حاڵەتی دیاریکراودا، میلیشیاکان رۆڵی گرنگ دەبینن." کە دەکرێت رۆڵی هێزی فریاکەوتنیش ببینن. ١٩٣

گەر بێتوو رۆڵی پۆلیسی عێراقی کەمێك ناڕوون بێت، ئەوا هەمان شتیش راستە بۆ کۆنە سەربازەکانی ئەمریکی و بەریتانی ئەوانەی مووچەی بەرزیان پێ دەدرێت. گومانیش لەوە دانیە ئەو چەکدارانە، دڵسۆزی خۆیان بۆ هێزەکانی داگیرکەر دەنوێنن کە مووچەیان پێ دەبەخشن، بەلام دەبێ بپرسین، ئایا ئەوانە ئەرکی راستەقینەیان چیە؟ ئایا ئەوانە تەنیا لە بەرانبەر پارەیەکی زۆر پاسەوانی دەکەن یاخود ئەوانە هێزێکی هاوشێوەی

سوپان؟ سەرەڕای ئەوەش نیاز لە دامەزراندنیان ئەوە نەبووە کە ببن بە سوپایێکی تایبەت؟ ئەگەری ئەوەش هەیە رۆژێك لە رۆژان بەو ئاقەرەدا بچن.

## گەورەترین سوپای تایبەت لە جیهان

لە نیسانی ٢٠٠٤، پڕوپاگەندەکان دەستیان پێکرد سەبارەت بەوەی گەلێ لە کۆمپانیا ئەمنیە تایبەتیەکان دەستیان کردووە بە تێکەڵبوون لەگەڵ یەکتری. رەنگە بێ وەك ئامادەکاری بۆ دامەزراندن و رێکخستنی گەورەترین سوپای چەکداری لە جیهاندا، کە دەبێتە خاوەنی تیمی فریاکەوتن و پسپۆری سەربازی و دەزگای هەواڵگری تایبەت بە خۆی.

" نیك ئێدمۆند" رێکخەری کاروبارەکانی عێراق لە کۆمپانیای "هارت" (ئەو کۆمپانیایەی کەوا پیاوکوژێکی بەکرێگیراوی لە کوت لێ کوژرابوو) گوتی: "وادیارە هاوکاریکردنی یەکتر لە دەرەوەی شێوازە رەسمیەکانیان پەرە دەسێنێ. بۆیە ئێمە هەوڵ دەدەین سەرنجیان بەرەو ئەو شتانەی کە دەزانین خەریکە روو دەدەن رابکێشین."

کۆلۆنێل "جێل مۆرکێنسالێر" وتەبێژی هاوپەیمانەکان لە بەغدا، لە وەڵامی پرسیارێکی "واشنتۆن پۆست"دا بە ئیمێل نووسیویێتی: "هیچ رێکاریەکی رەسمی نیە بۆ گۆڕینەوەی زانیاری هەواڵگری، هەرچۆنێکیش بێت، جۆرێك لە پەیوەندی تایبەتی لە نێوان کۆمپانیاکان لە ئارادایە، ئەویش بۆ ئەوەی یەکتری ئاگادار بکەنەوە لە شوێن‌و حاڵەتەکانی کەوا مەترسیان لێوە دێت." ١٩٤ بە بۆچوونی بەڵێندەرەکانەوە، هەنگاوی لەو جۆرە بەجێیە. زۆربەیان هەستیان دەکرد کەوا سوپا زۆر هاوکار نیە لە دانی زانیاری هەستیارو پێویست، بۆیە باشترین رێگەچارە بۆ خۆپاراستن، بیرکردنەوەیە لە دامەزراندنی دەزگایەکی هەواڵگری تایبەت بە خۆیان. بەڵام لەلایەکی ترەوە هەنگاوی لەم جۆرە، رووکەش‌و ناتۆرەی ئەو کۆمپانیایانە

جوانتر ناکات، چونکە لەوانەیە کەسێك بێتو بڵێت، ئەگەری ئەوەش هەیە کەوا کۆمپانیاکان لە ڕێی وەرگرتنی ئەو زانیاریانەوە، کرداری تۆڵەسەندنەوە ئەنجام بدەن یاخود بە هەڵە هێرش بکەنە سەر خەڵکی بێ تاوان.

گۆڕینەوەو هاوبەشیکردنی سەرچاوەکان ئاسەوارێکی تری گرنگی هەیە: ئەویش ڕەواندنەوەی تەمو مژاوی وێنەی ئەو کۆمپانیایانە لەبەرچاوی خەڵکی. چونکە بەلای عێراقیەکانەوە چەکدارەکانی ئەو کۆمپانیانە-ئەو کەسانەی چەکیان لە دەستەو پۆشاکی سەربازیشیان نەپۆشیوە- هەموویان سەر بە CIAـەن، بۆیە مافی خۆیانە گەر بیانکەنە ئامانج و بیانکوژن. چەند جارێکیش پێیان ڕاگەیاندبووین کەوا هۆتێلی "بەغداد"- کە شوێنی مانەوەی ڕاهێنەرەکانی سەر بە کۆمپانیای "دایان کۆرپ" بوو، بە ڕەسمی بۆتە بنکەی CIA. بۆیە بە بۆچوونی دانیشتوێکی تورەی شەقامی سەعدون لە بەغدا، هۆتێلەکە هەمان ئەو شوێنەیە، وەکو چۆن لەسەردەمی ڕژێمی سەدامدا کرابووە بنکەی دەزگایەکی هەواڵگری سەر بە ڕژێم تەواو هاوشێوەی دەزگای هەواڵگری نازیەکانی ئەڵمانیا SS.

ئەو جۆرە خوێندنەوەیە بۆ ڕۆڵی ئەو کۆمپانیانە، پاڵنەری سەرەکی بوون بۆ ستراتیژیەتی گرووپە چەکدارەکان لە بە ئامانج گرتنی چەکدارەکانی سەر بە کۆمپانیا ئەمنیەکان. بۆ نموونە: ئەو چوار بارمتە ئیتاڵیەی کەوا لە نیسانی ٢٠٠٤، بوونە مانشێتی زۆربەی ڕۆژنامە و دەزگاکانی ڕاگەیاندن، کاتێك کە یەکێکیان لێ گوللە باران کرا، وەك چۆن لە فلیمێکی ڤیدیۆیی وێنەی گیرابوو، هەموویان بەڵێندەری کۆمپانیای ئەمنی بوون. فابریزیۆ کواترۆتشکی، ماوریزیۆ ئەگلیانا و ئەمبێرتۆ کیوپێرتینۆ لە کۆمپانیای DTS کاریان دەکرد کە بنکەکەی لە نیڤادا بوو، چوارەمیان (سەلڤاتۆری ستێفیۆ) سەرۆکی کۆمپانیای "پریسیدیۆم" بوو (ئەوەیان لە فلیمە ڤیدیۆییەکە دەرکەوتو کوژرا لە ڕێی گوللەبارانکردنی سەری.) ١٩٥

به لانی کەمەوە، تەنیا کۆمپانیای ئەمنی کە لە عێراق کشایەوە، دوای کـوژرانی یـەکێك لـە چـەکدارەکانی و برینـدار بـوونی یـەکێکی تـری لـە بۆسەیەك لە نزیك بەغدا لە نیسانی ۲۰۰٤. کۆمپانیایێکی رۆمانی بوو بە نـاوی "بایدیپا" کە تەنیا خاوەنی هەشت کارمەند بوو، ئەرکەکەشی بریتی بوو لـە پاسەوانی کردنی ژمارەیەك لە ئەندامانی حکومـەتی کاتـەکی عێراقی. وەکو چۆن بەڕێوەبەرەکەی "دیومێترۆ نیکۆلای" باسی لێوە دەکرد. ١٩٦

رەنگبێ ئـەو هێـرش کردنانـە بـە ئەنقەسـت نـەبووبن، بـەلام وا هەسـت دەکەم ئەو کۆمپانیایانە یەکێك بن لەو سێ ئامانجە سـەرەکیەی کـە گرووپـە چـەکدارەکان، نیـشانیان لێگرتـوون، دوانەکـەی تـریش بـریتین لـە هێـزە چەکدارەکانی عێراقیو سیاسەتمەدارەکانیش.

## هێزێکی مەغاویری گومانلێکراو

چەند هەفتەیەك دوای بە ئامانج گرتنی ئەوروپیەکان، سـوپا سیـستەمێکی رەسمیتری هێنایە ئـارا بـۆ گۆڕینـەوەی زانیـاری لەگـەڵ کۆمپانیـا ئەمنیـەکان، بـەلام ئـەوەی بـووە مایـەی سەرسـوڕمانی خـودی کۆمپانیـا ئەمنیـەکانیش، ئـەرکی هەماهـەنگی زانیـاری تـەواو نهێنـی هـەوالگری خرایـە ئەسـتۆی کۆمپانیـایێکی تـری ئـەمنی لـە بـری دەسـەلاتدارەکانی سـوپا خۆیـان. ئـەوەی زیاتریش ئەو کۆمپانیانەی تووڕە کردبوو، سپاردنی ئەو ئەرکە بە کەسێك کـە نـاو و ناتۆرەیـەکی خراپـی هـەبوو: کۆلۆنێـل "تـیم سپایـسەر" سـەرۆکی کۆمپانیـای (خزمـەتگوزاری بـەرگری و پاراسـتن- Aegies Defence Services)، لەگەڵ "سکۆت گارد" ئەفسەری پێشووی فەوجی دەسـتەبژێری سـەر بـە سـوپای بـەریتانی، کـە پێـشتر بـە قاچاغچیەتی چـەك و تەقەمـەنی تۆمەتبار کرابوو هەروەها بە نەخشە کێشان بۆ ئەنجامدانی چەند کردەیەکی سەربازی دوژمنکاری بە مەبەسـتی پاڵپـشتی کردنـی کارەکـانی کـانو نـەوتو

گاز لەسەرتاسەری جیهان.

گرێبەستیەکە کە بایی ۲۹۳ ملیۆن دۆلار بوو، لە ۲٥ ئایاری ۲۰۰٤ بەخشرا، بۆ دابینکردنی حەفتا و پێنج تیمی پاراستنی توند، هەر تیمێکیش هەشت چەکداری راهێنراوی ئاست بەرزی سەر بە کۆمپانیا ئەمنیەکانی دەگرتە خۆی، بۆ چاودێریکردنو پاراستنی کێڵگەکانی نەوت و گاز هەروەها وێستگەکانی ئاو و کارەباش لە عێراقدا.

مەیجەر "گاری تۆڵمان" وتەبێژی سوپای ئەمریکی، روونی کردەوە کەوا کۆنتراکتەکە بە مەبەستی هێنانە دی "یەکخەرێك" مۆر کرا، یان تەوەرەیەکی هەماهەنگی بۆ کردە ئەمنیەکان و دابینکردنی چاودێری بۆ هەریەکێك لە پرۆژەکانی ژێرخانی کە بەڵێندەرو کۆمپانیاکان سەرقاڵی جێبەجێکردنین: "ئەرکەکەیان بریتیە لە دابەشکردنی زانیاریو رێنمایی کردنو هەماهەنگی لەهەرچوار بەشی عێراق (باکوور، ناوەند، ناوەندی خواروو و باشوور)." ۱۹۷

دەنگۆی ئەو کارە نوێیە قازانج بەخشەی کەوا "تیم سپایسەر" سەرقاڵێتی بۆ ماوەی چەند مانگێك لەسەر زارەکان دەگەڕا. لە کۆتایی مانگی ئادار، لوتێنێت کۆلۆنێل "ئالان براون" بەرپرسی دۆزینەوەی ئەرکوکار بۆ ئەندامانی فەوجێکی هێزی شاهانەی بەریتانیا لە کەمپی "بلان فۆرد" لە دۆرسێت، ئاگاداری بلاوکردەوە بەوەی کۆمپانیای ناوبراو لە عێراق پێویستی بە تەکنیکاری بێ تەلو پەیوەندی هەیە. مووچەی دانراویش دەگاتە ۱۱۰۰۰۰ دۆلار لە ساڵێکدا، کە سێ ئەوەندەی مووچەی گەڵێ لە پۆستەکانی سەربازیە لە بەریتانیا. لەوەش زیاتر ئەو پۆستە مافی وەرگرتنی سەد رۆژ مۆڵەتی هەبوو لە ساڵێکدا.

بۆیە سەبارەت بەم مەسەلەیە براون پێی گوتم: "پیاوەکانی ئێمە لە توانایان دایە هەموو شتێك چاك بکەنەوە، لە رادیۆی بێ تەل تا تەلەفونی

سەتەلایتیش، کەچی مووچەی ساڵانەیان لە بەریتانیا تەنیا ٤٦٠٠٠ دۆلارە. بۆیە سەبارەت بە هەبوونی پۆستێکی ئاوا لە عێراق ئاگادارم کردوونەتەوە. ئینجا بڕیارەکە بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە بچن یان نا."

لە کۆتاییەکانی مانگی ئاداریش، فەیلەقی گشتی ئەفسەرە یاریدەدەرەکان، لە ۆرسی داون لە وێنچیستەر، رایگەیاند کەوا پێویستی بە کارمەند هەیە لە فەرمانبەر بگرە تا کارگوزار " یاریدەدانی کاروباری کارگێری و فەرمانگەیی لە بنکەی سەرەکی، لە کەش و هەوایێك کە هاوشێوەی بنکە سەرەکیەکانی لیوای هێزە سەربازیەکانە، لەگەڵ گەلێ لە هەمان بەش و بەرپرسیارێتی." مووچەی دانراو بۆ ئەو پۆستەش دەگاتە ١٢٩٠٠٠ دۆلار لە ساڵێکدا بۆ یاریدەدەری ئەفسەری شارەزاو ئەزموونـدار، هەروەها ١١٠٠٠٠ دۆلاریش لە ساڵێکدا بۆ یاریدەدەری ئەفسەری بێ ئەزموون.١٩٨

بە پێی گوتەی "گاری تۆلمان" حەوت کۆمپانیا هەوڵی بەدەست هێنانی کۆنتراکتی هەماهەنگیەکەیان دەدا. بە پێی سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو، کۆمپانیا رکابەرەکان بریتی بوون لە (دایان کۆرپ، دەستەی سەرچاوەی لێهاتووی‌و کارامەییە سەربازیەکان MPRI، یەکێك لەو کۆمپانیانەی کەوا مەشق بە سوپای عێراقی دەکات، گروپی کۆنترۆڵکردنی مەترسیەکان، کۆمپانیای ئێرنیس و هەروەها کۆمپانیای ئەمنی "ئۆلیف" بە هاوبەشی). کە ئەو سێ کۆمپانیایەی دوایی لە گەورەترین کۆمپانیاکانی دابینکردنی خزمەتگوزاری ئەمنین لە عێراق. کۆمپانیا دۆڕاوەکان قەبووڵی ئەنجامەکانیان نەکرد بۆیە "دایان کۆرپ" لە حوزەیرانی ٢٠٠٤ ناڕەزایی خۆی لە دژی "تیم سپیسەر" کە گرێبەستیەکەی بۆ دەرچوو، گەیاندە نووسینگەی لێپرسینەوەی گشتی. ١٩٩

بەڵام ئەو کۆمپانیانەی کەوا دژی ئەنجامی زیادکردنەکە وەستانەوە

تەنیا لایەن نەبوون کە پێیان وابووبێ کۆمپانیای "تیم سپایسەر" نەشیاوە بۆ ئەو ئەرکە. چونکە "پیتەر سینگەر" شیکەرەوە و نووسەری کتێبی (جەنگاوەرانی هاوبەش: زێدەبوونی پیشەسازی بەتایبەت کردنی سوپا Corporate Warriors: The Rise of the Privatized Military Industry) و ئەندامی پەیمانگای "Brookings" کە دەزگایەکی لێکۆڵینەوە و دیراسەتە لە واشنتۆن، پێی وابوو نەدەبوایە کۆمپانیاکە ئەو گرێبەستیەی پێ بدرێت، کە دەیگوت:

گرێبەستیەکە دیراسە کردنی حاڵەتی ئەوەیە کە دەبێ چی نەکرێ.... بەدەسپێکردنی ئەوەی، کەمی یان نەبوونی هەماهەنگیو سەرپەرشتیو بەڕێوەبردن لە لایەن حکومەتەوە جەوهەری کێشەکانی سوپا بوون لە پشت بەستنی بە لایەنی تر بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانی. بۆیە پشت بەستن بە لایەنی تر بۆ جێبەجێکردنی کارەکان کە کێشەیەکی گەورەیە لە لای کۆمپانیای تری تأیبەت لە جێی خۆیەتی لەوەی تەنیا شانازی بەخۆ کردنەوە بێت. لەوەش زیاتر، وا لە کۆمپانیاکان دەکات خۆیان بە دوور بگرن لە کۆتو بەندی چاودێری گشتی.

میکانیزمی ئاسایی بۆ زیادکردنی کاریگەری لە گرێبەستی کردن- وەك هەڵبژاردن، پاداشت کردن و سزادانی کۆمپانیاکان لەسەر بنەمای ئەزموون و ناوبانگیان- دووبارە خەوشی تێکەوت. لەوانەیە یەکێك وابزانێت، کۆنتراکتێکی گەورەی ئاوا دەدرێتە کۆمپانیایێك کە پێشینەیەکی زۆری کارکردنی لەو بوارە یان ئەزموونی لەو بوارانە هەبێت، یان سەرقاڵی چالاکی تری گەورە بووبێت لە عێراق. لە بری ئەوە کۆنتراکتەکە درایە کۆمپانیایێك کە خاوەنی ئەزموونی کەمتر لە ساڵێکەو کارە سەرەکیەکانیشی بریتی بوونە لە نەهێشتنی چەتەکانی

دەریا نەوەك بواری رێکخستنو هەماهەنگی ئەمنی، تەنانەت هیچ جۆرە کۆنتراکتێکی گەورەشی پێنەدراوە لە عێراق. ٢٠٠

کەچی هەموو کەسێك هاوڕا نیە لەگەڵ ئەو هەڵسەنگاندنەی سەرەوە بۆ کارەکانی سپایسەر. لە سیرالیۆن هەوڵەکانی سپایسەر لەلایەن دەزگای تایبەتی سەربازیەوە دەست خۆشیان لێکرا، کارەکانیشی بە "جێدەستی فریشتەکان" وسف کرا. لە ساڵی ١٩٩٨ کۆمپانیاکەی سپایسەر " ساند لاین ئینتەر ناشناڵ"، کە کۆمپانیایێکی سەربازی تایبەتە و ژمارەیەك پلەداری بەرزی پێشووی سوپای دامەزراندووە. بەر لەوەی کارەکانی لە نیسانی ٢٠٠٤ بوەستێنرێ، بە هاوکاری "گرێگ مۆرەی" کارمەندێکی پلە نزم لە نووسینگەی دەرەوەی بەریتانیا، گرێبەستیەکی لەگەڵدا کرا بۆ فرۆشتنی ٣٠ تۆن لە چەك و تەقەمەنی بۆ سەرکردە سەربازیەکەی پێشووی سیرالیۆن " تیجان قەباح"، کە ئەمەش پێشێلکردنی ئابلۆقەی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو لەسەر فرۆشتنی چەك بۆ ئەو وڵاتە. "دۆگ برۆکس" سەرۆکی دەزگای کردەکانی ئاشتی نێودەوڵەتی IPOA کە گروپێکی داکۆکیکاری ناسوودمەندە لە بەرژەوەندی کۆمپانیاکانی تایبەتی سەربازی وەك "ساندلاین" کار دەکات، دەڵێت ئەو کارەی کۆمپانیای ناوبراو لە سیرالیۆن بووە هۆی رزگارکردنی ژیانی هەزاران هاوڵاتی مەدەنی، کە دەڵێت: "ساندلاین بە شێوەیەکی بەرچاو کاریگەر بوو. ئامانجی ئەوان لە هێنانەوە سەر دەسەڵاتی حکومەتە هەڵبژێردراوەکە هاتە دی، رەنگبێ ئەو کارە کاریگەری خراپی هەبووبێ بەسەر ناوبانگیان بەڵام رۆڵێکی یەکلاکەرەوەیان بینی لەسەرکەوتن." ٢٠١

لەگەڵ ئەوەش، پرۆژەکەی "ساندلاین" لە سیرالیۆن، گەلێ لە دەزگاکانی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی حکومەتی بەریتانیای وروژاند، کاتێك کە زانرا کۆنتراکتەکە پێشێلکاری ئابلۆقەکەی نەتەوە یەکگرتووەکانی کردووە لە

پێدانی چەك و تەقەمەنی بۆ هەردوو لایەنی تێوەگلاو لە ململانێی چەکداری لە سیرالیۆن. بەلاّم سپایسەر مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی بێ ئاگا بووە لەوەی ئەو پلانە نایاسایی بووبێت و لە کۆتاییدا حکومەتی بەریتانی ناچار بوو رێسای تازە سەبارەت بە بازرگانی چەك و هەڵسوکەوتی کۆمپانیا تایبەتیەکانی سەربازیش دەربکات. ٢٠٢

کارەکەی سپایسەر لە "پاپوا گینیای تازە"، هەرەسێکی تری پەیوەندیە گشتیەکان بوو، بە پێوەرە سەربازیەکانیش کارێکی ناسەرکەوتوو بوو. بەشی رۆژهەلاّتی دوورگەی پاپوا گینیا لە باشووری زەریای هێمن، پارچەیەکی داگیرکراوی بەریتانی و ئەڵمانیەکان بوو، دواتریش کەوتە ژێر ویسایەی ئوستڕالیەکان تا ساڵی ١٩٧٥. لە هەمان ساڵدا پاپوا گینیای تازە لەگەڵ دوورگەی "باوگەین ڤیل" کە نزیکەی ٨٠٥ کیلۆمەتر لە باکووری رۆژهەلاّتی پایتەختەکەی "پۆرت مۆریسبی"یەوە دوورە، سەربەخۆیی خۆی راگەیاند. دواتر دەسبەجێ پاپوا گینیای تازە "باوگان ڤیل"ی داگیر کرد، کە لەوێ کۆمپانیایێکی ئوستڕاڵی CRA (ئێستا بەشێکە لە ریۆ تینتۆ، گەورەترین کۆمپانیای کانەکانە لە جیهان) سەرقاڵی لێدانی کانی مس بوو لە ١٩٧٢.

لە ساڵی ١٩٨٩، خاوەن زەویە لۆکاڵیەکان، کانەکانی "باوگان ڤێڵ"یان داخست وەکو نارەزایی دەربڕین لە پیس بوونی ژینگەو داواکردنی سەربەخۆیش. لە ساڵی١٩٩٧، حکومەتی پاپوا گینیای تازە، کە پشکی لە داهاتی کانەکان دەگەیشتە ٤٤٪، بڕی ٣٦ ملیۆن دۆلاری دایە کۆمپانیای "ساندلاین" بۆ ئەوەی شۆڕش و نارەزاییەکانی خەڵکی "باوگان ڤێڵ" دابمرکێنێتەوە.

مانگێك دوای ئەوە، سەرەك وەزیرانی پاپوا گینیای تازە "یۆلیۆس چان"، سەر لەشکری سوپاکەی، بریگادێری ژەنەراڵ " جێری سینگارۆك"ی لە پۆستەکەی لادا، لەبەرئەوەی ناوبراو سەرزەنشتی گرێبەستیەکەی لەگەڵ

"ساندلاین" کرد و دەشی گوت خەرج کردنی ئەو پارەیە لەسەربازەکانو سوپاکەی ئاکامی باشتری دەبوو کە مووچەیەکی کەمیان پێ دەدرا و لە دەست کەمی چەك و تەقەمەنیش دەیان نالاند. دوابەدوای ئەو بڕیارە، ئاژاوە سەریهەڵدا، دوای ئەوەی سەربازەکانی سەر بە ژەنەڕاڵ سینگارۆك پێشەوایی نارەزاییەکانیان کرد کە ژمارەیان نزیکەی دوو هەزار مەدەنی دەبوو. سەربازەکان ژمارەیەك لە بەڵێندەرەکانی "ساند لاین"ـیان گرتو هەندێکی تریشیان ناچار کرد ئەوێ جێبهێڵن.

دوای تێپەڕبوونی کەمتر لە مانگێکیش سپایسەر بە بەرگێکی جێنزی کۆن و گەچراو خرایە بەردەم دادگا لە پاپوا گینیای تازە. جانتاکەشی کە چوار سەد هەزار دۆلاری تێدابوو، وەکو بەڵگەیەك لەسەر گرێبەستیەکەی لەگەڵ حکومەتە لادراوەکە لە دژی بەکارهێنرا. لە میانەی گوێگرتنەکەی دادگاش، سپایسەر ئەوەی دەرخست کەوا لایەنێکی پرۆژەکە (کە کۆد-ناوەکەی بریتی بوو لە"Operation Oyster") مەبەست لێوەی بەرپاکردنی هەڵمەتێکی دەروونی لە دژی خەڵکی "باوگان ڤێل" بوو بە پاڵپشتی شێوازی رووسی لە هێرشکردن لە رێی هەلیکۆپتەرەوە. پارێزەرەکانی سپایسەر هەوڵی زۆریان دەدا تاکو ماوەی حوکم دانەکە کەم بکەنەوە تا لە کۆتاییدا توانیان حوکمەکە لابدەنو ناوبراو ئازاد کرا، بەڵام "یولیۆس تشان"ـی سەرەك وەزیران ناچار کرا دەست لە کارەکەی بکێشێتەوە. ٢٠٣

## CACI و TITAN

بە جیا لە ئەرکەکانیان بۆ پاسەوانیکردنو پاڵپشتیکردنی هێرشە سەربازیەکان، کۆمپانیا ئەمنیەکان داهاتی زۆریان دەست دەکەوت لەبەرانبەر کارە تەقلیدیەکانی هەوالگری وەك لێکۆڵینەوە. بە سانایی زۆربەی ئەو گرێبەستیە باش ناسراوانە ئەنجام دەدران لە ژوورەکانی ئەشکەنجەدانی بەندیخانەی ئەبو غرێب کە ئێستا بە ناوبانگە.

وەکــو چــۆن "دەیڤــد ئــایزنبێرگ" شــیکەرەوە لــە ئەنجوومــەنی زانیاریەکانی ئەمنی بەریتانی –ئەمریکی، کە بەدواداچوونی لەسەر کۆمپانیا ئەمنیە تایبەتیەکان دەکرد، باسی لێوە دەکات: پێشینەی ئەو گرێبەستیانە هاوشێوەی زۆربەی کارەکانی تری بەکارهێنانی دەستی کارە لە سوپا. بەوەی لە رێی ئەو کۆنتراکتانە بە رەسمی هەوڵ دەدرا دەستی کاری کەمتر بەکار بهێنرێتو لە هەمان کاتیشدا تێچوونەکان کەمتر بکرێنەوە. ٢٠٤

لە رابـردوودا، لێکۆڵەرەوەکان لـە پەیمانگـە نموونەییـەکانی هـەواڵگری راهێنانیـان وەردەگـرت، کـە بنکـەی دیاریکراویـان هـەبوو، وەك پـەیمانگای لێکۆڵینەوەی هێزی سەربازی لە فۆرت هاوتـشوکا لـە باشووری ئـەریزۆنا. بـە پێـی راپـۆرتێکی پـشت راسـت نـەکراوەی گۆڤـاری *WorldNet*، لـە کانوونی دووەمی ٢٠٠٢ سوپا مووچەی مامۆسـتا و راهێنـەرەکانی ئـەو پەیمانگایـەی بـە رادەی ٥٠٪ کەمکردۆتــەوە، ئــەوەش وای لــە ژمارەیــەك لــەو مامۆســتاو راهێنەرانە کرد کە دەست لەکار بکێشنەوە. ٢٠٥

بەهــەرحاڵ، دەرفــەتی کــاری تــازە بــە خێرایــی دەرکــەوت، لــە بەندیخانەیـەکی تایبـەت کـە ئەمریکیـەکان بـەڕێوەیان دەبـرد لـە نیمـچە دوورگـەی گوانتانــامۆ، تیایــدا گومــان لێکــراوو تۆمــەتبارەکانی ســەر بــە رێکخراوی قاعیدە لە ئەفغانستان زیندانی کرابوون، دواتریش بەندیخانەکانی عێـراق کۆنـە بەعـسیەکانیان لـەخۆگرتبوو. بۆیـە لـە بـری ئـەوەی پێنتـاگۆن ســوود لــە شــارەزاو پــسپۆرەکانی ســوپا وەربگرێــت، داوای لــە کۆمپانیــا تایبەتیەکان کرد کەوا وەرگێڕو لێکۆڵەرەوەیان بۆ دابین بکات.

بـۆ ئـەنجام دانـی ئـەو ئەرکـەش دوو کۆمپانیـا دەرکـەوتن، یەکـەمیان؛ کۆمپانیای CACI نێو دەوڵەتی لە ئێرلیگتۆن لە ڤێرجینیـا ( کـە لـە نێـو سوپادا بـە Khaki ناسـراو بـوو) و پێشوتریش بـە سـەنتەری شیکردنەوەی یــەکگرتووی کالیفۆرنیــا California Analysis Center

Incorporated دەناسرا. کۆمپانیاکە لە شەستەکان لەسەر دەستی "هاری مارکویتز" دامەزراوە (کە ناوبراو لە ساڵی ۱۹۹۰ خەڵاتی نۆبڵی لە ئابووری بەدەست هێناوە لە بەرانبەر ئەو توێژینەوەیەی کە ئەنجامی دابوو لەسەر فرەیی سەنەدەکانی بازرگانی هەڵگیراو stock portolio diversification)، یەکەم گرێبەستیشی لە حکومەتی ئەمریکیەوە پێدرا بۆ دیزاینکردن‌و دروستکردنی پرۆگرامێکی کۆمپیوتەری کە بۆ لاساییکردنەوەی مەیدانی جەنگ بەکار دەهێنرا. ۲۰۶

CACI، کە ژمارەی کارمەندەکانی، خۆی لە شەست وسێ کارمەند دەدا، پەیرەوی لە ستراتیژیەتێکی شەڕانگێزی و فراوانخوازی دەکرد بۆ کارەکانی، قازانجیشی لەسەر حیسابی کۆمپانیا لاوازەکان بەدەست دێنا و پەرەی بە کارەکانی دەدا لە گەڵ حکومەتی فیدراڵ لە ڕێی پەیوەندی و یارمەتی چەند کەسایەتیەك لە هەردوو بنکەی هێزی ئاسمانی "کیلی" و "ماکلیلان" لە تەکساس و کالیفۆرنیا ۲۰۷. لە ساڵەکانی نێوان ۲۰۰۱ و ۲۰۰۳ قازانجی کۆمپانیاکە لە ۲۲ ملیۆن دۆلارەوە (لە کۆی سەرمایەو داهاتی ۵۵۷ ملیۆن دۆلار)دا گەیشتە ٤٤ ملیۆن دۆلار (لە کۆی سەرمایەو داهاتی ۸٤۳ ملیۆن دۆلار). ۲۰۸

بۆردی کارگێری کۆمپانیای ناوبراو بەردەوام لافی بە ئەندامێتی ئەو کۆنە ئەفسەرو پلەدارانەی سوپاو کۆنە سیخورەکان لێدەدا، کە بریتی بوون لە "میکایل بایەر" جێگری سەرۆکی بۆردی کارو بزنیسی پێنتاگۆن و راوێژکاری سەربازی سوپاو هێزی ئاسمانی و کۆلێژی جەنگی دەریایی ئەمریکی و تاقیگەی نیشتمانی ساندیا، "باربارا ماکنمارا" یاریدەدەری پێشووی دەزگای ئاسایشی نیشتمانی، "ئارسەر مۆنی" یاریدەدەری پێشووی وەزارەتی بەرگری، هەروەها "لاری وێلش" ژەنەڕاڵێکی پێشووی هێزەکانی ئاسمانی و لە یەکەم ماوەی سەرۆکایەتی بۆشیش بەرپرسی هاوبەشی ستاف

بووە. ٢٠٩

هەر لەگەڵ دەستپێکردنی گرێبەستیە تازەکەی، CACI لە رێی وێب سایتەکەیەوە دەستی کرد بە هاندانی لێکۆڵەرەوەکانی بۆ ئەوەی بچنە ئەفغانستان و عێراق و کۆسۆڤۆ. ئەوانەی کاری لێکۆڵەرەیان پێ سپێردرا پێیان راگەێنرابوو کەوا لە کەش و هەوایەکی حەساوەدا کارەکەیان دەکەن و لە ژێر "سەرپەرشتیەکی گونجاویشدا" هەروەها " لە کاتی چاوپێکەوتنیان لەگەڵ خەڵکە لۆکاڵیەکانی ئەو شوێنانە پاڵپشتی هەواڵگریان بۆ دابین دەکرێت و ئەرکی دەستنیشانکردنی هەرەشەو مەترسیەکانی سەریشیان دەکەوێتە ئەستۆی هێزی هاوپەیمانەکانەوە". لەوەش زیاتر، کارمەندە چاوەڕوانکراوەکانی ئەو پۆستانە، دەبێت توانای مامەڵەکردنیان هەبێت لەگەڵ وەرگێڕەکان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە جۆرەها سەرچاوەی جیاواز. وەکو چۆن لە وێب سایتی کۆمپانیای ناوبراودا هاتووە، ئەو پۆستە پێویستی بە مۆڵەتی ئەوپەڕی نهێنی و رەگەزنامەی ئەمریکی هەیە، هەروەها کەسە کاندید کراوەکانیش دەبێ بە لانی کەم خاوەنی دوو ساڵ شارەزایی بێت لە بواری پۆلیسی سەربازی یان پیشەی هاوشێوەی ئەوە، وەك بوارەکانی جێبەجێکردنی یاسا یاخود هەواڵگری کە توانا و میکانیزمەکانی چاوپێکەوتن و لێکۆڵینەویان لێ فێربووبن. ٢١٠

"جۆی رایان" کە کارمەندێکی کۆمپانیاکەیە، وردەکاریەکانی ماوەی کارکردنی لە ئەبوغرێب لە ئەنتەرنێت لە وێب سایتی رادیۆی "سانت پاوڵ" لە مینیسۆتا KSTP-AM بلاو کردبۆوە. بەلام هەر لەگەڵ ئاشکرابوونی کێشەی ئەشکەنجەدانی زیندانیەکانی ئەبوغرێب، ووردەکاری بەسەر هاتی رۆژانەی ناوبراو لەسەر ئەنتەرنێت لادرا. رایان لە بەسەرهاتەکەی کە لە ٢١ نیسانی ٢٠٠٤ خرابووە سەر تۆڕی ئەنتەرنێت، باسی ئەو پاداشتە دەکات کە خۆی و هاوکارەکانی وەریان گرت لە دوای رادەستکردنیان بۆ

شـیکردنەوەیەکی ووردی لێکۆڵینـەوە لەگـەڵ زیندانیـەکان. وەکـو چـۆن لـە نووسـینەکەی دا دەڵێـت: "سـەرکردایەتیمان هەژانـد و جـارێکی تـر ئیـدارەی CACI پێـوەر و سـتاندەرێکی بـەرزتریان بـۆ سـەربازە گەنجـەکان دانایـەوە تاوەکو پەیرەوی لێ بکەن." ۲۱۱

کۆمپانیایێکی تری بەشداربوو لە رکابەرکێی بەدەست هێنانی گرێبەستی تایبـەت بـە لێکۆڵینـەوە نهێنیـەکان، کۆمپانیـای TITAN بـوو، کـە بنکـە سەرەکیەکەی دەکەوێتە سان دیاگۆ لە ویلایەتی کالیفۆرنیا و ماوەی بیـست و سێ سـاڵە دامـەزراوە. کۆمپانیاکـە نزیکـەی دوازدە هـەزار کارمەنـدی هەیـەو داهاتی ساڵانەشی دەگاتە دەوروبەری ۲ ملیار دۆلار. کاری سەرەکی TITAN بریتیـە لـە فرۆشـتنی زانیـاری و خزمـەتگوزاری پەیوەندیـەکان بـۆ سـوپا و دەزگـا سـیخوری و هەواڵگریـەکانیش. بـە پێـی کـۆنتراکتێکی لەگـەڵ سـوپای ئـەمریکی، کۆمپانیاکـە سیـستەمی هـاردوێری ئامێرەکـانی پەیوەنـدی کردنـی دەفرۆشـتەوە سـوپا. ئێـستاش لـە گرێبەسـتیەکی هاوبەشـدا لەگـەڵ پێـنج کۆمپانیای تر، بایی ۲ ملیار دۆلار ئامێر و پێداویستیەکانی پەیوەنـدی کـردن و هەواڵگری وەك رادیۆو تەزوودەرەوە بۆ دەزگای سیخوری و بەرێوەبەرایەتی نەهێشتنی مادده بێهۆشکەرەکانو نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵیش FBI دابین دەکات، کە لە رێیەوە ئەو دەزگایانە لەسەر بنەمای پێوەرێکی هاوبـەش دەتوانن لە پەیوەندی دابن. ئەو پرۆسـەیەش بـە پـرۆژەی ۲۵ نـاوی دەبرێـت. ۲۱۲

هەروەها کۆمپانیای ناوبراو پـەرەی بـە ئۆتـۆمبێلی سـەربازی لـە جـۆری هامڤی داوە و ناوی لێ نـاوە "پێشبینی کـار The Prophet"، کە رێگـە بـە شـۆفێری ئۆتۆمبێلەکـە دەدات دەستنیـشانی شـوێنی ئـەو کەسـانە بکـات کـە ئامێرەکانی پەیوەندی کردنی وەك بێ تەل بـەکاردەهێنن بـۆ پەیوەنـدیکردن لەگـەڵ ئـامێری مۆبایـل لـە دەوروبـەری ئۆتۆمبێلەکـە. لـەوەش زیـاتر

ئۆتۆمبێلەکە ئارێلێکی حەوت مەتری بۆ دانراوە کە توانای چەمانەوەی هەیە و لە ماوەی ٩٠ چرکەشدا دەتوانرێ بەرزونزم بکرێتەوە، سەرەڕای کوشنێکی دانیشتنی تایبەت بە وەرگێری کۆدی بێ تەلەکە. یەکەم نموونەی ئەو جۆرە ئۆتۆمبێلـەش لـە ئەفغانـستان تاقیکرایـەوە. مـۆدێلێکی تازەتریـشی لێ دروستکراوە، کە ڕێگە بە ژمارەیەك لەو ئۆتۆمبێلانـە دەدات بـە یەکەوە هێرش بکەنە سەر ئامانجێکی دەستنیشان کراو. ٢١٣

لـەوەش زیـاتر، Titan گرێبەسـتیەکی تـری بـایی ٥٤،٨ ملیـۆن دۆلار بەدەسـت هێنـا بـۆ پەرەپێـدانی سیـستەمی کـۆنترۆڵ و ئاگادارکردنـەوەی پێشوەختەی ئاسمانی گەڕۆك AWACS ٢١٤ کە تایبەتە بە نەخشەکێشانی سـیخوڕی. هـەروەها کـۆنتراکتێکی تـریش بـایی ١٨ ملیـۆن دۆلار بـۆ دیـزاین کردنی بەرنامەی کۆمپیوتەری لاساکەرەوەی جەنگ بۆ کەشتیگەلی هێزەکانی دەریایی ئەمریکا لە زەریای هێمن. دواهەمین کۆنتراکتی کۆمپانیـای نـاوبراو بریتیە لە دیزاینکردنی ١٥٠ گەمەی کۆمپیوتەری لاسایی کەرەوەی جەنگی لە هـەر سـاڵێکدا بـە مەبەسـتی بـەکارهێنانیان لـە مەشـقە سـەربازیەکانو بڵاوەپێکردنی سەربازەکان بۆ یەکە جۆراوجۆەکانی سوپای ئەمریکی. ٢١٥

لە ساڵی ٢٠٠٣، داهاتی کۆمپانیاکە لە بەرانبەر خزمـەتگوزاری وەرگێڕان بـۆ هێـزە سـەربازیەکانی ئـەمریکا لـە هـەموو جیهانـدا گەیـشتە ١١٢،١ ملیـۆن دۆلار. کۆمپانیاکـە لـە سـاڵی ١٩٩٩ دەسـتی بـەو کـارە کـردووە، کـە ئـەو کاتـە هەوڵی سەرکێشانەی دەدا بۆ بەکارخستنی وەرگێـڕ لـە زمانـەکانی عـەرەبی، ئـارامی، دەری، فارسـی، جـۆرجی، کـوردی، پەشـتووی، تـاجیکی، ئۆگیـۆری، ئـۆردویی‌و ئۆزبـەکی لـە ڕێـی فـاکس کـردن بـۆ گرووپـە کۆمەڵایەتیـەکانو سەردانیکردنی بنکەکانی بەکارخستن‌و یانـەکانی زمانـەوانی. دواتـریش ئـەو ژمارە تەلەفونـە بـێ بەرانبـەرە (٠٠٦٢٠٠-٨٩٩-٨٠٠-١) و ئیمـایلی هـەردوو کارمەنـدی کۆمپانیاکـە ( بەسـیر قـەهارو چیمەن زێبـاری) لـە گـەڵ گروپـی

گفتوگۆی ئەنتەرنێتی دەردەکەوتن. ٢١٦

ڕێکلامی کۆمپانیاکە بۆ گروپە ئەفغانیەکان بەو شێوەیە دەخوێنرایەوە:

دەرفەتێکی کاری بێ وێنەت لە بەردەمدایە بۆ ئەوەی بتوانیت لە یەککاتدا یارمەتی ئەفغانستانو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش بدەیت لە دارشتنی ئایندەیەکی تازە و وێناکراو بۆ خەڵکی ئەفغانستان، هەروەها دەرفەتیشە بۆ پاڵپشتیکردنی ئاسیشو سەقامگیری لە جیهاندا.... وەکو نەریتێکی پەیرەوکراویش لە سیستەمو سیاسەتی کۆمپانیای TITAN، تۆ بانگێشت دەکەین بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستانەی کە هەیە، وەکو وەرگێڕان لە کاتی چاوپێکەوتنەکاندا، وەرگێڕانی دۆکیومێنتە گرنگەکان و هەروەها ئاسانکاری بۆ حکومەتی ئەمریکی لە تێگەیشتنی کەلتور و نەریتی ئەو وڵاتە، ئەو دەرفەتی کارەش تەنیا لەبەردەم دانیشتوانی ئەو وڵاتە کراوەیە.

ئەو مەرجانەشی کە پێویستە هەتبێتو گەنجاویش بێت لەگەڵ سیاسەتی کۆمپانیاکە: دەبێ هەڵگری ڕەگەزنامەی ئەمریکی بیت، لە تاقی کردنەوەی زمان دەربچیتو، ملکەچیش بیت بۆ ئەو لێکۆڵینەوانەی کەوا حکومەتی ئەمریکی لە بارەتەوە ئەنجامی دەدات.... هەندێکجار کەشو هەوای کارەکان قورس دەبن، بەلام پاداشتەکان بەرزن. گەر خۆت یان کەسێکی نزیکت ئارەزووی کارکردن و بەدست هێنانی کرێیەکی باشی هەیەو خوازیاریشە کاریگەریەکی پۆزەتیڤانەی هەبێت لە شەڕی دژ بە تیرۆر، ئەوا تکایە پەیوەندیمان پێوە بکە. ٢١٧

ئەوەی ئارەزووی وەرگرتنی ئەو کارەی هەبێت، هەر لەگەڵ دامەزراندنی و دوای ئاگادارکردنەوەشی بە ماوەیەکی کورت دەبێ سەفەربکاتو بچێتە

ئەفغانستان‌و، مووچەکەشی دەگاتە ١٠٨٠٠٠ دۆلار لە ساڵێکداو بڕێکی زۆری ئەو مووچەیەش باج نایگرێتەوە. ٢١٨

چەند مانگێکیش بەر لە داگیرکردنی عێراق ئاگادارییەکی هاوشێوەی ئەوەی سەرەوە ئاڕاستەی ڕەوەندەکانی کورد کرا لە ناشڤێل، دالاس و سان دیاگۆ- کە ئەو سێ شارە زۆرترین ژمارەی کوردە نیشتەجێبووەکانی ئەمریکا دەگرنە خۆیان.

لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٢، ئەسۆشییەتد پرێس باسی بەسەرهاتی دووبرای هێنایەوە کە دانیشتووی ناشڤێل بوون- دیار موستەفا کە کرێکار بوو لە بواری تازە کردنەوەی ئەپارتمانەکان، هەروەها ئیدریس موستەفاش، کە پاسەوانی قوتابخانە بوو. ناوبراوان سەفەری واشنتۆنیان کرد و ماوەی هەفتەیەك بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەوێ مانەوە. هەردوو براکە کاتی خۆی لەسەردەمی ڕژێمی سەدامدا ئەشکەنجە درابوون، بۆیە گومان هەبوو لەوەی ئەو دوو کەسە ڕەچاوی مافەکانی مرۆڤ بکەن، چونکە ویستی تۆڵە سەندنەوەیان هەبوو. ٢١٩

"عیماد مێخە" کە کریستیانێکی کلدانی خەڵکی بەسرەیە و لە ئەمەریکا دادەنیشێت، ئەویش کارمەندێکی کۆمپانیای TITANـە. بەر لەوەی وەکو وەرگێڕێکی مەدەنی لە بنکەیەکی سەربازی لە شاری بەعقوبە لە تشرینی دووەمی ٢٠٠٣ لە کۆمپانیاکە وەربگیرێت، بەڕێوەبەری بەشی فرۆشتنی گۆشت بوو لە سوپەرمارکێتێکی شاری پۆنتیاك لە ویلایەتی میشیگان. ناوبراو لە هەفتەی یەکەمی مانگی نیساندا کوژرا، هەمان ئەو هەفتەیە بوو کەوا هێرش‌و کردارەکانی گرووپە چەکدارەکان دژ بە هێزەکانی داگیرکەر زیادیان دەکرد.

بە هەمان شێوەی کۆمپانیاکانی تر لە عێراق، زۆر جار کارمەندەکانی TITANـیش چەکیان هەڵدەگرت (ئەمەش کارێکی نایاساییە بە پێی

یاساکانی سەربازی ئەمریکی) و لەگەڵ سەربازەکانیش دەگەڕان و دەسوڕان، بەمەش دەبوونە ئامانجێکی ئاسانی گرووپە چەکدارە نادیارەکان، کە وەکو خیانەتکار سەیریان دەکردن. ٢٢٠ ئەو وەرگێڕانەی لەگەڵ کۆمپانیای TITAN کاریان دەکرد، ئەوانیش بەوە تۆمەتبار دەکران کە هاوکاری لایەنەکەی تر -گرووپە چەکدارەکان- دەکەن. "احمد فەتحی میحالبا" کە لە شاری بۆستن شۆفێری تاکسی بوو، یەکێك بوو لەو حەفتا وەرگێڕانەی کەوا لە بەندیخانەکەی گوانتانامۆی کوبا وەکو یاریدەدەری لێکۆڵەرەوە کاری دەکرد. ناوبراو لە ئەیلولی ٢٠٠٣ دوای ئەوەی لە گەشتێکی بۆ وڵاتی میسر-کە خۆی خەڵکی ئەو وڵاتەیە- گەڕایەوە، دەسگیر کرا بە تۆمەتی ئەوەی زانیاری نهێنی سەبارەت بەو بەندیخانەیە درکاندووە. ناوبراو پێشتر ڕاهێنراو بوو لە پەیمانگایەکی تایبەت بە فێرکردنی شێوازەکانی لێکۆڵینەوەی سەربازی لە (فۆرت هاوتشوکا) لە ویلایەتی ئەریزۆنا، بەڵام نەیتوانیبوو دەربچێت بۆیە لە ئایاری ٢٠٠١ لە بەر هۆکاری تەندروستی لێخۆشبوونی بۆ دەرچوو. "احمد فەتحی" دۆستێکی (ئافرەتی) هەبوو، کە ئەویش بە ئابڕووچنەوە لە هەمان پەیمانگا دەرکرا، دوای ئەوەی دزینی لاپ تۆپێکی لێ ئاشکرابوو، کە پڕ بووە لە زانیاری نهێنی و هەستیار. لە گەواهیدانێکی نووسراوی "احمد فەتحی"دا هاتووە، نازانێت ئەو زانیاریانەی کەوا هەندێکی بە هەستیار ئاماژەیان پێدرابوو، چۆن هاتۆتە سەر دیسکی کۆمپیوتەرەکەی. ئەو بە لێکۆڵەرەوەکانی FBIـی ڕاگەیاندبوو، کەوا ئەو CDـیە لە مامێکی وەرگرتووە کە لە دەزگای هەواڵگری سەربازی میسری کاری دەکرد و ئێستاش ماوەیەکی زۆرە خانەنشین کراوە. ٢٢١

## تارمایی تر

کێی تر کار لەسەر ئەو جۆرە کارانەی دەزگا هەواڵگریە تایبەتیەکان دەکات لە عێراق؟ بێگومان کۆنە ئەفسەرەکانی CIA، هەرچەندە دیاریش نیە ئاخۆ ئەوانە بەڵێندەری سەربەخۆن یان لەگەڵ کۆمپانیاکان کاردەکەن. ئەسۆشییەتد پرێس باسی یەکێك لە وەکیلە پێشووەکانی CIA دەکات، کە بە خاوەن باجە سەوزەکان- "Green Badgers" ناودەبران- لەبەر رەنگی ناسنامەکانیان کە سەوز بوو. بە پێی گوتەی ئەو وەکیلە، ئەوان دەتوانن سێ ئەوەندەی ئەو مووچەیەیان دەست دەکەوێت کە لە حکومەت وەریدەگرن- واتە زیاتر لە ١٥٠٠٠٠دۆلار لە ساڵێکدا. ٢٢٢

بێگومان زۆر لە بەڵێندەرەکانی دەزگا هەواڵگریەکان دوای ئەوەی کوژران یان وون بوون، ناوەکانیان بلاْوکرایەوە. بۆ نموونە: "کێرك ڤین ئاکیرمان" دانیشتووی مۆس بیتش لە ویلایەتی کالیفۆرنیا. ناوبراو لە ٩ تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢، بێ سەرو شوێن بوو. ئۆتۆمبێلەکەشی لە نێوان هەردوو شاری تکریتو کەرکوکدا بە جێهێڵراوی دۆزرایەوە، لە ناو ئۆتۆمبێلەکەشیدا، تەلەفونێکی سەتەلایتو لاپ تۆپێكو جانتاکەشی کە ٤٠٠٠٠ دۆلاری تیابوو دۆزرانەوە، ئەوەش ئاماژە بوو بۆ ئەوەی ناوبراو ئامانجی دزو جەردەکان نەبووە.

ناوبراو کارمەندی کۆمپانیای "ئۆلترا سێرڤیسیس"ـە، کە بنکە سەرەکیەکەی لە ئەستەمبوڵە، لە بوارەکانی دابینکردنی کەلوپەلو پێداویستی نووسینگەو ناو ماڵ بۆ بنکە سەربازیەکانی ئەمریکا لە عێراقدا کاری دەکرد. ناوبراو پێشوتر لە هێزەکانی ئاسمانی ئەمریکی پلەی نەقیبی هەبووە و دواتریش بۆتە ئەندامی گرووپێکی سەر بە پێنتاگۆن. ئەرکی ئەو گرووپەش بریتی بووە لە کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر تیرۆریزم وسیخوڕیو

جـەنگ‌و هـەر جـۆرێکی تـری هەڕەشـە. بەرلـەوەش وەکـو یاریـدەدەری بەڕێوەبەری هەواڵگری سەر بە هێزەکانی ناتۆ لە بۆسنیەدا کاری دەکرد. ٢٢٣

لە کۆتاییدا، چاودێری تەکنەلۆژیای کۆمپیوتەری‌و دانـەری پرۆگرامی بنکەی زانیاری پێویست بوو بۆ پاڵپشتیکردنی کارەکانی هـەواڵگری. کەسی گونجاویش بۆ ئەم کارە "مایکڵ پۆلیۆت" بوو، جێگری سەرۆکی جێبەجێکار و ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری کۆمپانیای "Tapestry Solution" لە سان دیاگۆ- کۆمپانیایێکی تایبەتمەند بوو بە دیزاین کردنی ئامێری لاسایی کردنـەوەی راهێنانـە سـەربازیەکان. بـە پێـی بـەیانێکی راگەیـەنراوی کۆمپانیاکە، مایکل بە مەبەستی دامەزراندنی سیستەمێکی سۆفت وێر کە یارمـەتی سوپای دەدا بـۆ هەماهـەنگی کـردن لـە کـاتی کـردە سـەربازیەکان، چووبووە کوێت. ٢٢٤ بە پێی بەیانەکە ناوبراو دوو مانگ بەر لە داگیرکردنی عێـراق، لـە بـاکووری شـاری کوێـت کـوژرا. بـەلای بەڵێنـدەرە بـچووک‌و گەورەکانیش، کارکردن لە عێراق بریتیـە لـە سپاردنی ژیانی کەسێك بـە دەست کەسێکی تر.

## کێشە ژمێریاریەکان و لێکۆڵینەوەکان سەبارەت بە بەرتیل

گشت کارەکانی TITAN لەسەرتاسەری جیهان بە عێراقیشەوە خرانـە ژێـر پـشکنین و پێداچـوونەوە. لـە ئـاداری ٢٠٠٤، دەزگـای وردبینـی و پێداچوونەوەی گرێبەستیەکانی سەر بە پێنتاگۆن DCAA (کەم و کورتی لە بەشی ژمێریاری کۆنترۆڵ و چاودێری کرێکارەکان)ـی سەر بە کۆمپانیای نـاوبراو لـە عێـراق دۆزیـەوە، ئەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی کۆمپانیاکە سـزا بدرێت. "ویلیەم رییـد" بەرێوەبـەی DCAA لـە چاوپێکەوتنێکدا، گوتی: "بە کورتی پێمان وتـن، لیستی خەرجیـەکانمان بۆ بنێرن و ئێمـەش تـەنیا بڕی ٩٠٪ ی پارەکەتان پێ دەدەین تا ئەو کاتەی کەم و کـورتی لـە ژمێریـاری

کرێکارەکان چاك دەکەنەوە."

DCAA دەیگوت، کۆمپانیای TITAN سیستەمێکی زۆر ناڕێکی هەبوو لە دۆکیومێنتکردن و ناردنی لیستی خەرجیەکان بۆ پێنتاگۆن، ئەوانەی کە تایبەتن بە تێچوونی هێزی کار و بەدواداچوونی کاری راوێژکارە نائەمریکیەکان. بۆیە دەزگاکە هەڕەشەی لە کۆمپانیای ناوبراو کرد بەوەی پێدانی ٤،٩ ملیۆن دۆلار رادەگرێت تاوەکو ئەو هەڵەو کورتیانەی کە لە ژمێریاریدا هەیە راست دەکاتەوە.

هەر سەبارەت بەو مەسەلەیە، "ویل ویلیامز" وتەبێژی کۆمپانیاکە لە رێگەی بەیانێکی نێردراو بە ئیمایل بۆ پەیامنێرەکان گوتی: "هەردەم کۆمپانیاکەمان بۆ بەدەنگەوەهاتنی داواکاریەکانی حکومەت رێ‌و شوێنی راست‌و دروستی گرتۆتەبەر، بۆیە ئێمە بەردەوام دەبین لەسەرکارکردنی هاوبەش لەگەڵ حکومەت، سەرەڕای خەریك بوونیشیان بە پێداچوونەوەی کارەکانمان لەو رەوشە ئاڵۆزەی کە عێراق پێیدا تێدەپەڕێت."٢٢٥

بەپێی چەند سەرچاوەیەکی نزیك لە خۆشمەوە، ئێستا لێکۆڵینەوە دەربارەی بەرتیل دان بە فەرمانبەرە پلە بەرزەکان لە ئەندەنوسیا، ساحل العاج، نێجیریا، عەرەبستانی سعودیەو زیمبابۆی لەگەڵ TITANدا دەکرێت. ٢٢٦ هەر لە بابەتێکی پەیوەست بە هەمان مەسەلە، "وڵ ستریت جۆرناڵ" باس لەو لێکۆڵینەوانە دەکات کە لەگەڵ کۆمپانیاکە لە بەنگلادێش‌و فلپین ئەنجام دەدرێت.

لێکۆڵینەوەکانیش لەو کاتە دەستیان پێکرد، کاتێك کۆمپانیای "لۆکهید مارتن" کە بەڵێندەری سوپایە و بنکەکەی دەکەوێتە "بیسێسدا"ی ویلایەتی مێریلاند، داوایێکی خستە ڕوو بۆ کڕینی کۆمپانیاکە لە بەرانبەر ١،٨ ملیار دۆلار. لەبەرئەوەی لۆکهیدیش گەورەترین بەڵێندەری پێنتاگۆنە، بۆیە حکومەت دەستی کرد بە پێداچوونەوەی ئاسایی بۆ دڵنیابوون لەوەی کارەکە

قۆرخ کردنی تێدانیه، که ئەو کارەش بووە هۆی ئاشکرابوونی تاوانی بەرتیل دان. ٢٢٧

هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی وەزارەتی داد و SEC بە جیا لێکۆڵینەوە سەبارەت بە "قسەلۆکەکان دەربارەی چەند بڕە پارەیەکی دیاریکراو، هەروەها مەرج و بەهای داواکراویش بۆ کاربەدەستە بیانیەکان ئەنجام بدەن، که، گەر بێتوو ئەو قسەو باسانە راست بن ئەوا پرسیاری ئەوە دێتە گۆڕێ، ئاخۆ TITAN یاسای هەڵسوکەوتی گەندەڵی بیانی پێشێلکردووە؟" ئەوە بە پێی نامەیەکی نووسراو له لایەن جین رای سەرۆکی جێبەجێکاری ستافەکانی TITAN، کە لە رۆژی ٨ ئاداردا ناردبووی بۆ ئەوانەی که مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردن. ٢٢٨

ویلیام بە دەزگاکانی راگەیاندنی گوت: "ئەوانە هەمووی قسەو قسەلۆکن و هیچ بەڵگەیکیش نیە لەسەر ئەنجامدانی کاری خراپ." بەڵام خودی لۆکهید بێ بەری نیە لەو مەسەلانە; چونکه لە ساڵی ١٩٩٥، تاوانبار کرا بەوەی بە نیاز بووە بەرتیل بداتە سیاسەتمەدارێکی میسری له بەرانبەر ئاسانکاری لە تەواوکردنی گرێبەستیەکی تایبەت بە هێنانی سێ فڕۆکەی بارهەڵگر لە جۆری C-١٣٠H، بۆیە بە بڕی ٢٤,٨ ملیۆن دۆلار غەرامە کرا.٢٢٩

بە پێی سەرچاوەکانی تایبەت بە وۆڵ ستریت جۆرناڵیشەوە، وادیارە بەشێکی زۆری گرێبەستیەکانی کۆمپانیای ناوبراو پەیوەستن بە سیستەمی رادیۆیی هێزەکانی سەربازی. "سام دێلی" بەڕێوەبەری بە بازارکردن لە داترۆنی نێودەوڵەتی بۆ پەیوەندیەکان Datron World Communication کە بەشێکی کۆمپانیای TITANA و تایبەتمەندە بە دانانی سیستەمی رادیۆیی سەربازی، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا کرا سەبارەت بەو بڕە پارانەی کە درابوونە نوێنەرەکان وەکو بەشێك لە

لێکۆڵینـەوە ناوخۆییـەکان، هـەروەها یـەکێك لـە هاوکارەکـانی بـە شـێوەیەکی کاتـەکی و بـێ مووچـە لـە کارەکـەی راگـیراوە، تـا دەرکـەوتنی ئـەنجامی لێکۆڵینەوەکان. ٢٣٠

لەلایـەکی تریـشەوە "شـەین هـاریس" نووسـەری بەشـی تەکنـەلۆژیای گۆڤـاری Government Excutive لـە واشـنتۆن، پێـی راگەیانـدم، کۆمپانیـای نـاوبراو رەخنـەی تونـدی لێ گـیراوە لـە کـاتی جێبـەجێکردنی گرێبەستیەکی تایبەت بە دابینکردنی خزمـەتگوزاری تەندروسـتی هـزری بـۆ هێزەکانی سـەربازی، بـەوەی لـە کـاتی دارشـتنی ئـەو کۆنتراکتـەی کـە دواتـر بەدەستی هێنا، تێکەڵبوونی بەرژەوەندیەکانی لێ کەوتۆتەوە ( لە خوارەوە بە درێژی باسی لێوە دەکرێت)، لەوەش زیـاتر کۆمپانیاکـە پێشینەیەکی نـەبووە لەو جۆرە کارانە. وەکو چۆن هاریس ئاماژەی پێدەکرد. ٢٣١

لـە ئـابی ٢٠٠٣، بەڕێوەبەرایـەتی خزمەتگوزاریـە گـشتیەکان GSA لـە جیاتی وەزارەتی بەرگری، کۆمپانیای TITAN و کۆمپانیایێکی تری بە ناوی Ceridian هەڵبژارد بـۆ دابینکردنـی (خزمـەتگوزاری لـە بـواری پرۆگرامـی یارمەتیـدانی کارمەنـدەکان-EAP) بـۆ سـوپا وەکـو بەشـێك لـە زیـادە دابینکردنی پێداویستیەکانی پرۆسە بەردەوامەکان لە عێراق. وەکو چۆنیش لە دوایین وتاری هاریسدا هاتووە، TITAN لە رێی هەندێ رێ و شوێن کە جێگای گومان بوون گرێبەستیەکەی بەدەست هێنا، بە تایبەتیش لەو بەشەی کە پەیوەندی بە کۆمپانیا هاوبەشەکەی Ceridianـەوە هەبووە:

کۆپیـەکی رەشنووسـی پرۆپەزەڵـەکانی ئـەو کـارە، ووردەکـاری تایبـەتی تێدایـە سـەبارەت بـەو مەرجانـەی کـە دەبێ لـە کۆمپانیـای بەڵێندەردا هەبێت، وەکو چۆن روونیش کراوەتەوە دەبێ بە لانی کەم بەشـێکی ئـەم پرۆپەزەڵـە لەلایـەن کارمەنـدەکانی هاوبەشـی دووەم (کۆمپانیـــای Ceridiain) بنووســـرێتەوە. مولکیـــەتی ئـــەو

دۆکیومێنتەش کە لەسەر شێوەی وۆرد مایکرۆسۆفتە، بۆ دەسەڵاتی جێبەجێکاری حکومەت دەگەڕێتەوە. ئەو کەسەشی کە بە نووسەری ئەو فایلە ناسراوە، ناوەکەی هەمان ناوی فەرمانبەرێکی بەرزی کەرتی گشتی سەر بە کۆمپانیای Ceridianـە....

ووردەکاریەکانی تری ئەو دۆکیومێنتە ئەلیکترۆنیە، ئاماژە بەوە دەکەن کەوا لە رێی ئیمایلەوە ناردراوە بۆ لانی کەم فەرمانبەرێکی تری کۆمپانیای ناوبراو لە ژێر ناونیشانی "ئەوە رەشنووسی پرۆپۆزەڵە داواکراوەکەیە." هەروەها دۆکیومێنتەکەش بە ناونیشانێکی رەسمی دەست پێدەکات کە ئاماژەیە بەوەی لەلایەن خزمەتگوزاری تەکنەلۆژی فیدراڵی FTS دەرچووە، کە سەر بە بەڕێوەبەرایەتی خزمەتگوزاریە گشتیەکان GSAـە، ئەو بەشەش بریتیە لە یەکەی کرێ لە بەرانبەر خزمەتگوزاری کە بەرپرسیارە لە بەڕێوەبردنی هۆکارەکانی زانیاریە تەکنەلۆژیەکان لە بری دەزگاکانی تر. هەروەها دۆکیومێنتەکە سیستەمێکی رێکخراوی ژمارەیی لەسەر دەبینرێت، ئەو ژمارانەش لە کاتی راگەیاندنی زیادکردنی ئاشکرا لەلایەن GSAیەوە دادەنرێت. ٢٣٢

## ئەشکەنجەدان لە ئەبوغرێب

بە پێی راپۆرتێکی ناوخۆی نهێنی پەنجاو سێ لاپەڕەیی، ئامادەکراو لەلایەن مەیجەر ژەنەراڵ "ئەنتۆنیۆ تاگوبا"ـەوە، هەردوو کۆمپانیای CACI و TITAN، دەستێکی باڵایان هەبووە لە مەسەلەی ئەشکەنجەدانی زیندانیەکانی ئەبوغرێب. راپۆرتەکە باس لە کردەوەی چوار لە بەڵێندەرە مەدەنیەکان دەکات بە ناوەکانی (ستیڤن ستیڤانۆیج، جۆن عەزرائیل، تۆرین نیلسۆن و عادل نەخلە). هەر چواریشیان دەستنیشان کرابوون بۆئەوەی کار

بۆ لیوای ٥٠٥ی هەوالگری سەربازی بکەن، کە یەکەیەکی سەربازی ئەمریکیە لە ئەڵمانیاو ئیتاڵیادا جێگیرن، بە پاڵپشتی فەوجی V لە ژێر سەرکردایەتی کۆلۆنێل "تۆماس پاپاس".

لە راپۆرتەکەی سوپادا هاتووە، "ستیڤانۆیج" کە لێکۆڵەرەوەیە لە CACI " زانیاری چەواشەکاری داوەتە تیمی لێکۆڵینەوە سەبارەت بە: ئەو شوێنانەی کە لێکۆڵینەوەی تیادا کردوون، ئەو چالاکی و کردەوانەشی کە لە کاتی لێکۆڵینەوەکاندا ئەنجامی داون و هەروەها سەبارەت بە ئاگادار بوونیشی لە پێشێلکاریەکان. لەوەش زیاتر لێکۆڵەرەوەکان بۆیان دەرکەوتبوو کەوا ناوبراو هانی پۆلیسەکانی سوپای داوە بۆ ئەوەی هەڕەشە لە زیندانیەکان بکەن و بیانترسێنن، لەوەش دەچوو ناوبراو دەیزانی ئاکامی ئەو رێنماییانەی کە دەیدان، ئازاردانی جەستەیی زیندانیەکانی لێ دەکەوێتەوە. هەروەها بەڵێندەری دووەم "جۆن عەزرائیل"ـە کە بەڵێندەرێکی لاوەکی TITAN بووە، پێدەچوو لێکۆڵەرەوەکانی چەواشە کردبووبێت، چونکە نکۆڵی لەوە دەکرد کە هیچ کارێکی ناڕەوا و پێشێلکاری بینیبێت. لە راپۆرتەکەدا هاتووە، هەر لە بنەڕەتەوە نەدەبوایە عەزرائیل لەو شوێنە بوایە چونکە ناوبراو لەرووی ئەمنیەوە رێگەپێدراو نەبوو. بەڵێندەری سێیەمیش "عیماد نەخلە" پرسیاری سەبارەت بە جۆری مامەڵەکردن لەگەڵ زیندانیەکان لێکرا، بەوەی دەست درێژیان کراوەتە سەر و لەسەر زاری خۆی لە راپۆرتەکەدا هاتبوو کەوا دوو لە سێرجێنتەکانی سوپا زیندانەکانیان ناچار دەکرد "هەڵسوکەوتی نامۆ" بکەن لە کاتێکدا جلەکانیان لەبەر داکەنرابوو، ئینجا دوای ئەوەی دەست و قاچیان دەبەستانەوە ناچاریان دەکردن بە سەر یەکتریدا کەڵەکە ببن. یەکێکی تریش لە بەڵێندەرە مەدەنیەکان، تۆمەتبار کرابوو بەوەی دەست درێژی کردبێتە سەر زیندانیە هەرزەکارەکان، بەڵام ناوی لە راپۆرتەکەدا نەهێنرابوو. کۆتایی راپۆرتەکەش، بریتی بوو لە

پوختەی لێکۆڵەرەوەکان: "بە گشتی لەوە ناچێت چاودێریەکی گونجاو و باش هەبووبێت لەسەر بەڵێندەرە مەدەنیە ئەمریکیەکانی سەر بە کۆمپانیاکانی TITAN و CACI و هتد، سەرەڕای نەبوونی چاودێریش بۆ هاولاتیەکانی هەندێ لە ولاتانی جیهانی سێیەم و بەڵێندرە لۆکالیەکانیش، لە نێو ژوور و هۆڵەکانی بەندیخانەی ئەبو غرێبدا." ٢٣٣

(ئیدارەی بۆشیش رایگەیاند کەوا، تەنیا چەند سەربازێکی نابەرپرسیار کردارەکانی ئەشکەنجەدانیان ئەنجام داوە. بەلام هەر لە میانەی ئەو نووسینەی حکومەتی ئەمریکی، رۆژانە راپۆرتێك سەبارەت بەم مەسەلەیە بلاودەکرایەوە و تیایدا هۆکار و فاکتەری تر دەردەکەوتن. راپۆرتێکی دەرچوو لە خاچی سووری نێودەوڵەتی، باسی لەوە دەکرد: سەرباری ئازاردانی جەستەیی و شکاندنەوە و جنێودانیش، لێکۆڵەرەوەکان چاویان بە ژمارەیەك زیندانی کەوتبوو کە جەستەکانیان بە بەرگ و پاکەتی خۆراکی ئامادەکراوی سەربازی داپۆشیبوو. بە شێوەیەکی گشتیش زیندانیەکان، بە پەشۆکاوی و شێواوی دەبینران. بگرە هەندێکیان ئارەزووی خۆکوشتنیان دەکرد، کە گەلێ نیشانەی نائاساییان لێ دەردەکەوت، لە بەر زۆری ماوە و شێوازەکانی لێکۆڵینەوە لەگەڵیاندا. راپۆرتەکە باسی لەوە دەکرد کەوا دەسەلاتدارانی بەندیخانەکە هیچ روون کردنەوەیەکیان نەداوە سەبارەت بە کەمی پۆشاك و هیچ پۆزشێکیشیان بۆ نەهاتەوە سەبارەت بەو خراپە کاریانەی کە لە بەرانبەر زیندانیەکانەوە ئەنجام درابوو.) ٢٣٤

لە لێکۆڵینەوەیەکی دواتریشدا دەرکەوت، هەموو ئەو بیست و نۆ لێکۆڵەرەوانەی کەوا گرێبەستیان هەبووە لە ئەبو غرێب، کارمەندی CACI بوونە، هەروەها دەرچووی کۆلێژیشن و خاوەنی مۆڵەتی نهێنی و ئەوپەڕی نهێنیش بوونە. پێشتر یازدە کەسیان خزمەتی سەربازیان کردووە و ئەوانی تریش لە ریزی پۆلیس. کە ئەوانەن: (کێڤن بلودووس، سەربازێکی دێرینی

هێزەکانی ئاسمانی دانیشتووی گرێت فۆلس لە ویلایەتی مۆنتانا کە بە "Blood" ناسراو بوو، هەروەها تۆماسی دۆگن، لە پاسکانای ویلایەتی ئۆهایۆ بە "Big Dog" دەناسرا. کێس پاوەڵیش کە کارەکەی بریتی بوو لە وێنە گرتنی زیندانیەکانی ئەبو غرێب، پێشتر لە هێزەکانی پۆلیس لە (مۆبایل)ی سەر بە ویلایەتی ئەڵەباما کاری دەکرد.) ٢٣٥

تۆرین نیلسۆن، کە پێشتر بۆ ماوەی ساڵێك لەگەڵ گاردی نیشتمانی "یوتاه" لە گوانتانامۆ کاری کردووە و دواتریش لە کەرتی تایبەت لەگەڵ CACI دەست بەکار بووە، بەم جۆرە وەسفی خاوەن کارە پێشووەکەی دەکات: "هەرکاتێك چاوی سەرپەرشت و بەرپرسەکانمان لەسەر نەبوایە- کەم جاریش دەرفەتی وا رێك دەکەوت- بە تەواوەتی ئازاد دەبووین و ئارەزوومان لە چی بوایە دەمانکرد."٢٣٦ رۆژنامەی گاردیانی بەریتانی راپۆرتێکی لەسەر زاری نیلسۆندا بلاّوکردەوە کە تیایدا ناوبراو باسی سەرەتای ناسینی بۆ CACI دەکات: "لە ئەیلولی ٢٠٠٣، لە رێگەی تەلەفونەوە چاوپێکەوتنێکم لەگەڵدا کرا، زیاتر لە رێکلام کردن دەچوو بۆ کۆمپانیاکە لەوەی چاوپێکەوتنێکی پرۆفیشناڵی بێت بۆ وەرگرتنی کارمەند. دوای ئەوەی وەرگیرام، هیچ کەسێکم لە کۆمپانیای ناوبراو نەبینی تا ئەو کاتەی چوومە بنکەی "فۆرت بلیس" (کە سەنتەرێکی وەرگرتنی سەربازەکانە لە تەکساس)، ئینجا لەوێ چاوم بە کارمەندی تری کۆمپانیاکە کەوت." ٢٣٧

"ستیڤانویتش" کە یەکێك بوو لە هاوکارەکانی نیلسۆن لە CACI، ئامراز و شێوازەکانی لێکۆڵینەوەی بە "بەرنامەی رێکخستنی خەوتن و خواردن" وەسف دەکرد. بە پێی ئەو بەرنامەیە زیندانیەکان بۆیان نەبوو لە رۆژو شەوێکدا زیاتر لە چوار کات ژمێر بخەون، هەروەها تا ماوەی حەفتاو دوو کات ژمێریش خواردنیان پێ نەدەدرا. ٢٣٨

بەدەر لە کارەکانی لێکۆڵینەوە، کۆمپانیای TITAN وەرگێڕەکانیشی

ناکارامەو بێ مۆڵەتی ئەمنی بوون. جۆن عەزرائیل، کە مەسیحیەکی ئەمریکی بەرەگەز عێراقی و دانیشتووی سانتا کلاریتا لە ویلایەتی کالیفۆرنیا بوو، لەلایەن دەزگای وەرگێڕانی SOS گرێبەستی لەگەڵدا کرابوو بۆ ئەوەی وەکو بەڵێندەرێکی لاوەکی لەگەڵ TITANدا کاربکات. ناوبراو لە ١٤ تشرینی یەکەمدا، گەیشتە عێراق و بە وەرگێڕ لە دەزگای هەواڵگری سەربازیدا کاری دەکرد. بە هەمان شێوە هەر پەنجا وەرگێڕەکانی سەر بەTITAN و SOS، لە بەندیخانەی ئەبوغرێبدا کاریان دەکرد، کە هەمووشیان خاوەنی رەگەزنامەو دانیشتووی ئەمریکا بوون. بەلام بە رەگەز خەڵکی شوێنی تر بوون. لە نێو هەمووشیانەوە تەنیا یەك کەسیان مۆڵەتی ئەمنی هەبووە.

زۆربەی ئەو وەرگێڕانەش، پێشتر ئیش و کاری زۆر سادە و ئاساییان دەکرد. بۆ نموونە: "خالد عومان" کە بە رەگەز سعودیە، بەر لەوەی بچێتە عێراق و بە وەرگێر لە هەردوو کۆمپانیای ناوبراو کاربکات لە ئەبو غرێب ، لە کالامازۆی سەر بە ویلایەتی مێشیگان بەڕێوەبەری هۆتێل بووە. هەروەها بەکر ناسیف، بە رەگەز ئوردونیە، پێشتر پاسەوانی ئەمنی پرسگەی کۆمپانیایێکی تەکنەلۆژی بوو لە ئۆستنی سەر بە ویلایەتی تەکساس، کە تەنیا کەس بوو مۆڵەتی ئەمنی پێدرابوو. عادل نەخلەش، بەرەگەز میسریەو بەرلەوکارەی، پێشتر بۆ ماوەی ساڵێك‌و پێنج مانگ لە کۆمپانیای (Abacus Enterprise) کە کۆمپانیایێکی کۆمپیوتەر و نێتوێرکە کاری دەکرد، پێش ئەوەی شوێنی دانیشتنەکەی جێبهێڵێت لە گایسرسبێرگ لە ویلایەتی مێریلاند. ٢٣٩ عادل نەخلە یەکێك بوو لەو کەسانەی کە لە وێنە بلاوکراوەکانی ئەبو غرێب دەرکەوتبوون، لەسەرەوەی کۆمەڵە کەڵەکەبووەکەی زیندانیە روتەکانی کە لە وێنەکەدا دیاربوون وەستابوو. خۆی بۆ خوارەوە چەماندبۆوەو دەستی خستبووە سەر یان نزیك ملی

یەکێك لە زیندانیەکان. ناوبراو کە کەسێکی چوارشانەو بالآبەرزە، خۆی بە کەسێکی ناتوندوتیژ دەزانێت و دەڵێت: "لە کاتی گرتن‌و بەستنەوەی قاچی زیندانیەکان بە هیچ شێوەیەك ئازارم نەدەدان." ٢٤٠

## لێکۆڵینەوە لەگەڵ لێکۆڵەرەوەکاندا

ئیڤان فریدریك کە پلەی سێرجێنتی هەبوو، یەکێك بوو لەو سەربازانەی کەوا ناوی لە راپۆرتەکەی تاگوبادا هاتبوو، کە ئێستا لەبەردەم دادگای سەربازیە. مامی ناوبراو ناوی "ویلیام لاوسن"ـە پێی گوتم: برازاکەی بە لێکۆڵەرەوەکانی راگەیاندبوو کەوا بەشێکی بەرپرسیارێتی ئەو پێشێلکاریانە دەگرێتە ئەستۆ: "ئەو دەیویست ئەو پێشێلکاریانە بگەیێنێتە سەرووی خۆی، بەلآم ئەفسەرە پلەدارەکان پێیان گوتبوو، گەر هاتوو لێکۆڵینەوەت لەگەڵ زیندانیە عێراقیەکان ئەنجامدا، ئەوا نابێت لە رێنمایی بەڵێندەرە مەدەنیەکان دەربچیت. بەو جۆرە: (بگەرێوە شوێنەکەی خۆت. بەڵێندەرە مەدەنیەکان چیت پێ دەڵێن ئاوا بکە و دەست مەخەرە نێو کارەکانیان، تا نەبیتە هۆکار بۆ ئەوەی سەربازەکانی تریش واز لە لێکۆڵینەوەکان بێنن)."

دوابەدوای ئەوە لاوسن داوای کرد لێکۆڵینەوە لەگەڵ کارمەندەکانی کۆمپانیاکەدا بکرێت، گەر پێویستیشی کرد ئەوا دەبێت دادگایی بکرێن. ناوبراو لە رێی پەیوەندیەکی تەلەفونیەوە لە ماڵەکەی خۆی لە نیوبێرگی ڤێرجینای رۆژئاوا، پێی گوتم: "من ماوەی ٢٣ ساڵی تەمەنم لەسەربازیدا بردۆتە سەر، لە ڤێتنامیش خزمەتم کردووە. هەروەها وڵاتی خۆمم خۆش دەوێت، بەلآم رێگە نادەم برازاکەم ببێتە قوربانی خەڵکی تر." ٢٤١

لە راگەیاندنێکی ئامادەکراودا، لە ٥ ئایاری ٢٠٠٤، سەرۆکی جێبەجێکاری CACI گوتی: " بە هیچ شێوەیەك و لە هیچ بارودۆخێکیشدا

ڕێگە بە هیچ جۆرە کردەوەیەکی نایاسایی ناداتو لە هیچ کارمەندێکیشی خۆش نابێت کە کردەیەکی نەشیاو ئەنجام دەدات لە هەر شوێنێکو هەر کاتێکیش بێت. لە حاڵەتی ئەوەی سەلمێنرا هەر کارمەندێکی کۆمپانیاکە دەستی لە هەر هەڵسوکەوتێکی نایاسایی هەبووە، لە هەرکاتێك و بە هەر جۆرێکیش بووبێت لەو کێشەیەی کە لە عێراق ڕووی داوە و میدیاکان باسی لێوە دەکەن، من خودی خۆم ڕێ و شوێنی خێرا و گونجاو و دەسبەجێ لە دژی ئەو کارمەندانە وەردەگرم." ٢٤٢

بەلأم شارەزاکانی بواری یاسا دەڵێن، لە ڕووی یاساییەوە ئەو کەسە مەدەنیانەی کەوا لەگەڵ سوپادا کاردەکەن، هیچ یەکێك لە یاساکانی سەربازی و عێراقیش نایانگرێتەوە. تەنیا لەبەر یەك شت، ئەویش لە حوزەیرانی ٢٠٠٣دا برێمەر پاراستنی بەڵێندەرە مەدەنیەکان و کارمەندەکانیشیانی مسۆگەر کردبوو. وەکو چۆن خۆی نووسیبووی، بەگشتی ئەو بەڵێندەرانە یاساکانی سزایی و مەدەنی عێراقی نایانگرێتەوە و ڕووبەڕووی دەسگیرکردنو زیندانیش نابنەوە.

ڕەنگبێ گەڵێ لەو یاسا نوێ و پەیوەستدارانەی کە ئەزموون نەکراون، بتوانن ئەو بۆشاییە یاساییانە پڕبکەنەوە. لە ساڵی ١٩٩٤ یاسایەکی تایبەت بە ئەشکەنجەدان لە دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دارێژرا. یاساکە پێناسەی ئەشکەنجەدانی کردووە بەوەی بریتیە لە لێدانێکی توندی جەستەیی یان ئازاردانی عەقڵیو دەروونی، بەلأم یاساکە لەو کاتە جێبەجێ دەکرێت گەر بێتوو حکومەت هەڵسوکەوتە ئەنجامدراوەکەی بە ئەشکەنجەدان هەژمارکرد.

یاسایەکی تر لە ساڵی ١٩٩٦ دەرچوو، کە بە - یاسای مافی تەماشاکردنی داوا لە دەرەوەی یاسادارشتنی نیشتمانی، سەربازی بۆ ساڵی ١٩٩٦- ناسرا، بە پێی ئەم یاسایە ئەو کەسە بیانیانەی کە بۆ یاخود لەگەڵ سوپای ئەمریکی

لـە دەرەوەی ئـەمریکا کاردەکـەن، گـەر هـاتوو پێـشێلی هـەر بەنـدێکی پەیماننامـەی جنێڤیـان کـرد لـە پـەیڕەوی کردنـی ئەشکەنجەدان و شکاندنی کەرامـەتی کەسـەکانو بـێ ڕێـزی پێکـردن، دەکـرێ لـە نـاو ئـەمریکا داوایـان لەسـەر بـەرز بکرێتـەوە و بدرێنـە دادگـا. واتـە بـە پێـی ئـەو یاسـایە ئـەو کەسانەی کەوا لەگەڵ سوپای ئەمریکی ئیش دەکەن، خەڵك و دانیشتووی ئەو شوێنەشـن کـەوا ئەمریکیـەکانی لێیـە، ئـەوا پـارێزراو نـابن، تـەنیا ئەمریکیـەکانو خـەڵکی هەنـدێك لـە وڵاتـانی تـر نـەبێت. هـەمان یاسـا لـە حاڵەتی مردنی قوربانیەکە لە کاتی ئەشکەنجەداندا، چەند سزایەکی وەك زینـدانی کـردن بـۆ مـاوەی درێـژو هەنـدێك جاریش سـزای کوشـتنی لـەخۆ گرتووە.

لە حاڵەتی زیندانیەکانی گوانتانامۆش، ئیدارەی بۆش پـەنای بـردە بـەر ئـەو یاسـایە بـۆ ئـەوەی خـۆی لـە پابەنـد بـوون بـە پەیماننامـەی جنـێڤ بدزێتەوە. ئەوە لە کاتێکدا بوو کە ئیدارەکە ڕایگەیاند پەیماننامـەی جنێـف لەسـەر زیندانیـەکانی عێـراق جێبـەجێ دەکرێـت. لەگـەڵ ئـەوەش بـە پێـی یاسـاکەی سـاڵی ١٩٩٦، تـەنیا کـەس کـە بدرێتـە دادگـا، کارمەنـدەکانی ئـەو بەڵێندەرانـەن کـە پێنتـاگۆن گرێبەسـتی لەگەڵـدا کـردوون. کەچـی بەڵێنـدەرەکانی کە لەلایـەن دەزگاکانی تـری وەك CIA و وەزارەتـی نـاوخۆ گرێبەستیان لەگەڵدا کراوە ڕووبەڕووی لێپرسینەوە نابنەوە. ٢٤٣

## گرێبەستیەك بۆ ژێر گڵ *

**(لە کتێبە ئینگلیزیەکە ئەو ناونیشانە بەو جۆرە هاتووە: Smokey the Bear Contract، ئـەو دەسـتەواژەیە ئاماژەیـە بـۆ کەسـایەتیەکی کارتۆنی ئەمریکی، ورچێکی ئاگر کوژێنەرەوەیەو گڵ بە ئاگردا دەکات بۆ ئەوەی تەشەنە نەکات، لێرەش مەبەستەکە ئەو کۆنتراکتەیە کە دەخوازرێت*

*لـه سنورێکی دیـاریکراودا دەرنەچێت و تـەنیا بـدرێت بـە یـەك کۆمپانیـا، وەرگێڕ)*

ئـەو لێکۆڵەرەوانـەی کـە لـە ئـەبو غرێـب کاریـان دەکـرد، گرێبەسـتیان لەلایەن سوپا نەبوو، بەڵکو لەلایـەن سـەنتەری کارەکانی نیشتمانی سـەر بـە وەزارەتـی نـاوخۆ لـە فـۆرت هواتـشوکا لـە سـیرا ڤیـستای ئـەریزۆنا بـوو، کـە دەکەوێتـە باشـووری ڕۆژهـەلاتی تۆکـسان لـە دووری ١١٢,٦ کیلۆمـەتر. ڕێکەوتنیش لەسـەر ئـەو کۆنتراکتانـە ئاکامی هەوڵەکانی حکومـەت بـوو لـە نەوەدەکان بۆ "ئاسانکاری و کـەم کردنـەوەی کـۆپی کـردن" ئـەویش لـە ڕێـی مامەڵەکردن لەگەڵ چەند دەزگایێکی دیاریکراوی شارەزا لە کارەکانی کارگێڕی و شێوازی ڕێکخستنی لیستی مووچە یان گرێبەستی کردن و کاری لەو بابەتە بۆ دەزگاکانی تر.

لـە سـاڵی ٢٠٠١، ئۆفیـسی گرێبەسـتیە ناوخۆییـەکان، کـۆنتراکتێکی بـۆ "ڕێکـەوتن لەسـەر کڕینـی بـەتانی" دایـە کۆمپانیایـەك بـە نـاوی گرووپـی تەکنـەلۆژیای سـەرەکیPremier Technology Group (PTG) بـۆ دابینکردنـی خزمـەتگوزاری جۆراوجـۆر بـۆ سـوپا. بـە پێـی ئـەو ڕێکەوتنـە حکومـەت بـۆی هـەبوو خزمـەتگوزاری لـەم کۆمپانیایـە بکڕێـت بـێ ئـەوەی جارێکی تر بۆ ئەنجامدانی هەر کارێکی تـازە ناچـار بێـت زیـادکردنی ئاشکرا ڕابگەیەنێت. لەدوای ٢٠٠١، وەزارەتـی نـاوبراو لـە چوارچێوەی گرێبەسـتیەکی هاوبەشـی نێـوان PTG و CACIدا هەشـتاو یـەك کـۆنتراکتی تایبـەت بـە "گەیاندنی کەرەستەی داواکراو" پەسەنـد کرد کە یانزە کۆنتراکتی بۆ عێـراق بوو. لە ساڵی ٢٠٠٣، دەستکەوتەکانی CACI و PTG، وای لە حکومەت کرد کەوا خزمـەتگوزاری لـە هـەردوو کۆمپانیاکـە بکڕێـت بـێ ئـەوەی زیـادکردنی ئاشکرا ڕابگەیەنێت. زۆربەی هەرە زۆری خزمەتگوزاریەکانیش بریتـی بـوون لە تەکنەلۆژیای سەربازی جگە لە دوو کۆنتراکت نەبێت- یـەکێکیان بەهاکـەی

دەگەیشتە ١٩,٩ ملیۆن دۆلارو تایبەت بوو بە دابینکردنی پێداویستیەکانی لێکۆڵینەوە، ئەوەکەی تریشیان بەهاکەی دەگەیشتە ٢١,٨ ملیۆن دۆلارو تایبەت بوو بە دابینکردنی پێداویستی بۆ کارەکانی هەوالگری مرۆیی.

رەخنەگرەکان گاڵتەیان بەو رێکەوتنە دەهات، وەکو چۆن "پیتەر سینگەر" لە پەیمانگای برۆکینگز دەڵێت: "تۆ ئەرکی لێکۆڵینەوەی سوپا دەخەیتە (ژێر گڵ) بەمەش ناتوانی چاودێریەکی باشت بەسەریەوە هەبێت" ٢٤٤ هەروەها لێکۆڵینەوەکانی حکومەت کە لە رێی GAOـیەوە ئەنجامی دەدا، دەریان خستبوو کەوا پێنتاگۆن پشتگیری نزیکەی دوو سەد هەزار کەسی کردبوو لەوانەی کە کاریان بۆ CACI و بەڵێندەری تریش دەکرد، لە چاوەڕوانی بەدەست هێنانی مۆڵەتی ئەمنیش بوون. بەخشینی مۆڵەتی ئەمنی لەو کاتە ساڵێکی دەخایاند. جگە لەو شەستو یەك هەزار داوایەی تایبەت بە نوێکردنەوەی مۆڵەتەکانیش کە دەبوایە هەر پێنج ساڵ جارێك ئەنجام بدرایە.

لە گەواهیدانێکی بەردەم کۆنگرێسدا لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣، "تشارلس ئابێڵ" جێگری بەڕێوەبەری بەشی تاکەکان لە وەزارەتی بەرگریدا، دانی بەوە دانا، هەندێك لە کارمەندەکانی کەوا بە گرێبەست دامەزراون نێردراونەتە عێراق بێ ئەوەی مۆڵەتی ئەمنیان بۆ بکرێت ئەویش لەبەر" پەلەپەل کاری بۆ دابینکردنی داواکاریە زۆرو کەڵەکەبووەکان." ٢٤٥

## پوخته

لەبەشێکی پێشووی ئەو کتێبە جەختم کردبووە سەر ئەو دەرئەنجامەی کەوا عێراقیەکان پێی گەیشتبوون. ئەویش: بەڵێندەرەکان هیچ شتێکیان لە عێراقدا چاك نەکردۆتەوە، ئەو دەرئەنجامەش بووەتە هۆی پووچکردنەوەی هەر هەوڵو تەقەلاێکی پۆزەتیڤانەی ئاوەدانکردنەوە کە ڕەنگبێ بەئەنجام گەیەنرابێت. بەهەمان شێوە، فراوانی بڵاوبوونەوەی چەکدارەکانی کۆمپانیا ئەمنیە تایبەتیەکان بۆتە هۆی بێ متمانەییو تووڕە بوونێکی زۆرتر. هێزەکانی داگیرکەر کەوتوونەتە هەلومەرجێکەوە کە دوو ڕێگەیان لە بەردەمە: یان کێشانەوەی چەکدارەکانی کۆمپانیا ئەمنیە تایبەتیەکانو بەمەش ڕووبەڕوی کوشتن دەبنەوە، یا ئەوەتا پتەوکردنیانو بەهێزکردنیان بۆ ئەوەی شوێنی سەربازەکان بگرنەوەو تووڕەیی خەڵکی دابمرکێننەوە. گەرنا، ئەوا ئەو ڕووداوەی فەللوجە جارێکی تریش دووبارە دەبێتەوە.

هەروەها، ئامادەبوونی هێزە ئەمنیە تایبەتیەکان و بینینیان، بێگومان بووە هۆی وروژاندنی چەندین پرسیاری بنەڕەتی: ئەو خەڵکە کێن ئێمە بەکرێمان گرتوون؟ گەر بە ڕاستی هەندێکیان قاچاغچی چەك بن یان بکوژی ناودار یاخود ڕابردوویان لە ئەشکەنجەدانی خەڵکی هەبێت، کەواتە ئێمە خەریکی دروست کردنی کۆمەڵێك دڕندەین! دەزگا سیخوڕیەکان دەستێکی باڵایان هەیە لە مامەڵەکردن لەگەڵ بەڵێندەرە تایبەتیەکان بۆ ئەوەی ڕۆڵی کەسی ناوەندکار (وسیگ) بگێڕن ئەویش بە مەبەستی مسۆگەرکردنی "ڕەتکردنەوەیەك کە شیاوی باوەڕپێکردن بێت Plausible Deniability"، بە تایبەتیش لەسەردەمی شەڕی سارد دا، کاتێك کە ئەو دەزگا سیخوریانە هەوڵی ناردنی چەكو تفاقیان دەدا بۆ بەرهەڵستکارە کۆمیونیستەکان لە وڵاتەکانی وەك ئەفغانستانو نیکاراگوا. ئەو کەسانەشی

بۆئەوئەرکە بەکرێ گیرابوون، دەستەیەك بوون لە کۆنە نازیەکانی وەك "ئێرنست وارنەر گلانت" و "گێرهارد مێرتێنز" کە رابردوویان هەبوو لە دابینکردنی کەرەستەی سەربازی بۆ رژێمی سەدام حسێنو موجاهیدەکانی ئەفغانستانیش. ٢٤٦

پەنابردن بۆ کۆمپانیا ئەمنیەکان لە دابینکردنی ئاسایشو کاری پاسەوانیو لێکۆڵینەوە لەگەڵ دەسگیرکراوان، لە دیاردەیەك کەوا تەنیا لە هەندێ حاڵەتدا پشتی پێ دەبەسترا، بووە پیشەسازی. هەروەها ئەو باسوخواسانەی، دەیانگوت ئەوە رێگاچارەیەکە بۆ گێڕانەوەو پاشەکەوتکردنی پارە، گشتی بێ بنەما دەرچوون، چونکە وەکو چۆن لە بەشی یەکەمی ئەو کتێبەدا ئاماژەم پێ داوە، ئەو پارەیەی کە دەدرێتە ئەو بەڵێندەرانە زۆر زیاترە لەوەی دەدرێتە کارمەندە حکومیەکان. (ئەوەی جێگای پێکەنینیشە، پارەکەیان زۆر زیاترە لەو پارەیەی کە دەدرایە راهێنەرەکان و پەیمانگاکانی سەر بە سوپاو دەزگاکانی هەواڵگریش، ئەوانەی راهێنانیان بە چەکدارەکانی ئەو کۆمپانیایانە کردووە.) بە زانینیی ئەوەشی کەوا ئەو کۆمپانیایانە تەنیا لە بۆنەی دیاریکراو وەك کاتەکانی شەڕ کاریان هەیە(واتە کارێکی بەردەوام نیە). گەر بێتوو مشت و مڕ سەبارەت بە تێچوون و پارەی خەرج کراوی ئەو کۆمپانیانەش بەلاوە بنرێت، ئەوا لەحاڵەتی عێراقدا ناکرێ چاوپۆشی لێ بکرێت چونکە بە درێژایی ساڵ لەکارکردن دان. لەگەڵ ئەوەش کۆنتراکتەکان رەنگدانەوەی شتی زیاترن لەوەی تەنیا هۆکارێك بن بۆ بەفیڕۆ دانی پارەو پوڵ. بەوەی هیچ لایەنو دەزگایەك توانای کۆنترۆڵکردن و چاودێریکردنی ئەو گرووپو کۆمپانیانەی نیە. چونکە بودجەی تەرخان کراو لەلایەن حکومەتەوە بۆ ئەو کۆمپانیایانە بە نهێنی دادەنرێتو کۆمپانیاکانیش لەلایەن خۆیانەوە هیچ نیازێکیان نیە بۆ ئاشکراکردنی بڕو قەبارەی ئەو سەرمایە نهێنیەی کە هەیانە. راستی

ئەوەشی کەوا ئەو کۆمپانیانە، کەسانی وا دادەمەزرێنن کە سەرکەوتوو نەبوونە لە بەدەست هێنانی پۆستو کاری حکومیو پێشینەی خراپیشیان هەیە لە پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤو بگرە لە هەندێ حاڵەتدا ئارەزووی تۆڵە سەندنەوە بە سەریاندا زاڵە، وادەکات ئەو دیاردەیە مەترسیدارتر بێت.

لە کۆتایی مانگی نیسانی ۲۰۰٤، کە خوێناویترین مانگ بوو، هاوکاتیش بوو لەگەڵ یادکردنەوەی داگیرکەریەکە، پێنج لە سیناتۆرە دیموکراتەکان، دەرکیان بەو شتانە کرد کە لە عێراق روویان دەدا، داواشیان لە GAO کرد دەست بە لێکۆڵینەوەکان بکات دەربارەی چالاکیو ئاکامی بەکارهێنانی بەڵێندەرە ئەمنیەکان لە عێراقدا.

ئەو نامە شەش لاپەڕەییە، ئیمزای هەر پێنج سیناتۆری لەسەر بوو کە بریتی بوون لە: (کریستۆفەر دۆد نوێنەری کۆنێکتێکت، جاك رید لە رۆد ئایسلەندەوە، پاتریك لیهی لە ڤێرمۆنتەوە، جۆن کۆرزین نوێنەری نیوجێرسی و هەروەها راسل فینگۆڵدیش نوێنەری ویسکۆنسۆن)، چەندین پرسیاریش وروژێنرابوو سەبارەت بە سی و پێنج بابەتی وەك: رادەی تێوەگلانی بەڵێندەرەکان، دەستنیشانکردنی ژمارەو ناو و ناونیشانی بریندارو کوژراوەکانیان ئەویش بە مەبەستی روونکردنەوەی راددەی تێچوون و بەرپرسیارێتی حکومەت. بۆیە سیناتۆرە ناوبراوەکان ئەو پرسیارانەیان ئاراستەی پشکنەرەکانی GAO کرد: " تا چ راددەیەك ژیانی سەربازو کارمەندە ژن وپیاوەکانی حکومەت لە مەترسی دا دەبێت، لە حاڵەتی ئەنجامدانی کردەی هاوبەش یاخود هاوکاری کردنی ئەو کۆمپانیا تایبەتیانە بۆ سوپا، یاخود لەو شوێنانەی کەوا چەکدارەکانی ئەو بەڵێندەرانە کار و چالاکیان هەیە؟" ۲٤۷.

لەوش زیاتر سیناتۆرەکان داوایان لە GAO کرد کەوا دەستنیشانی بەرپرسیارێتی یاسایی ئەو کۆمپانیا تایبەتیانە بکات، جا چ بخرێنە ژێر

رکێفی دادپـەروەری سـەربازی یـاخود رێـسای هێـزە چـەکداریەکان. هـەروەها دیاریکردنی ئەو لایەنەی کەوا دەسـەلاتی سـەیرکردنی داوا بـەرزکراوەکان لـە دژی ئەوانی دەبێت، تاکو لـە کـاتی ئەنجامـدانیان بـۆ تـاوان بـە سـزای خۆیـان بگەیەنێت. وەلامی حکومەتیش بۆ نامەکە لە باشترین حاڵەتیدا لاواز بوو، لە خراپترینیـشی بریتـی بـوو لـە ئامـاژەیـەک بـۆ پەسـەندکردنی سیـستەمی چەسپاندنی پارێزگاری " غرس الحصانه".

# بەشی چوارەم

# حکومەتی سێبەر

گـەر بێتـوو بەڵێنـدەرەکانی سـوپا وکۆمپانیاکـانی ئاوەدانکردنـەوە و بەڵێندەرە ئەمنی و هەوالگریەکانیش، خۆشیان لە دەسکەوت و داهاتی شەڕی عێراق بینیبێت، ئەوا سامانەکانیان تەنیا بەشێکی ئەو پاداشتە بووە کە لەلایـەن بەڵێندەرەکانـەوە داواکـراوە لەبەرانبـەر بـەڕێوەبردنی کاروبـاری دەوڵـەت و بەتایبـەتکردنی ئـابووری عێـراق. لـە ئاکامیـشدا، شـەڕو پێداویستیەکانی شەڕیش تەنیا بریتـی بوون لـە ئامرازو هۆکار بۆ گۆڕینی رژێمەکە، خودی شتەکە.

رای گشتی ئـەمریکی ئاراسـتە دەکرا بـەرەو ئاقـاری بـاوەڕکردن بـەوەی هەوڵەکانی گۆڕانکاری یان یەکخستنەوە لە نێو پێنتاگۆن و CIA و وەزارەتی دەرەوە و کۆشکی سپیش، پێویست دەکات لە عێراقەوە بێت. لـە کاتێکدا ئـەو مەسـەلەیە بـە گـشتی راسـتە، بـەلام ئـەو دەزگـا بیرۆکـرات خوازانـە، بۆیـان دەرکەوت کەوا بەڕێوەبردنی رۆژ بە رۆژی حکومەتو سیاسەت لە عێراقدا تا رادەیەك شتێکی سەرلێ شێوێنەرە. بە کورتی نەیاندەزانی چۆن دەست بکەن بـە پرۆسـەی "بیناکردنـەوەی نیـشتمان." هـەروەها هـیچ یارمەتیـەکی ئەوتۆشـیان لـە ئەنجوومـەنی حوکمی عێـراق بەرجەسـتە نـەکرد کـە خۆیـان دایانمەزراندبوون. چونکە ئەنجوومەنەکە لە کۆمەڵێك خوازیاری پلەو پایەی سیاسی کاسەلێس پێك هاتبوو لەگەڵ ژمارەیـەك لـەو دوورخـراوە گەڕاوانـەی کە خاوەنی ئەزموونێکی کەمی بیرۆکراسیەت بوون، هەروەها پڕیشی بوو لەو

ئەندامانـەی کـە بەشـێکی زۆری کاتـەکانیان سـەرف دەکـرد لـە هـەوڵی سـوود وەرگـرتن لـە پۆسـتەکانیان بـە هیـوای دروسـت کردنـی کاریگـەری. قـسەو قسەڵۆکێکی زۆریش هەبوو، سەبارەت بە هۆکاری نەگواستنەوەی راستەخۆی دانیـشتنەکانی ئەنجوومەنەکـە لـە ڕێـی کەناڵـە تەلەفزیۆنیەکانـەوە، چـونکە ژمـارەی ئەندامــەکانی بـەردەوام کـەمبوونو هـۆڵی کۆبوونـەوەکانیش تـا رادەیـەك بـەتاڵ بـوون، لەبەرئـەوەی ئەندامـەکان بـۆ بەشـداریکردن لـە کۆنفرانسەکانی ئاوەدانکردنەوەی عێراق لەسەرتاسەری جیهاندا بەردەوام لە گەشت و گەڕاندا بوون.

بۆیە لە شوباتی ٢٠٠٣، نەخشە دارێژەرەکانی داگیرکاریەکە، روویان کردە کۆمپانیـا تایبەتیـەکان و گرێبەسـتیان لەگـەڵ (کۆمپانیـای نێودەوڵـەتی بـۆ زانـستە جێبەجێکاریـەکان Science Applications Inernational Corporation "SAIC" لــە ســان دیــاگۆی کالیفۆرنیــا)دا کــرد بــۆ دامەزراندنی ئەنجوومەنی پەرەپێدان و ئاوەدانکردنەوەی عێراق IRDC لە ئارلینگتۆن لە ڤێرجینیا. کە لە رووی کارەکیەوە بریتی بوو لە حکومـەتێکی سێبەری دووره ولاتی پێك هێنراو لەو عێراقیـە ئەمریکیانـەی کـەوا پلانیـان دادەرێـژا بـۆ بـەڕێوەبردنی ئـەو ولاتـە لـە دوای رووخانـدنی رژێمـی سـەدام حوسێن. ٢٤٨

## کۆمپانیای دزەکار

SAIC چیە؟ SAIC یەکێکە لەو دە کۆمپانیانـەی کـەوا گرێبەستیان لەگەڵ پێنتاگۆندا هەیە ٢٤٩، هەروەها یەکێکیشە لەو پێنج کۆمپانیانەی کەوا CIA گرێبەستیان لەگەڵدا دەکات و بە پێی راپۆرتەکانیش بە پلە یەك دێت لە گرێبەستی کردن لەگەڵ دەزگای ئاسایشی نیـشتمانی NSA ٢٥٠. لـە ساڵی ٢٠٠٣، ئـەو کۆمپانیـا نەناسـراوە، بـووە خـاوەنی ٥,٩ ملیـار دۆلار، هـەروەها

ریزبەندی ٢٨٩هەمین کۆمپانیای پێدرا لە کۆی ٥٠٠ گەورەترین کۆمپانیا لە ئەمریکادا.٢٥١ زۆرترین سەرچاوەی داهاتەکانیشی لە خزمەتگوزاریەکانی چاودێریکردن بوو بۆ دەزگاکانی سیخوری ئەمریکی، کە تەنیا پێنج هەزارو بڕێك لە کارمەندەکانی (واتە یەك لەسەر هەشتیان) هەلگری مۆڵەتی ئەمنی بوون. ٢٥٢

"کێس نایتینگل" ئەفسەری ئەرکە تایبەتیەکانی سوپا لە لێدوانێکیدا بۆ گۆڤاری Business ٢ کە لە سان فرانسیسکۆ دەردەچێت، گوتی: "ئێمە کۆمپانیایێکی دزەکارین، لە هەموو شوێنێك داین و هەرگیز نابینرێین." کۆمپانیای ناوبراو لە ساڵی ١٩٦٩ لەسەردەستی "جەی رۆبەرت بایستەر" دامەزراوە و سیستەمی بەڕێوەبردنی نامەرکەزیە و کارمەندەکانیشی دەتوان ببن بە خاوەنی پشك لە کۆمپانیاکەدا. بایستەر پێشوتر زانای ناوەکی بووە و لەگەڵ تاقیگەی نیشتمانی ئەلامۆس کاری دەکرد، هەروەها هەلگری یەك لە نهێنیترین مۆڵەت بووە کە کەسێکی مەدەنی لەو وڵاتە پێی درابێت. SAIC سامانێکی زۆری بەدەست هێنا لەگەڵ گەشەسەندنی بواری تەکنەلۆژیای ئەنتەرنێتی، کاتێك کە لە ساڵی ١٩٩٦ سایتی Network Solutionsـی کڕی (ناوە بنەڕەتیەکەی وێب سایتەکەی وەکو خۆی هێشتەوە)، لە بەرانبەر ٤,٥ ملیۆن دۆلار و دواتریش بە ٣,١ ملیار دۆلار فرۆشتیەوە. بەر لەوەی دەربکەوێت کە ئەوە نرخێکی زۆر زێدەڕەوی لێ کراوە. ٢٥٣

SAIC دەیان گرێبەستی لە حکومەت بەدەست هێناوە. لەوانە راهێنانی مارشاڵەکانی هێزی ئاسمانی بۆ بەڕێوەبەرایەتی فرۆکەوانی فیدراڵی، کارکردنی هاوبەش لەگەڵ کۆمپانیای بەکتل بۆ گواستنەوەی پاشماوە ناوەکیەکانی وێستگەی "یوکا ماونتەین" بۆ رۆژئاوای "شوشۆن تەرەیدیشناڵ لاندس" (سەرەڕای نارەزایی دەربڕینێکی زۆری ئەمریکیە رەسەنەکان) و هەروەها گرێبەستیەکی تایبەتیش بە لەناوبردنی چەکی

کیمیایی له "ئەبێردین پروڤینگ گراوند". پەیمانگای نیشتمانی شێرپەنجە کۆنتراکتی لەگەڵ کۆمپانیای ناوبراودا کرد بۆ هاوکاری کردنی له ئەنجامدانی توێژینەوە له "فریدریك له مێریلاند"، دیسانەوە بەرێوەبەرایەتی ئاسایشی هۆکارەکانی گواستنەوە، داوای له کۆمپانیاکە کردبوو، ئەو مەقەست و چەقۆ گیرفانانه لەناو ببات کە لە فرۆکەخانەکاندا دەستیان بەسەردا گیرابوو. له کۆتاییشدا کۆمپانیاکە ئامرازی هەرزانی وەك رۆکێتی نیشان راست بۆ هەلیکۆپتەری له جۆری "ڤیگیلاند" بەستی، کە بەم زووانه لەلایەن سوپاوە دەخرێتە ژێر تاقیکردنەوە. ٢٥٤

ئێستاش دوو له بەنرخترین بەرهەمی کۆمپانیاکە بریتین له " Tara Text" و "Latent Sematic Indexing (LSI)"، کە پرۆگرامێکی تایبەتە بە دانانی زانیاری لەلایەن دەزگاکانی هەوالگری وەك (NSA)ـوە بەکاردەبرێت بۆ هەلاوێردانی ژمارەیەکی زۆری زانیاری کۆکراوە له رێگەی تەلەفون و فاکس و ئیمایل و جۆرەکانی تری پەیوەندی ئەلیکترۆنی. ئەو بەرنامەیە له توانایدا هەیە له هەر چوار چرکەیەکدا مامەڵە لەگەڵ دوو ملیار دۆکیومێنت بکات له رێگەی دیاریکردنی نموونەکان و پەیوەندیشیان بە ناو و زاراوە و بیرۆکەکان. بۆ نموونە، رەنگبێ گریمانەی جۆری شیکردنەوەی داواکراوی CIA بۆ هەموو دۆکیومێنتەکان باس له ناوی "پاریس"، وشەی "خەوتوو"، هەروەها زاراوەی "فرۆکە" بکات (بۆیە دەبێتە کۆدێکی گریمانەیی بۆ هێرشێکی تەقینەوەی خۆکوژی) لەسەر بنەمای گەڕان له رووی زمان و کات، هەروەها هەڵیشدەستێت بە گێڕانەوەی هەموو ئەو شوێنانەی کە له ماوەی دیاریکراودا له یەك رستەدا دەردەکەون. LSI زانیاری هەوالگری ساختەی بەکاردەهێنا، کە ئەو جۆرە زانیاریانە رێگەی پێدەدا بە دوور له وابەستەکانی نێوان دەق و دۆکیومێنتە گشتیە رێگیراوەکان هەڵسەنگاندن ئەنجام بدات، تەنانەت گەر نموونە و

دۆکیومێنتەکان نارِوونیش بن ئەوە هەر دەریان دەخات.

بێگومان، کاتێك "ویلیام بلاکی کورِ" کارمەنـدی دێرینـی NSA دوای ماوەیەکی کورت لە کارکردنی بۆ دەزگای هەوالگری لە سالّی ١٩٩٧ خانەنـشین بوو. دواتر لە SAIC دەست بـەکاربوو بـۆ مـاوەی سێ سالّ لەوێـدا مایـەوە، ئینجـا دووبـارە گەرِایـەوە NSA، کـە لـە سـالّی ٢٠٠٠ کرایـە یاریـدەدەری بەرِێوەبـەر. دوای دوو سـالّ، SAIC گرێبەسـتیەکی بـایی ٢٨٢ ملیـۆن دۆلار بەدەسـت هێنـا کـە تایبـەت بـوو بـە چـاودێریکردنی دوا قۆنـاغی "ترایـل بلایزەر" کە بریتیـە لـە گشتگیرترین سیـستەمی هـەلاّوێردکردنی گـوێگرتن (تنصت) لە مێژووکەیدا. ٢٥٥

کۆمپانیاکـەش وەکـو وەبـەرهێنانێکی لابـەلا چـەندین ملیـار دۆلاری خـستۆتە کـار بـۆ کـارە سـیخورِیەکانی. هـەروەها بـە نیـازی دامەزرانـدنی دەزگایەکی راگەیاندنیش بوو کە لە رێی گرێبەستیەوە رێگا بـۆ عێراقیـەکان خۆش دەکات بـبن بـە خـاوەنی بلاّوکـراوە و چاپەمەنی سـەربەخۆی تایبـەت بەخۆیان لەسەردەمی دوای رژێمی سەدامدا.

## پروپاگەندە بۆ خەلّکی

زەینـەب عبدالحمیـد، رێپۆرتـەری تـۆرِی راگەیانـدنی عێراقـی IMN، رادیـۆ و تەلـەفزیۆنی ئەلعێراقیـە، بـە شـەکەتیەوە لەسـەردانی رۆژانـەی بـۆ وەزارەتی نەوت لە بەغدا دەگەرِایەوە. نـاوبراو لـە دوو لایەنـەوە چـاوەروانی هـەوالّی دەکـرد، کەچـی هیـچیانی پـێ نەگەیـشت، بۆیـە ئـەو رۆژە بابـەتێکی ئـەوتۆی لەبـەر دەسـت نـەبوو تـاکو پەخـشی بکـات. نـاوبراو ئـەرکی بەدواداچـوونی بـارودۆخی کارمباشـی کـەوتبووە ئەسـتۆ، لەگـەلّ ئەوەشـدا بـەردەوام لـە دلّەرِاوکێـدابوو ئـاخۆ لەسـەر کارەکـەی دەمێنێتـەوە یـان نـا. لەسەرەتاکانی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣ بە نیگەرانیەوە دەیرِوانیە چارەنووسی

SAIC كه سەرچاوەی مووچەكەی بوو، ئاخۆ لەو ئەركەی دوور دەخرێتەوە یان نا، بە تایبەتیش كە باس و خواسێكی زۆر دەربارەی دوورخستنەوەی كۆمپانیاكە هەبوو.

ناوبراو بە زەردەخەنەیەكەوە پێی راگەیانم: "ئەمڕۆ هیچ هەواڵێك نەبوو، رەنگبێ بەیانی هەبێت." هەشت مانگ بەسەر لابردنی رژێمی سەدامدا تێپەڕیوە، سەرەڕای خەرجكردنی ملیارەها دۆلاریش لە پێناو بوژانەوەیدا، كەچی ژێرخانە بنچینەییەكانی عێراق هەر نالەبارن: شاری بەغدا رۆژانە لە دەست پچڕانی كارەبا بۆ ماوەی زیاتر لە دە كاتژمێر دەناڵێنێ. زەینەب دەیگوت: " ئێستا ئازادین لەوەی راپۆرت لەسەر هەر شتێك ئەنجام بدەین، بە پێچەوانەی سەردەمی رژێمی سەدام، كە دەبوایە ریپۆرتاژ لەسەر ئەو بابەتە بكەین كە حكومەت دەیخواست."

لە كاتی چوونیشی بۆ سەر كارەكەی، ناوبراو دەبوایە بە نێو تۆڕێكی تێكچرژاوی تەل درو سەكۆی كۆنكرێتی و سێ خاڵی پشكنین كە لەلایەن هێزی پاسەوانی نیشتمانی فلۆریدا و كۆمپانیایێكی ئەمنی تایبەتی عێراقی بە ناوی ISIدا تێپەڕیبوایە. نووسینگەی ناوبراو لە نهۆمی سێیەمی بالاٌخانەی سەنتەری كۆنفرانسەكان بوو لە بەغدا، ئەو شوێنەی كەوا سوپای ئەمریكی كۆنگرەی رۆژنامەوانی تێدا دەبەست. رێكەوتیش نەبوو كە نووسینگەی سەرەكی ئەلعێراقیە راستەوخۆ كەوتبووە سەرووی بارەگای هێزەكانی ئەمریكا- چونكە سوپای ئەمریكی تاكە سەرچاوەی دارایی ئەو دەزگایە بوو. لە دواهەمین خاڵی پشكنیندا كە دەكەوتە دەروازەی رێڕەوی ئەو نهۆمەی كە نووسینگەی ئەلعێراقیەی لێبوو، ناوبراو بە لای تەلەفزیۆنێك دا تێپەڕی كە بەردەوام یا لەسەر كەناڵی ئەلجەزیرە ومیان ئەلعەرەبیە دانرابوو، دوو ناودارترین كەناڵی ئاسمانی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستداو ركابەرێكی سەرەكیو دژواری تۆڕی دەزگاكانی راگەیاندنی عێراقی بوون. ٢٥٦

له ١١ ئاداری ٢٠٠٣، سەرکردایەتی کۆنتراکتەکانی بەرگری گرێبەستیەکی بایی ١٥ ملیۆن دۆلار لەگەڵ SAICدا کرد بۆ بەڕێوەبردنی تۆڕی راگەیاندنی عێراقی، کە هەشت رۆژ بەرلە داگیرکردنی عێراق دەستی پێکرد، بێ ئەوەی هیچ نەخشەڕێژیەك یاخود رکابەرکێیەك و زیادکردنێکی ئاشکرا ئەنجام بدرێت. ئەوەش مانای ئەوەیە، کۆمپانیای ناوبراو تاکە بەڵێندەرە کە رەزامەندی لەسەر دەدرێت بۆ سەرپەرشتیکردنی تۆڕی پەخشکردنی میدیایی لە دوای لادانی رژێمی سەدام حوسێندا، هەروەها ئاماژەشە بۆ ئەوەی خورتیەکی نائاسایی هەبووە بۆ پێداگیری لەسەر پێدانی کۆنتراکتەکە بۆ تەنیا یەك بەڵێندەر. ٢٥٧

وەکو چۆن لەسەرەتای ئەو بەشە ئاماژەم پێداوە، کۆمپانیای SAIC بوارەکانی کارکردنی بە هیچ شێوەیەك میدیاو راگەیاندن ناگرێتەوە. نزیکترتین کاریشی بۆ ئەو بوارە گرێبەستیەك بووە بۆ بەڕێوەبردنی کامێراکانی چاودێریکردن لە کاتی یاریەکانی ئۆڵۆمپیدا. ٢٥٨ بەلاّم وێب سایتی کۆمپانیاکە، باس لە پرۆگرامێکی نۆ خاڵی دەکات دەربارەی "دەست بەسەرداگرتن و ئاراستەکردن و کۆنترۆلکردنی زانیاریەکان" کە دەستپێدەکات بە "کۆنترۆلکردنی بەرەی جەنگ"و کۆتایشی دێت بە "زانیاری ململانێیە چەکدرایەکان/ زانیاری پرۆسەکان." رەنگبێ شارەزایی کۆمپانیاکە لە بەڕێوەبردنی ئەو جۆرە راگەیاندنە جەنگیانە، هۆکار بووبێت بۆ بەدەست هێنانی کۆنتراکتی بەڕێوەبردنی دەزگاکانی راگەیاندنی عێراقی.٢٥٩

## شەڕێکی دەروونی یان زانیاریەکانی دوێنی؟

بێگومان، یەکەم پەخشی تەلەفزیۆنی تۆڕی ڕاگەیاندنی عێراقی، پەخشکردنێکی ناڕوون و لێڵ بوو، کە سەرچاوەکەی لە بنکەی هێزەکانی ئاسمانی "Commando Solo" EC-١٣٠E فڕۆکەکانی پرۆسە سایکۆلۆژیەکانی (psy-ops)* ئەمریکیەوە بوو(* *زاراوەیەکە سوپاو دەزگا هەواڵگریەکان بەکاری دێنن بە تایبەتی لە ئەمریکا کە بە (psy-ops) واتە (psychological operations) دەردەبردرێت: جۆرە تەکنیکێکە بەکاردێت بۆ کارلێکردن لە گروپێك یان کۆمەڵێکی مەبەست دار لە ڕووی بەها، باوەڕ، سۆز، بیرکردنەوەو ئاکاریش. گرووپی مەبەستداریش دەکرێت حکومەت یا ڕێکخراو یان گرووپی تر یاخود تاکەکان بن، دەشێ ئەو تاکتیکە بەکاربهێنرێت بۆ دانپێنانی ڕاستیەکان یاخود بەهێزکردنی هەڵوێست و جوڵانەوەکانی کە لە بەرژەوەندی ئەنجامدەری ئەو جۆرە تاکتیکەوە دەشکێتەوە، وەرگێڕ*). سەرچاوەی پەخشی تۆڕی ڕاگەیاندنی عێراقی لەگەڵ پەخشی ڕادیۆیی بۆ ناوچەکانی باشوور لە کوێتەوە بوو. کە بەرنامە ئاساییەکانی ڕادیۆ لە ١٠ نیسان و تەلەفزیۆنیش لە ١٣ ئایاری ٢٠٠٣ـەوە دەستیان بە پەخشکردن کرد. ٢٦٠

لەوکاتەدا، بەرنامەکانی تۆڕی ناوبراو زیاتر سیمای ئاهەنگ گێڕانیان پێوە دیار بوو وەك شێوازێکی شەڕی دەروونی، بەڵام بەهەمان شێوەی ئاکامی داگیرکاریەکە، هەر لەگەڵ سەرەتای دەسپێکردنی ئاشووب و ئاژاوە، دەرکەوت کەوا تەنیا سەرابە. دوای تێپەڕبوونی تەنیا چەند مانگێك، چەندین ڕەخنە و گلەیی ئاڕاستەی ئیش و کارەکانی کۆمپانیای SAIC کرا بەوەی کوالێتی و جۆری پروپاگەندەو ڕاگەیاندنەکانی خراپن و ناشارەزاییان پێوە دیارە. پرسیارم لە خەڵکی سەر شەقامەکانی بەغداو بەسرە دەکرد، کە ئاخۆ

سەیری بەرنامەکانی کەناڵی ئەلعێراقیە دەکەن، بەردەوام بە نەخێر وەڵامیان دەدایەوە. ئەوەشی کە زۆر جێگای سەرسامی بوو، زۆر لەوانەی رقیشیان لە سەدامو رژێمەکەی هەبوو، هەروەها ئەوانەی لایەنگری ئەمریکیەکانیش بوون، هەمان وەڵامیان دەدایەوە. بۆیە زۆرینەی خەڵکی هەواڵەکانیان لە کەناڵی ئەلجەزیرەو ئەلعەرەبیە وەردەگرت. ئەو دەستەواژەیەش بەردەوام دووبارە دەبۆوە: "ئەلعێراقییە هیچ دەنگو باسو هەواڵێکی تازەی نیە، تەنیا زانیاریەکانی دوێنێ نەبێت".

ریپۆرتەرە پەستبووەکانی ئەلعێراقیەش هاوڕابوون لەگەڵ ئەو قسەیەی سەرەوە بەڵام دەیانگوت، ئەو رێساگەلەی کە لەلایەن دەسەڵاتی هێزەکانی داگیرکەر دەرکراوە رێگرنو بوونەتە کۆسپیش لەبەردەم ئەنجامدانیان بۆ ریپۆرتاژ لەسەر بابەت گەلێك کە رەنگبێ ببنە هۆی هاندانی توندوتیژی.

"دۆن نۆرس" رۆژنامەوان و پەیامنێرێکی ئەمریکیە، پێشوتریش وەکو پەیامنێری کەناڵە هەواڵیەکانی ABCو NBC لە ڤێتنام و واشنتۆن کاری کردووە، ئەلعێراقیەی بە "پرۆژەیەکی مایە پوچ" ناوی دەبرد دواتریش دەستی لەکار کێشایەوە. ناوبراو لە وتارێکیدا کە Television Week بڵاویکردبۆوە نووسیبووی: "تۆڕی راگەیاندنی عێراقی بۆتە وتەبێژێکی بێ ناواخن، کە تەنیا پروپاگەندە بۆ دەسەڵاتی کاتەکی هاوپەیمانەکان دەکات، هەواڵ بەرێوەدەباتو بەرنامەکانیشی لە ئاستێکی مام ناوەند دان. دوای رووخانی رژێمە داپلۆسێنەرەکان لە هەریەك لە بۆسنیا، رۆمانیا و ئەفغانستانیش راهێنانم بە رۆژنامەنووسان کردووە. بۆیە پێم وانیە رۆژنامەوانە عێراقیەکان هۆکاری هەرەسهێنانی تۆڕی راگەیاندنی عێراقی بن، هەر بۆیەش گلەییەکەم ئاراستەی ئەوان ناکەم. دەسەڵاتی هاوپەیمانەکان لە رێگەی ئاوێتەیەك لە ناکارامەیی و کەم تەرخەمیەوە ئەو باوەڕیە کەمەی کە تۆڕی راگەیاندنی عێراقی هەیبوو لە ناوی برد." ٣٦١

ناوبراو دەڵێت هەندێك جار داوای كڕینی شتی سادە و كەم نرخی وەك خەرج كردنی ٥٠٠ دۆلار بۆ كڕینی سەتەلایتێك كە لە ڕێگەیەوە لینكێكی دەزگای هەواڵی ڕۆیتەرز دەگەیێنرا، ڕەت دەكرایەوە، هەروەها چاپ كردنی نامیلكەیەكی ڕاهێنان كە خۆی ئامادەی كردبوو بە زمانی عەرەبیو تێچوونەكەشی تەنیا ٢٠٠ دۆلار پەسەند نەدەكرا.

"دۆن نۆرس" تەنیا كەس نەبوو لە كارمەندە یەكەمینەكان، كە دەست لە كار بكێشێتەوە. چونكە دواتر "احمد ئەلریكابی" بە شانازیەوە بە "بلاوكراوەی بەغداد"ی گوت: "من لە نێو خێزانێك گەورە بووم كە بەرهەڵستكاری ڕژێمی سەدام بوون و ئێستاش بەشێكن لەو شەڕە- هەردەم ئاواتم دەخواست كە بتوانم لەو ولاتە بە ئازادی بۆچوونەكانی خۆم دەربڕم، بەلام هیچ دەرفەتێكم نەبووە. بۆیە بیرۆكەی بەدیهێنانی دەزگایەكی ڕاگەیاندنی ئازاد لە عێراقدا خەونێكی پیرۆزە." بەلام دواتر ناوبراویش دەستی لە كار كێشایەوە دوای ئەوەی دەسەلاتی داگیركەر چەند كەسێكی هاوشێوەی بەعسیەكانیان دامەزراند كە بەردەوام كێشەیان دەنایەوە. ٢٦٢

هەر لەو كاتەدا، ئەو پەیامنێرانەی كە لەسەر كارەكانیان مانەوە، فرمانیان پێكرا، ڕۆژانە ئامادەی كۆنگرە ڕۆژنامەوانیەكانی دەسەلاتدارانی داگیركەر ببنو هەواڵو چاوپێكەوتنو وێنەكانی ئەوانیش بگوازنەوە، لە بەرانبەر مووچەی ١٢٠ دۆلار لە مانگێكدا، كە ئەو بڕە مووچەیە بووە هۆی ئەنجامدانی ناڕەزاییەكی گەورە لەلایەن پەیامنێرەكانەوە. ٢٦٣

لە مانگی كانوونی یەكەمدا، چاوم بە "علاو فایق" كەوت، كە ئەویش ئەمریكیەكی بە ڕەگەز عێراقیەو دانیشتووی ئان ئاربۆرە لە ویلایەتی مێشیگان، ناوبراو دووەم بەڕێوەبەری تۆڕی ڕاگەیاندنی عێراقی بوو. سیماو جلوبەرگی زۆر ئاسایی دەردەكەوتو ڕەنگی قژیشی خۆڵەمێشیو كورت بوو، چاویلكەیەكیشی لە چاو بوو، ئەو باجەی كە بە ملوانەیەكی ڕەنگ شین بە

ملیــەوە هەڵواســرابوو، لەلایــەن ســوپاوە دەرچــوبوو، بــەوەی کارمەنــدی کۆمپانیـای SAICـە، نـاوبراو پێـداگیری دەکـرد، بـەوەی تـۆڕی راگەیانـدنی عێراقی جەماوەرێکی زۆری هەیە.

کە دەڵێت: "من لەگەڵ ئەلجەزیرە لـە رکابـەرکێ دانـیم، ئـەوان ئـازادن لەوەی دەیکەن. لە راستیدا زۆربەی عێراقیەکان سەتەلایتیان لە ماڵەوە نیـە. ئەوانەشی کە هەیانە، هەر ریمۆت کۆنترۆڵەکەیان بـەلاوە سـەیرە و یـاری پـێ دەکەن. بۆیە ئێستا ئەوانە سەیری کەناڵەکەی ئێمە دەکەن چونکە متمانەیان پێمانــە بــەوەی راســتیەکانیان بــۆ دەگوازینــەوە. پێویــستە بــە هەســتێکی بەرپرسـیارێتیەوە پـەیڕەویی لـە ئـازادی بکـەین‌و رێگـەش نـەدەین دووبـارە سەدام حوسێن ئێرە وەکو سەکۆیەك بـەکاربێنێت." (لەگـەڵ ئـەو راستیەشـی کەوا هەموو کەسـێك توانـای کڕینـی سـەتەلایتی نـەبوو، بـەلام هـەر بـە پێـی رووپێوێکی ئەنجام دراو لەلایەن حکومەتی عێراقیـەوە، یـەك لەسـەر چواری عێراقیــەکان ســەیری کەناڵــەکانی ئەلجــەزیرە و ئەلعەرەبیــە دەکــەن، لــە بەرانبەریشدا یەك لەسەر دەی عێراقیەکان سەیری ئەلعێراقیە دەکەن.)

دیسانەوە ناوبراو رەتی ئەوەی دەکردەوە، گوایە سوپای ئەمریکی رێگری لە بەردەم رێپۆرتاژەکانی ئەوان دانابێت:

بەڵێ راستە ئێمە پارە لە وەزارەتی بەرگری ئەمریکی وەردەگرین. بەلام ئەو پارەیە هی مـن‌و تۆیـە، هـی بـاج دەرەکانـە. ئایـا رێپۆرتـاژت ئـەنجام داوە لەســەر وەزارەتــەکانی تەندروســتی‌و پــەروەردە، بــەوەی حکومەتی ئەمریکی پاڵپشتی داراییان دەکات؟ تێناگـەم بۆچـی کاتێـك باس دێتە سەر میـدیاو راگەیانـدن، دەڵێـت، نـا، نـا، نـا. کـێ لـە رووی داراییەوە یارمەتیت دەدات؟

حکومەتی ئەمریکی بەرپرسیارێتی یارمەتیـدانی عێراقـی گرتۆتـە ئەستۆ و دەزگاکانی خستۆتە ژێر خزمەتی دیموکراسی و گۆڕان. بۆیـە

پێویسته به خۆشحاڵیەوە بڕوانینە پاڵپشتی ئەوان بۆ کەناڵێکی سەربەخۆی تەلەفزیۆنی عێراقی. خەرجکردنی هەر سەنتێك لە پێناو ئەو پرۆژەیە لە جێگای خۆی بووە. لەگەڵ ئەوەشی کە من لێرە کاردەکەم، بەڵام خەریکە پەخشی تەلەفزیۆنێکی سەربەخۆو دوور لە کۆنترۆڵی حکومەت دێنینە کایەوە. ئەوە چەمکێکی تازەیە، لە عێراق‌و بگرە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشەوە، کە کەناڵێکی تەلەفزیۆنی پشتگیری دارایی لە حکومەتەوە بێت و لە هەمان کاتیشدا، دوور بێت لە دەستێوەردانەکانی دەوڵەت. ٢٦٤

## هامفیە زرێپۆشەکان‌و فڕۆکە بەکرێ گیراوەکان

دوای سێ مانگ لە چاوپێکەوتنەکەم لەگەڵ فایق، راپۆرتێکی دەرچوو لە نووسینگەی پشکنینی گشتی سەر بە پێنتاگۆن، بە شێوەیەکی زۆر جیاواز باسی لە کاروبارە داراییەکان دەکرد. لەگەڵ کۆتایی مانگی ئەیلولیش، تێچوونەکانی کۆمپانیای SAIC بە پێی گرێبەستیەکە بریتی بوو لە ١٥ ملیۆن دۆلار، کەچی بۆ ٨٢,٣ ملیۆن دۆلار بەرز بۆوە. بۆ نموونە: لە راپۆرتەکەدا هاتووە، بەڕێوەبەری پرۆگرامەکانیSAIC هەوڵی کڕینی هەمەرێکی داوە لە جۆری H٢ لەگەڵ فۆردێکی پیك ئاپ لە جۆری C-٣٥٠ بۆ بەکارهێنانی خۆی، هەروەها فڕۆکەیەکی بارهەڵگری لە جۆری DC-١٠ بە کرێ گرتووە بۆ گەیاندن‌و هێنانی ئەو ئۆتۆمبێلانە بۆ عێراق. کاتێکیش کە فەرمانبەری تایبەتمەندی وەزارەتەکە رازینەبووە ئەو جۆرە داواکاریە بخرێتە نێو بەندەکانی گرێبەستیەکە، بەڕێوەبەرەکە بەسەر دەسەڵاتەکانی ئەو فەرمانبەرە تایبەتمەندە بازی داوەو خۆی گەیاندۆتە نووسینگەیەکی ئاست بەرزتری پێنتاگۆن‌و رەزامەندی بەدەست هێناوە. کۆمپانیای ناوبراو نەیتوانی خەمڵاندنێکی راست‌و دروستی تێچوونەکانی گەیاندنی ماشێن‌و

ئۆتۆمبێلەکان لە ڕێی فرۆکەوە پێشکەش بکات، جگە لە یەك وەسڵ نەبێت بە بڕی ٢٨١,٠٠٠ دۆلار کە ناونیشانی "نووسینگەو ماشێن"ـی لەسەر بوو. هەروەها ڕاپۆرتەکە ئاماژە بەوەش دەکات کەوا یەکێك لە بەڵێندەرەکانی SAIC پارەی پێدراوە، ئەوە لە کاتێکدا ناوبراو لە مۆڵەتی پشوودا بووە. هەر لە هەمان ڕاپۆرتدا، لە باسێکی تردا هاتووە، "کەسێکی شارەزا لە بابەتەکان" دامەزرێنراوە بۆ گرێبەستیەکەی SAIC لە بواری میدیاو ڕاگەیاندن، بۆ دیاریکردنی چۆنیەتی فڕێدانی پاشماوە و زبڵ لە عێراقدا!!!، کە دواتریش ئەو شارەزایە کرایە ڕاوێژکار لە وەزارەتی وەرزش‌و لاوانی عێراقی.

ڕاپۆرتەکەی پشکنەری گشتی، باس لەوە دەکات کەوا (سەرکردایەتی کۆنتراکتەکانی بەرگری- لە واشنتۆن DCC-W) هەندێ حاڵەتی نالەباری لە داواکردنی پێداویستیە سەرەتاییەکانەوە تاوەکو چاودێری‌و بەدواداچوونی بەڵێندەرەکان، پشت گوێ خستووە. لە هەمان کاتیشدا پێشنیاری "گرتنە بەری ڕێ و شوێنی ئیداری گونجاو"ـی کردووە کە دەبێ لە بەرانبەر ئەو کارمەندانەی بە پێچەوانەی ڕێنماییەکان جوڵاونەتەوە ئەنجام بدرێت. ٢٦٥

لە ٩ کانوونی دووەمی ٢٠٠٤، پێنتاگۆن بڕی ٩٦ ملیۆن دۆلاری دایە کۆمپانیای "هاریس" لە میلبۆرنی ویلایەتی فلۆریدا، بۆ بەڕێوەبردنی پرۆژەی تۆڕی ڕاگەیاندنی عێراقی. ٢٦٦ لە ڕووی تەکنیکیەوە، گرێبەستیەکەی SAIC بۆ ئەم کارە هەرگیز قابیلی هەڵوەشاندنەوە نیەـ کە ناکرێت بێ هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستیە کۆنەکە گرێبەستیەکی نوێ ئیمزا بکرێت. لە مانگی شوباتدا، ئەنجوومەنی حاکمەکان بۆ پەخش کردن (BBG) کە سەرپەرشتی گشت شێوازەکانی پروپاگەندە ناسەربازیەکانی ئەمریکایی دەکات وەك دەنگی ئەمریکا، ڕادیۆی ئازادی (ئەورووپا) RFE، ڕادیۆی سەربەستی RL، ڕادیۆی ئازادی ئاسیا RFA و هەروەها کەناڵی

رادیــۆ و تەلــەفزیۆنی ئاسمــانی مــارتی کــە تەلــەفزیۆنی (ئــەلحورە- بــێ کارتەکــە)ــی لێــوە پــەخش دەکرێــت، لــە چوارچــێوەی هەوڵــەکانی بــۆ دروســتکردنی کــەناڵێکی هاوشــێوەی کەناڵــەکانیCNN، MSNBC و Discovery زیــاتر لــە ٦٢ ملیــۆن دۆلاری لــە پــارەی حکومــەت تــەرخان کرد.٣٦٧

هەڵــسەنگاندنو حــوکم دان لەلایــەن میــدیاکانی عەرەبیــەوە زوو دەرکەوت. بۆ نموونـە، رۆژنامـەی "ئەلئەهرام"، یەکێکە لـە رۆژنامـە هەرە ناودارەکان کە بە زمانی عەرەبی دەردەچێت، رایگەیاند: "ئەستەمە لەوە تێبگەین، کە لەگەڵ ئەوەی ئەمریکا خاوەنی چەندین سەنتەری لێکۆڵینەوە و دیراســاتی پێــشکەوتووە، هــەروەها خــاوەنی ئــەو هــەموو بیرمەنــد و هزرڤانەیە، رق و کینەی عەرەبەکان لە بەرانبەریدا بەوە لێکدەداتەوە کە لە ئــەنجامی دیماگۆجیــەتی میــدیاکان بەرهــەم هــاتووە، نــەوەك ئــەنجامی پەیڕەوکردنی سیاسەتی پێشێلکردنی بەرژەوەندی عەرەبەکان بێت."

هەر لەگەڵ دەستکردن بە پەخشکردنی کەناڵی ئاسمانی "ئەلحورە" دەسبەجێ ئەو پەیوەندیە نزیکەی لەگەڵ ئیدارەی ئەمریکی بەدەرکەوت. چونکە یەکەمین کەس کە چاوپێکەوتنی لەگەڵدا کرا جۆرج بۆشی سەرۆکی ئەمریکا بوو- کە رۆژنامەی ئەلقودسی ئەلعەرەبی، لە نوسینێکیدا لەمەڕ ئەو کەناڵە دەڵێت: هەرچەندەی کەوا ئەو کەناڵە سەربەخۆ دەردەکەوێ، بەلام ئەو کەناڵە حکومیانەمان دێنێتەوە یاد کە رژێمە دیکتاتۆرەکان لە ساڵانی شەستەکان و حەفتاکاندا دایاندەمەزراند. ٣٦٨

لە کانوونی یەکەمدا، فایەق پێی راگەیاندم: "سەبارەت بە منەوە وەك کەسێکی عێراقی-ئەمریکی، وێنەم لەسەر هەردوو لای دراوەکە هەیە. چونکە وەکو عێراقیەك پێویستیم بە پارەی ئەمریکی هەیە. وەکو ئەمریکیەکیش دەمەوێ رۆڵم لە دروست کردنی میدیایێکی ئازاد هەبێت. ئەوە ئەو چەمکە

تازەیەیە کە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەدی دەکرێت. ئەوە ئەزموونە. گەر بێتوو سەرکەوێت، ئەوا دەبێتە بنەمای دانانی یاساو رێسای تازە بۆ دەزگاکانی راگەیاندن لە جیهانی عەرەبیدا." بەداخەوە لەوەدەچێت ئەزموونی هەردوو کەناڵی ئەلعێراقیە و ئەلحورەش بە تەواوەتی هەرەسیان هێنابێت.

لە نیسانی ٢٠٠٤، چاوم بە "عیسام ئەلخەفاجی" کەوت، ناوبراو کەسێکی ئەکادیمی چالاکە لە زانکۆی ئەمستردام، خۆی بە رەسەن خەڵکی گەڕەکی ئەلئەعزەمیەی شاری بەغدایە. وەکو راوێژکاری ناجێگیری پێنتاگۆن و بانکی نێودەوڵەتی کاری کردووەو ئێستاش بەڕێوەبەری چاودێریکردنی داهاتەکانی عێراقە (لقێکی بچووکی پەیمانگای کۆمەڵگەی کراوە، کە بریتیە لە چەترێك بۆ ئیمپراتۆریەتی ناسوودمەندی جۆرج سۆرۆیە)، هەروەها ناوبراو بۆ ماوەیەك لەگەڵ IRDCـیش کاری کردووە، بەلاّم دوای چەند مانگێك وازی هێنا. ٢٦٩

ئەلخەفاجی جگەرەکەی داگیرساندو پشتیشی دایە کورسیەکەی، هەر لەو کاتانەدا، خزمەتگوزارەکەی قاپێك کەبابی برژاوی بۆ هێنا. نووسینگە بچووکەکەی زۆر لەو نۆرینگە سادەو پاكو خاوێنانەی دکتۆرەکان دەچوو، ژوورەکەشی لە نێو دێرینترین هوتێلەکانی بەغدا بوو کە بەسەر رووباری دیجلەدا دەیڕوانی. ئەو دیمەنە، زەویە داگیرکراوەکانی کۆلۆمبۆ یان کالکۆتای دەهێنایەوە یادم.

بەسەرهاتی ناوبراویش هێدی هێدی ئاشکرا دەبوو. لە ساڵی ١٩٩٧، ئەلخەفاجی و چەند کەسێکی تریش لە بەردەم کۆنگرێسدا، گەواهیاندا بۆ دەسەبەرکردنی ٥ ملیۆن دۆلار وەکو بەشێك لە پرۆسەی ئازادکردنی عێراق. ئەو پارەیەش لە ساڵی ٢٠٠٢، بۆ رێکخستن و ئەنجامدانی هەژدە وۆرك شۆپ بە هاوبەشی لەگەڵ وەزارەتەکانی دەرەوە و بەرگری خەرج کرا. سەرەڕای

ئەو کارە هاوبەشانەیان بەلاّم هەریەکە و ئەجێندایەکی تایبەت بە خۆی هەبوو.

یەکێك لەو سی و دوو بەشداربووە پایەدارانەی وۆرك شۆپەکان بریتی بوو لە "مونزیر ئەلفەزل" کە موسوڵمانێکی شیعەی شاری نەجەفە، ناوبراو لە رابردوو پرۆفیسۆری یاسا بووە لە بەغدا تا ئەو کاتەی لە دوای شەڕی دووەمی کەنداو لە ساڵی ١٩٩١ رەخنەی لە داگیرکردنی کوێت گرت، بە ناچاری وڵاتی جێهێشت و بەرەو وڵاتی سوید چوو. ناوبراو لە میانەی کۆبوونەوەکەدا، رەشنووسێکی دەستووری عێراقی خستە ڕوو. ٢٧٠

هێزی سەرەکی پشت ئەو دانیشتن و کۆبوونەوانە، گرووپێك بوو بەناوی مونتەدای عێراقی بۆ دیموکراسی IFD کە بنکەکەی لە مێشیگان بوو. سەرۆکایەتی ئەو مونتەدایە بە شێوەیەکی دەوری دەگۆڕا، رەنگبێ خۆشبەختی بووبێت بۆ ئەو کەسەی نۆرەی سەرۆکایەتیکردنی مونتەداکەی وەرگرت، "عیماد زیاو" کە ئەندازیار و بەڕێوەبەری دەزگایێکی درمانسازی تەمەن پەنجاو یەك ساڵە بوو، لە تەمەنی سی ساڵیەوە عێراقی جێهێشتبوو، ئێستاش لە پلای ماوی- ویلایەتی مێشیگان ژیان بەسەر دەبات. لەگەڵ ئەوەی ناوبراو خاوەنی پێشینەیەکی کەمە لە حکومەت و سیاسەت، بەلاّم لە رێگەی کارەکەیەوە وەکو سەرۆکی مونتەداکە، رۆڵێکی گرنگی لە ئایندەی عێراقدا بۆ رەخسا، کە ئەمەش بە یەکێك لە هەڵە گەورەکانی داگیرکەر دادەنرێت لە کاتی نەخشە رێژیان بۆ عێراقی نوێ. ٢٧١

هەر دوابەدوای لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکان، "جوان دیکۆ" کە ئەمریکیەکی بە رەگەز عێراقیە و یاریدەدەری "سپێنسەر ئەبراهام"ـی وەزیری وزە و سیناتۆرێکی پێشووی نوێنەری مێشیگان بوو، گوێی لە "پۆڵ ۆلفۆتس"ـی جێگری وەزیری بەرگری بووە، کاتێك کە باسی ئەوەی دەکرد، بە نیازە هەڵمەتێك بکات بۆ کۆکردنەوە و بەدەست هێنانی دەنگ و سۆزی

عەرەبە ئەمریکاییەکان لە بەرژەوەندی سەرکردە عێراقیەکاندا. دیکۆ پەیوەندی بە "دکتۆرە مەها حوسێن" کرد پسپۆری بواری گرێیەکان (الاورام) لە زانکۆی مێشیگان، لە هەمان کاتیشدا ئەندامی دەستەی کارگێڕی مونتەداگە بوو. ناوبراو دەستی کرد بە ئامادەکاری بۆ کۆبوونەوەی وۆلفۆتس لەگەڵ زیاودا.

دوای زنجیرەیەك دانیشتن و کۆبوونەوەی نێوان عێراقیە دوورخراوەکانی نیشتەجێبووی ئەمریکاو پلەدارەکانی پینتاگۆن لە ناوچەی دیترۆیتدا، پلان بۆ IRDC دارێژرا بۆ کۆبوونەوەیەکی تر لە مانگی شوباتو لە بالاْخانەی پێنتاگۆن، دواتریش کۆتایی هێنان بە گردبوونەوەیەك لە دیترۆیت لە ۲۳ شوباتی ۲۰۰۳، کە وۆلفۆتس قسەکەری سەرەکی بوو لەو کۆبوونەوەیەدا.

دواتر ۆلفۆتس گوتی:"ئەوە سامانێکی بە نرخو گەورەیە کە خەڵکانێك هەبن هاوبەشی بەهاکانمان بن، تێبگەن کەوا ئێمە وەکو ولاْتێك بە نیازی چین، کە لە هەموو حاڵەتێکیش هاولاْتین لەو ولاْتە، بە هەمان زمان قسەدەکەنو خاوەنی هەمان کەلتورنو ڕێگاکەشیان لە عێراق لێوە دیارە"۲۷۲

دوای بەسەرچوونی دوومانگ "عیماد زیاو" رۆڵێکی سەرەکی لە ڕێکخراوی IRDC وەرگرت، لە نزیکەوەش لەگەڵ "ڤیکتۆر رۆستۆ"دا کاری دەکرد، کە ئەوەیان خاڵی پەیوەندی نابراو بوو لەگەڵ پێنتاگۆن. رۆستۆ بە "نیویۆرك تایمز"ی ڕاگەیاندبوو، کەوا SAIC پەناگەیەکی بەسوودی عێراقیە ئەمریکیەکان بووە: "زۆربەی ئەو کەسانەش پێیان وابوو، گەر لەگەڵ هەر دەزگایەکی ئەمریکی ببینرێن ئەوا دەکوژرێن." ۲۷۳ لەلایەکی ترەوە ئەلخەفاجی بۆچوونێکی قوڵتری هەیە، بەوەی ئایا پێویستە متمانە بە حکومەتی ئەمریکی بکردرێت؟: "قورسترین بڕیار بە لای منەوە ئەوەبوو، ئایا کار لەگەڵ پێنتاگۆن بکەم یان نا؟ من کەسێکی عێراقیمو لەگەڵ ئەوەی

دژی شەڕم، بەڵام دەمەوێ یارمەتی نۆژەنکردنەوەی وڵاتەکەم بدەم. جگە لە منیش زۆر کەسی تر بە هەمان شێوە بیردەکەنەوە." ٢٧٤

لە ٤ نیسانی ٢٠٠٣، دکتۆرە مەهاو زیاو بۆ بینینی جۆرج بۆشی سەرۆکی ئەمریکا بانگێشتی کۆشکی سپی کران، بە مەبەستی وەرگرتنی بیرو بۆچوونیان لە چوارچێوەی ئەو کارە راوێژکاریانەی کەوا سەرۆکی ناوبراو ئەنجامی دەدا لەگەڵ عێراقیە ئەمریکیەکان. دوای کۆبوونەوەکە راگەیاندنی رۆژنامەوانی حکومەت بەو جۆرە وەسفی زیاوی کرد:

لە ساڵی ١٩٧٠، پوری (زیاو) بەوە تاوانبار کرا کەوا ئەندامی دەستەیەك بووە هەوڵی پیلانیان داوە بۆ کۆدەتا کردن لە دژی حکومەتی بەعس. سەرەڕای ئەوەش ناوبراو یەکەمین ئافرەتی دەرچووی کۆلێژی دەرمانسازی سەر بە زانکۆی بەغداو پزیشکێکی ناسراویش بووە لە عێراق، کەچی خرایە زیندانەوە. رۆژی دواتریش باوکی عیماد دەستگیرکرا، ئینجا دوای سێ هەفتە ئازادکرا. بەڵام پوری ناوبراو دوای دوو ساڵ لە بەندیخانە ئینجا ئازادکرا. دوای کەمتر لە ساڵێکیش لە کاتی کارکردنی لە نۆرینگە تایبەتیەکەی خۆیدا، کوژرا.

سەبارەت بە دکتۆرە مەها حوسێنیش راگەیاندنەکە بەم شێوەیە وەسفی کرد:

لە کۆتایی حەفتاکانداو لە کاتی خوێندنی لە کۆلێژی دەرمانسازی سەر بە زانکۆی بەغدا، مەها حوسێن شایەتحاڵی ونبوونی چەند هاوڕێیەکی بوو. دوای تەواوکردنی خوێندنیشی لە ١٩٨٠، خۆی و هاوسەرەکەی عێراقیان جێهێشت لە ترسی زیادبوونی ئەگەرەکانی هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان عێراق و ئێراندا. هەر دوای ماوەیەکی کەم لە رۆیشتنیان، ژمارەیەکی زۆر لە کەس و کارە نزیکەکانیان لەسەر

ماڵو حاڵی خۆیان دەرکرانو ناچار کران روو بکەنە ئێران. دوو لە ئامۆزاکانی ناوبراویش کە ماڵەکانیان جێ نەهێشتبوو، لە کۆتاییەکانی ساڵی ۱۹۸۰، لە سێدارە دران بە تۆمەتی حەشاردانی چەند دۆستێکی کورد کە لە دەست هێزە ئەمنیەکانی رژێمی ئەو کاتە خۆیان شاردبۆوە. ئەو ئامۆزایەی کەوا پەنای ئەو کەسانەی دابوو، تەقەی لێکراوو کوژرا. خوشکەکەشی کە خاوەنی ئەو ماڵە بوو کەوا کەسە هەڵاتووەکانی تێدا حەشاردرابوو تا مردن لێیان داو دوای مردنیشی لاشەکەیان شێواندو دواتریش بێ جلوبەرگ لە شوێنێکی گشتیدا دەیان گێڕا. ۲۷۵

هەموو ئەوانەشی بانگێشتی کۆبوونەوەکانی کۆشکی سپی دەکران، ئاگاداری IRDC نەبوون. چونکە "راز رەسوڵ" کە ئەندامی گروپێکی داکۆکیکار بوو بە ناوی (ئافرەتان بۆ عێراقێکی سەربەخۆ)، لە ساڵی ۱۹۹۸ عێراقی جێهێشتبوو، بە هیوای بەدەستهێنانی مافی پەنابەرێتی لە فەیرفاکس لە ویلایەتی ڤێرجینیا. دوای مانگێك لە کۆبوونەوەکە، بەلایەوە سەیربوو کە شتێکی ئاوا هەیە، بۆیە دەیگوت: "گەلێك لە ئێمە بە راستی نیگەران بوون لەوەی هیچیان لە بارەی ئەم شتەوە نەدەزانی. ئەوان دوو مانگ لەمەوبەر بەو کارە هەڵساونو ئێمەش تەنیا ئەو هەفتەیە زانیومانە." ۲۷٦

## دروستکردنەوەی مێشکێکی نوێ

دواتر، سەدو پەنجا کەس لەلایەن IRDCـەوە بەکارخران. دوای ئەنجامدانی چەندین کۆبوونەوە، بڕیار درا بە دانانی چوار کەس لە هەر شارێك یان پارێزگایەکی عێراقی، بە هەمان شێوە چوار کەسیش بۆ هەر وەزارەتێکی گرنگی عێراقی کە لە نزیکەوە کاریان لەگەڵ کاربەدەستە ئەمریکی و بەریتانیەکاندا دەکرد لە ژێر فرمانی "جەی گارنەر" کە

ژەنەڕاڵێکی خانەنشین کراو بوو، بە حاکمی عێراق دانرا بۆ بەڕێکردنی کاری ڕۆژانە. هەر ئەندامێکی ئەو تیمانەش لە ڕێی پێنتاگۆنەوە نێردرانە بنکە سەربازیەکانی وەك ( فۆرت هوودو تەکساس) بۆ ئەنجامدانی چەند مەشقێکی تایبەت بە بەرگری لەخۆکردن.

هەفتەیەکیش دوای کۆبوونەوەکانی کۆشکی سپی، عێراق کەوتە نێو گێژاوی تاڵانو ئاژاوە، ئەمەش پێشەکی بوو بۆ ڕێگاخۆشکردن لەبەردەم وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە وەرگرتنی دەم و دەستی جڵەوی دەسەڵات، سەرەڕای ئەو ڕاستیەشی کەوا پلانەکان لە IRDC و پێنتاگۆن ناڕوونو کەمو کوڕیش بوون. درەنگ هەست بەوە کرا کەوا نەبوونی پلان و نەخشەڕێژی پێشوەختەی تێرو تەسەل، بەر لە گفتوگۆکردن دەربارەی دەستپێکردنی شەڕێکی بەم شێوەیە، ڕەنگبێ بە نابەرپرسیارێتیو گرتنەبەری ڕێو شوێنی نانەوەی کارەسات سەیری بکرێت. کە دواتریش ئاکامەکەی هەر بەو ئاقارەدا کەوتەوە.

ڕێك دوای سێ هەفتە، لە ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی ٢٥ نیسانی ٢٠٠٣، زیاو نۆ کەسی تریش بەرەو کوێت چوونو لەوێشەوە بۆ بەغدا. لە دوای گەیشتنیان بە چەند هەفتەیەك، بە هاوڕێیەتی پەنجا کەسی تر کۆبوونەوەیەکی هاوبەشیان لەگەڵ ژمارەیەك کارمەندی پلەدار کە لەلایەن پێنتاگۆنەوە دەستنیشان کرابوون ئەنجام دا ( زۆربەیان کەسی مەدەنیو کارمەندی دەزگا ئەکادیمیو ناسوودمەندەکان بوون، لەسەر بنەمای شارەزاییو ئەزموون نەوەك لەسەر بنەمای نەتەوەییەوە دامەزرێنرابوون) تاکو بەرپرسیارێتی بەڕێوەبردنی وەزارەتە گرنگەکانی وەك نەوت، پلاندانانو پیشەسازی بگرنە ئەستۆ. ٢٧٧

لەو کاتەوە دەردەکەوت کەوا زیاتر لە ئەجێندایەك هەبوو بۆ جێبەجێکردنی. بۆیە پێنتاگۆن بە شێوەیەکی سیستەماتیکی ئەو

کارمەندانـەی وەزارەتـی دەرەوە کـە لـە پـرۆژەی داریـشتنی ئایـندەی عێـراق کاریان دەکرد دووردەخستەوە، کارمەندەکانی سەر بە وەزارەتەکەی خۆی لـە پۆستەکانی عێـراق دادەنـا. بۆنموونـە "تـۆم واریـك" بەڕێوەبـەری یەکـەم (*کارمەنـدیش لـە وەزارەتـی دەرەوە: وەرگێـڕ*) لەلایـەن گارنـەرەوە بانگێـشت کرابـوو بـۆ ئـەوەی بێتـە ریـزی ستافەکەی، بۆیـە نـاوبراو دەسـتی کـرد بـە خۆئامـادەکردن بـۆ ئـەم پۆسـتەی لـە بەغـدا، بـەڵام کارمەنـدە مەدەنیـەکانی پێنتاگۆن لە ڕێگەی ڤیتۆ گرتنەوە، رەتی بڕیارەکەی گارنەریان کردەوە. ٢٧٨

فـازڵ یـەکێك بـوو لـە کەسـە هەڵبـژێردراوەکان. کـە بـۆ وەزارەتـی دادی عێراقـی نێـردرا بـۆ "هێنانــە دی سیـستەمێکی تـازەی یاسـایی بــەرە و دیموکراسـیەت، کـە مافـەکانی مرۆڤـی تێدا رەچـاو بکرێـت و دژی گەنـدەڵی بوەسـتێتەوەو یاسـای نـوێش بـۆ بینـاکردنی دیموکراسـیەت دابڕێـژێت." بەماوەیەك بەر لە سەفەرکردنی لە ڤێرجینیاوە، نـاوبراو لـە لێدوانێکیـدا بـۆ پـەیامنێری نیویـۆرك تـایمز، هیـواو خۆزگـەکانی خـۆی دەردەبـڕی و دەڵێـت: "رەنگبـێ عێراقیـەکان دوای پێـنج یـان شـەش سـاڵی تـر تێبگـەن کـەوا مـن کەسێکی باش بوومە." لەگەڵ ئەوەی هیوایێکی زۆری هەبوو بـەڵام بـەردەوام لـە دڵەڕاوکێـدا بووبـەوەی عێراقیـەکان رەنگبـێ وەکـو "بـەکرێگیراوێك یـان سیخوڕێك سەیری بکەن"، بۆیـە پەیوەنـدی بـە شـەش پاسـەوانی کورد کـرد بۆئەوەی لە بەغدا یاوەری بکەن، تـا ئـەو کاتـەی سـوپای ئـەمریکی پاسـەوانی ئـەمریکایی بـۆ دەستنیـشان دەکـات. نـاوبراو بـەردەوام دەبێـتو دەیگـوت: "خـەونی مـن بریتیـە لـە بونیادنـانی کۆمەڵگـەیـەکی مـەدەنیو سیـستەمێکی دیموکراسی لە عێراق کە هاوشێوەی سویسرا یان سوید بێت. بەڵام بەداخـەوە ئێـستا ئـاژاوە و مەترسـیەکی زۆر لـە ئارادایـە کـە سەرچـاوەکەی گرووپـە ئیسلامیە توندڕەوەکانن لەگەڵ کۆنە بەعـسیەکان و عەرەبـە تیرۆریـستەکانی کـەوا پـشتگیری رژێمـی سـەدام حوسـێنیان دەکـرد. عێراقیـەکانیش مێـشکیان

شۆردراوەتەوە، بەرپرسیارێتیەکەش لەئەستۆی ئێمەدایە کە دووبارە بینای هزرو مێشکێکی نوێیان بۆ بکەینەوە."

بەلاّم هەر لە رۆژی یەکەمەوە عێراقیەکانی ناوەوە و دەرەوەش بە گومانەوە دەیانڕوانیە ئەو ئەزموونە. کە "ئیمام هیشام ئەلحوسەینیّ" سەرکردەیەکی شیعەی عێراقیەو بەڕێوەبەری سەنتەری کەربەلایە بۆ پەروەردەی ئیسلامی لە شاری دیترۆیتی ئەمریکی، لە لێدوانێکیدا بۆ نیویۆرك تایمز، گوتبووی: "ئەوە سوکایەتی پیّ کردنە، ئەوە چۆن دیموکراسیەتێکە کە تۆ بتەویّ دەست بەسەر بۆچوونو بیرکردنەوەمان دا بگریت؟ ئەوە دیموکراسیەت نیەو بەسەریشماندا مەسەپێنن." ٢٧٩

ئەلخەفاجی دەڵێت:" لەگەڵ گەیشتنی گرووپەکە بۆ شاری بەغدا، هیچ جۆرە هاوکاریو پشتگیریەکمان نەبینی. بەوەی هەر کەسەو سەرقاڵی ئەو ئەرکە بوو کە پێی راسپێردرابوو، هەروەها نالەباری هەلومەرجی ئەمنی ببوە هۆی ئەوەی نەتوانی بە ئاسانی هاتوچۆ بکەیت لە شاری بەغدا، بەمەش کۆبوونەوە لەگەڵ گرووپە گەورەکان راگیراو هەندیّ لە کارمەندەکانیش دوای چەند مانگێك عێراقیان جێهێشتو هەندێکی تریشیان بە بیّ ئومێدیەوە مانەوە".

## من نەمدەویست هاوکار بم

لە ٩ تەمموزی ٢٠٠٣، زیاتر لە چوار مانگ دوای دەستپێکردنی IRCD بۆ کارەکانی، ئەلخەفاجی دەست لەکار کێشانەوەی خۆی راگەیاند. دواتر وای بەباش زانی لە بەغدا بمێنێتەوە و تەحەدای سیستەمەکە بکات. ناوبراو لە وتارێکیدا لە رۆژنامەی گاردیانی بەریتانی بە ناونیشانی "من نەمدەویست هاوکار بم" باسی هەرەسهێنانی کارەکانی IRDC دەکرد:

"ترسم هەبوو لەوەی رۆڵم لە نێو ئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوە

کەمتر بێتەوە لەوەی کە خۆم لە بنەڕەتەوە وێنام کردبوو- کارکردنم لەگەڵ هاوپەیمانەکان بە شێوەیەکی دیموکراسیانە، ببێتە هاوکاریکردنی هێزەکانی داگیرکەر. لە مانگی ئایاردا، چەند هەفتەیەك دوای رووخانی رژێمەکەی سەدام حوسێن، دوای بیستو پێنج ساڵ دووری لە ولأت بە هیوایێکی زۆر گەڕامەوە بەغدا. یەکێك لە قورسترین بڕیار لە ژیانمدا وەرم گرتبێت، بریتی بوو لە رەزامەندیم بۆ داوەتەکەی حکومەتی ئەمریکی بۆئەوەی لەگەڵ زیاتر لە سەدو چل کەسی تر بگەڕێمەوە، وەکو بەشێك لەو ئەنجوومەنە بۆ یارمەتیدان لە دووبارە بیناکردنەوەو ئامادەکردنەوەی وەزارەتەکان دوای تەواوبوونی شەڕ، تاوەکو لە کۆتاییدا عێراق بدرێتەوە دەست حکومەتە ئینتیقالیەکەی.

تێگەیشتنی من بۆ ئەو ئەنجوومەنە، کە پێشتر بە راپۆرت بۆ ژەنەراڵی خانەنشین "جەی گارنەر" بەرزم دەکردەوەو ئێستاش بۆ ئیدارەی مەدەنی "پۆڵ برێمەر"، ئەوەبوو، کە ئێمە هاوکاری وەزارەتەکانی عێراق دەکەین، نەوەك بە سیفەتی وەزیر بەڵکو لە ژێر پەردەوە وەك راوێژکار. هەروەها پێم وابوو ئامانجی سەرەکیش بریتی بووە لە چاککردنەوەی ژێرخانە دارماوەکەی لە کارەبا، نەخۆشخانەکان، وێستگەکانی خزمەتگوزاری ئاو و ئاوەڕۆکانو رێگاکانی هاتو چۆشو گێڕانەوەیان بەلانی کەمەوە بۆ حاڵەتی پێش شەڕ تاوەکو بتوانرێت ولأتەکە رادەستی حکومەتی ئینتقالی بکرێت.

هەرچەندیش کە ئێمە وەکو ئەندامانی ئەنجوومەنەکە لەسەرتاسەری جیهانەوە هاتبووین، بەلأم هەموومان عێراقی بووین. ئەوەم بەلاوە قەبووڵ بوو کە ولأتەکەمان هەرەسی هێناوە، هیچ کێشەیەکیشم نەبوو بۆ کارکردن لەگەڵ ئەمریکا، بەلأم وادیاربوو،

بەشێکی هێزەکانی هاوپەیمانەکان، بەشداریکردنی عێراقیەکانیان وەکو راوێژکار بۆ ئایندەو چارەنووسی ولاتەکەیانەوە بەلاوە گرنگ نەبوویێت. رۆڵی ئێمە زۆر دیاریکراو بوو. بگرە ئەو پەیامنێرانەشی کە سەردانیان دەکردین، دواتر بەو جۆرە دیدی خۆیان دەنووسیەوە: "سەرەڕای ئەوەی ئەنجوومەنی ئاوەدانکردنەوە ئۆفیسی تایبەت بە خۆیان لە ناو کۆشکی کۆماریدا هەبوو، بەلام لەوە دەچوو کارێکی کەم لەلایەن ئەو ئەندامانەی کە خەریکی خوێندنەوەی ئیمەیل بوون ئەنجام درابێ."

لەسەرەتای گرتنی بەغدا جۆرێك لە هەست کردن بە گەرموگوڕی هەبوو، بەلام دواتر ئەمریکیەکان بە فیزەوە هەڵسوکەوتیان دەکرد. لە کاتێکیشدا کە زۆر لە عێراقیەکان دڵخۆشبوون بە لادانی سەدام حوسێن لەسەر حوکم، هەروەها گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە ئەمریکا تەنیا هێزە لە توانایدا هەیە ئەمن و ئاسایش رابگرێت، کەچی ئێستا وەکو هێزێکی داگیرکەر سەیری دەکەن.

بە داخەوە، خەون و هیوای حکومەتی ئینتیقالی و هەڵبژاردنی دیموکراسیانە، تەنیا لەلایەن "وۆلف وۆتسەوە" پاڵی پێوە دەنرا، لەوەدەچوو لەبەر ئەو فشارانەی کە لە ئەنجامی خراپتر بوونی هەلومەرجی رۆژانی دوای شەڕ زیادیان دەکرد، ئەو خەونانە لەیاد چوبێتنەوە. "وۆلف وۆتس" تەنیا دەنگێکە لە نێو کۆمەڵێك پلاندانەر لە عێراق کە هاوڕان لەگەڵ خەون و بۆچوونەکانی. بگرە سەربازەکان ئەوەندە بە گەمژەیی بیردەکەنەوە، کە پێیان وایە فرمانەکانیان لە ژەنەڕاڵەکانەوە بۆ دێت نەوەك لە برێمەرەوە.

مشتومڕی توند لە نێوان هەردوو وەزارەتەکانی دەرەوەو بەرگری کاریگەری زیاتری کردبووە سەر بارودۆخەکە. لەگەڵ ئەوەشی کەوا

برێمەر دەسەلاتێکی رەسمی بەسەر عێراقدا هەبوو، بەلام دەبوایە بۆ وەرگرتنی هەر جۆرە بڕیارێك پرسی بە واشنتۆن بکردایە، کە لە ئاکامدا ئێمە دەبووینە قوربانی بڕیارەکان.

ئێستا زۆربەی ناوچەکانی عێراق نغرۆی ئاشووبو ئاژاوە بووە. کەسیش نازانێت چی روودەدات. ئێمەش لێرەوە باسی هەوڵو کۆششەکان ناکەین بۆ ئەنجامدانی سیستەمێکی سیاسی خەیاڵی. خەڵکیش نازانن بۆچی وڵاتێکی زلهێز کە توانیویتی ئەو هەموو هێزە چەکداریە کۆبکاتەوە، ناتوانێت کارەبا بگێڕێتەوە. بۆیە عێراقیەکان پرسیاری ئەوە دەکەن کە ئایا چۆن رژێمی سەدام حوسێن لە دوای کۆتایی هاتنی شەڕ لە ١٩٩١ توانی کارەبا بگێڕێتەوە؟!! بۆچیش ئێستا ئەمەریکا ناتوانێت هەمان ئەو کارە بکات. بۆیە خەڵکی ئەمە بە شێوەیەك لە شێوەکانی پیلانگێڕی لە دژیان لێك دەدەنەوە.

ئێستا برێمەر ئەنجوومەنی حوکمی لە عێراق دامەزراندووە. بۆ خەمخواردن و بڕیاردان لەسەر ئایندەی عێراقیش، بیست و پێنج نوێنەر بە یەکەوە دادەنیشن کە لەلایەن دەسەلاتی هاوپەیمانەکانەوە بە سەرکردایەتی ئەمریکا دەستەبژێر کراون. هەرچەندە کەوا پێکهاتەی ئەنجوومەنەکە خراپ نەبوو، بەلام ژمارەیەکی کەمی ئەندامەکانی، خاوەنی بنکەیەکی جەماوەری بوون. جا گەر ئەنجوومەنەکە کاریگەر بێت یان نا ئەوا بەندە بەو کۆدەنگیەی کەوا ئەندامەکانی دەتوانن بەدی بێنن. هەر بۆیەش نیگەرانم لەوەی نەوەك ئەو ئەندامانە لەپشتی یەکتریەوە چاڵ بۆ یەکتری هەڵبکەنن.

تاوەکو بتوانن بەسەر ئەو ئەزموونەشدا زاڵ بن، ئەوا پێویستە یەك هەڵوێستی لە مەڕ پرسەکان بنوێنن و بە "پۆڵ برێمەر"یش بڵێن بڕۆ بە واشنتۆن بڵێ "عێراقیەکان ئەمەیان دەوێت" ئینجا

ئەنجوومەنەکە دەبێ ئامادەیی هەبێت بۆ ئەوەی بڵێت: "تەواوی دەسەڵاتەکانمان بۆ بگێڕنەوە، هەر کاتێکیش گەر پێویستیمان بە راوێژی ئێوە هەبوو ئەوا ئەو کاتە ئاگادارتان دەکەینەوە."

تا ئەو کاتە من تەنیا ئەندام بووم لە ئەنجوومەنی ئاوەدانکردنەوە کە دەستم لە کار کێشابۆوە. رەنگبێ کەسانی تریش هەبن نیازی هەمان شتیان هەبێت، گومانیشی تێدا نیە هەندێکیان هەر دەمێننەوە بە هیوای ئەوەی بارو دۆخەکە بەرەو باشی بڕوات. سەبارەت بە منیشەوە، کاتێك بیر لە خەڵکی عێراق دەکەمەوە-کە چەند بە هێزن‌و چەند بە نەپساوەیی کار دەکەن- گەشبین دەبم بەو ئایندە نزیکەی کە بۆ وڵاتەکەم دێتە پێش.

ئاماژە گەلێك هەن بۆ کاری هاوبەشی عێراقییەکان، بێ هەبوونی گرژی ئیتنی‌و نەتەوەییەکان، کە لە ماوەدای کورتدا هێماگەلێکی پۆزەتیڤن بۆ ئایندەی عێراق. بەڵام سەرەڕای ئەوەش ترسم لەسەرهەڵدانی ململانێیەکی زۆرتر هەیە کە ببێتە هۆی رشتنی خوێنی عێراقیەکان و ئەمەریکیەکانیش.[٢٨٠]

لە ناوەڕاستی نیسانی ٢٠٠٤، نۆ مانگ دوای پێشبینیەکەی ناوبراو، لەو کاتەشی کەوا وڵاتەکە دەخزایە نێو ئاژاوە و توندوتیژی لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە سوپای ئەمریکی دەستی کردبوو بە ئەنجامدانی کردەی سەربازی دژوار لە فەللوجەو نەجەف، ئەلخەفاجی بە کپی عێراقی جێهێشت و بەرەو ئەمستردام گەڕایەوە.

## هەڵپەی گەورەی بەتایبەتیکردن لە عێراق

لەو کاتەی کە ئیدارەی ئەمریکی لە ژێر پەردەوە کاری دەکرد بۆ کۆنترۆڵکردنی وەزارەتەکان و پارێزگاکان بە هاوکاری راوێژکارە عێراقیە-ئەمریکیەکانیان، کەچی لە رواڵەت بە هەراوهۆریاوە رەتی ئەوەیان دەکردەوە کە نیازی فرۆشتنی یان بە فیرۆدانی ئابووری عێراقیان هەبێت.

لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا (جگە لە ئەمریکا)، یەکی ئایار وەك نەریتێك یادکردنەوەی رۆژی جیهانی کرێکارەکانە، لەو رۆژەدا لە ساڵی ١٨٨٦، کرێکارەکان لە شیکاگۆ خۆپیشاندان و نارەزاییان ئەنجامدا، کە لە ئاکامدا پەیرەوی لە سیستەمی کارکردن بۆ ماوەی هەشت کاتژمێر لە شەو و رۆژێکدا کرا. هەر لەو رۆژەشدا لە ساڵی ٢٠٠٣، چەند خاڵێك لە یاداشتێکی نهێنی کە لەلایەن ئیدارەی جۆرج بۆشەوە نووسرابوو، لە رۆژنامەی "وۆڵ ستریت جۆرناڵ" بڵاوکرابۆوە، داوای دەکرد بە شێوەیەکی کاتەکی لە گشت دەزگاکانی سەر بە کەرتی گشتی لە عێراق کارەکان رابگیرێن. ٢٨١

ئەو دۆکیومێنتە سەد لاپەرەییەی کە ناونیشانەکەی بریتی بوو لە "گواستنەوەی ئابووری عێراق لە حاڵەتی بوژانەوە بۆ حاڵەتی گەشەکردنی جێگیر"، بانگێشتی دەکرد بۆ داخستنو فرۆشتنی ئەو کۆمپانیا عێراقیانەی کەوا قەرزیان لەسەرەو گەشەکردنیشیان هێواشە. هەروەها خستنەرووی سەنەدی شیاو بۆ کرینو فرۆشتن لەبەردەم هاوڵاتیانی عێراقی بەمەبەستی زیادکردنی قازانجی کۆمپانیاکانی ئەو وڵاتە لە رێگەی "پرۆگرامی بەتایبەتکردنی سەرتاپای بنکە فراوان". کە لە ناوەراستی نەوەدەکان پرۆگرامێکی هاوشێوەی ئەو پرۆگرامە لە روسیا جێبەجێ کرابوو.

هەروەها دۆکیومێنتەکە باسی لەوە دەکرد کە پێویستە راوێژکارو لێزانی تایبەت بەکاربخرێن بۆ هاوکاری کردنو یارمەتی دانی

"بەشداریکردنی کەرتی تایبەت لە کەرتە ستراتیژیەکانی وەك بەتایبەتکردن، فرۆشتنی بەهاکان، مافە پێدراوەکان (ئیمتیازات)، گرێبەستیەکانی کرێو کۆنتراکتەکانی بەڕێوەبردن بەتایبەتیش ئەوەی پەیوەستە بە نەوتو پاڵپشتیکردنی پیشەسازی "ئەویش بە مەبەستی بلاوکردنەوەو کۆنتڕۆلکردنی چالاکیەکانی کار لە عێراقدا."

لەلای خۆشیەوە USAID پەیڕەوی لە ناوەڕۆکی دۆکیومێنتەکە کردو گرێبەستی لەگەڵ کۆمپانیایێکی نەناسراودا کرد بە ناوی " Bearing Point" کە بنکەکەی لە ماکلینی سەر بە ویلایەتی ڤێرجینیا بوو. لە ڕێی گەڕانێكو بەدواداچوونێکی خێرا دەرکەوت، جگە لەوەی کۆمپانیاکە نەناسراو بوو لەلای رای گشتیەوە، بەلکو ناوێکی خوازراویشی هەبوو (کۆمپانیای ژمێریاری بە ناوی KPMG) بەکاری دەهێنا. (دوای هەرەسهێنانی کۆمپانیای زەبەلاحی ژمێریاری ئارسەر ئاندرسۆن بە هۆی بەیەکگەیشتنی بەرژەوەندیەکان لە کاتی ئەنجامدانی وردبینی وەك راوێژکاریو رێنیشاندان بۆ کۆمپانیای ئینرۆن بۆ خۆدزینەوە لە دانی باج، زۆربەی کۆمپانیاکانی ژمێریاری خۆیان بە دوورگرت لە راوێژکاری دابەشکاری لە رێی پارچە پارچەکردنی کۆمپانیاکان لە رووی داراییەوە و دواتریش ناولێنانیان بە ناوێکی تەواو نوێو نەناسراو. لە راستیدا "Bearing Point" زۆر لە راوێژکارەکانی ئارسەر ئەندرۆسنی بەکارخست، ئەوانەی دوای هەرەسهێنانی کۆمپانیا سەرەکیەکە کارەکانیان لەدەست دابوو.)

پرۆسەی سێ ساڵەی بەتایبەتکردن کە لەلایەن "Bearing Point" پەیرەوی لێدەکرا، دەسپێك بوو بۆ هاتنە کایەی "ئاڵوگۆڕکردنی چینایەتی جیهان – world-class exchange" سیستەمێکی گشتگیری داهاتی باجە، بە شێوەیەك کە گونجاو بێت لەگەڵ ئەو رێکاریە هەنووکەییانەی کە

لە جیهاندا پەیڕەویان لێدەکرێت" کە بریتیە لە سیستەمێکی نوێی بانکی، پێکهاتووە لە ئاوێتەیەك لە سیستەمی حەواڵەکردنی پارەو پوڵ بە شێوازی ئیسلامی لەگەڵ ئاڵوگۆڕکردنێکی زۆر خێراو گشتگیری دراو. بۆ دەسپێکردنی پرۆژەکەش پێویستە گشت سەنەدە داراییە کۆنەکان کۆبکرێنەوەو لەناو ببردرێن، ئینجا سەنەدی تری تازە لە شوێنیان دابنرێت، ئەو کارەش پێویستە بەر لە تەممووزی ٢٠٠٤ تەواو بکرێت.

ئەو یاداشتنامەیە لەلایەن شارەزاکانەوە مشتومڕو گومانی زۆری نایەوە. بەوەی "ئێدوین ترومان" کارمەندی بەرزی پێشووی دارایی نێودەوڵەتی لە دەزگای پاشەکەوتی فیدراڵی، کە لەسەردەمی سەرۆکایەتی "بیل کلینتۆندا" کارمەندی وەزارەتی دارایی بوو، دەیگوت: "گەر بێتوو ئێمە خۆمان بمانەوێ ئەو کارە بکەین، ئەوە لەلایەن عێراقیەکانەوە متمانەی پێ ناکرێت. بۆیە بانکی نێو دەوڵەتی و سندوقی دارایی نێودەوڵەتی شارەزایی زۆرتریان هەیەو بڕواو متمانەی زۆرتریشیان پێ دەکرێت بە بەراورد لەگەڵ حکومەتی ئەمریکی." ناوبراو ئەزموونی بەتایبەتکردنی خێرای ئەو پرۆژانەی کەوا لەلایەن دەوڵەتەوە سەرپەرشتیان دەکرا لە سۆڤێتی پێشوو، وەکو نموونەیەك هێنایەوە. کە ئاکامی ئەو ئەزموونە کەم بوونەوەیەکی توندی کارو خزمەتگوزاری لێ کەوتەوە، سەرەڕای بڵاوبوونەوەی بێ سنووری گەندەڵیش.

کاتێکیش کە "جەی گارنەر" کرایە حاکمی مەدەنی لە عێراق، گوتی ئەوە کارێکی نابەجێیە، دەبوایە ئیدارەی بۆش پێداچوونەوەی زۆرتری بە پلانەکانیدا بکردایەتەوە. کە ناوبراو ئەو نیگەرانیانەی خۆی لە مەڕ پرۆژەکە لە هەواڵەکانی ئێوارانی BBCدا ئاشکرا کرد:

ئەوەی من هەوڵم دەدا بیکەم، کاراکردنی حکومەت بوو.... ئێمەی ئەمریکی دەمانەوێ قاڵبەکانی خۆمان بە سەر شتەکان بسەپێنین،

ئەو قاڵبانەی ئێمەش باشن، بەلاّم مەرج نیە بۆ خەڵکی تر باش بێت. "تی ئی لۆرانس" گوتەیەکی زۆر نەستەقی هەیە کە دەڵێت- هیوادارم بتوانم گوتەکە وەکو خۆی بڵێمەوە بەلاّم ناتوانم، بەهەرحاڵ ماناکەی ئەوەیە: "وا باشترە ئەوان خۆیان کارەکە بە ناتەواوی ئەنجام بدەن، لەوەی ئێمە بە تەواوەتی بۆیان ئەنجام بدەین، چونکە لە کۆتاییدا ئەوێ وڵاتی خۆیانەو ئێمەش تا هەتایە لێرە نامێنینەوە." بۆیە پێم وایە ئەوە ئامۆژگاریەکی بەجێیە.

بە بۆچوونی من گەر بتەوێ بچیتە باکوور و هەوڵ بدەیت باوەڕ بە کوردەکان بهێنیت تاوەکو پەیڕەوی لە بەتایبەتکردن بکەن ئەوا خۆت دەخەیتە ژێر فشارێکی زۆرەوە. چونکە دەتوانی قەناعەتیان پێ بهێنیت بەوەی دەبێ خاوەندارێتی کێڵگە نەوتیەکان بکەن بەلاّم پێم وانیە بتوانیت قەناعەتیان پێ بکەیت بۆ پەیڕەویکردن لە بەتایبەتیکردن. کە ئەوەش تەنیا شەڕێکە گەر هاتوو ویستت بچیتە نێوی.

تا رادەیەک، دەربڕینی ئاشکرای جەی گارنەر بۆ بۆچوونەکانی سەبارەت بە پێویست بوونی ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی خێراو ئازاد، هۆکار بوو بۆ خێرا لادانی لە پۆستەکەی: "ئەو شەوەی کە گەیشتمە بەغدا، دۆناڵد رامسفێڵد وەزیری بەرگری، بانگی کردمو پێی راگەیاندم کەوا "پۆڵ برێمەر"ی بە نوێنەری سەرۆکایەتی دەستنیشان کردووە.... کە ئەو راگەیاندنە.... بە جۆرێک لە جۆرەکان کتوپڕو لە ناکاو بوو." ٢٨٢

پلانەکەی USAID بەڕێوەچوو بەشێکیشی سەرکەوتوو بوو. "Bearring Point" گرێبەستیەکی لەگەڵ گرووپی "لویس بێرگەر"دا کرد کە کۆمپانیایێکی ئەندازیاریەو بنکەکەشی لە نیو جێرسیە، وەکو بەڵێندەرێکی لاوەکی بۆ چاودێریکردن و لە ناوبردنی دراوی کۆنی عێراقی و

لەچاپ دان و بەکارخستنی دراوی تازەش. کە بەر لە بەهاری ٢٠٠٤ ئەو کارە بە تەواوەتی بە ئەنجام گەیێنرا.

کەچی سەبارەت بە بەتایبەتکردنەوە کۆمپانیاکە سەرکەوتوو نەبوو، سەرەڕای پشتگیریەکی تەواو لەلایەن پۆڵ برێمەر و ستافەکەشیەوە-بە تایبەتیش تۆماس فۆلێی، بەڕێوەبەری دەزگای پەرەپێدانی کەرتی تایبەتی سەر بە دەسەلاتی هاوپەیمانەکان، لە هەمان کاتیشدا هاو پۆلی سەرۆک بۆش لە زانکۆی هارڤەرد، هەروەها سەرۆکی لیژنەی دارایی تیمی جۆرج بۆشی لە هەلبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٠. ٢٨٣

لە کۆتایی حوزەیرانی ٢٠٠٣، برێمەر لە میانەی مونتەدای ئابووری جیهان کە لە ئوردون سازدرا، لە بەردەم سەدان لە بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکانی کۆمپانیاکان، چوارچێوەی دیدی خۆی بۆ هێنانەکایەی بازاڕێکی ئازاد لە عێراقدا دەرخست. کە گوتی: "بازاڕەکان بە شێوەیەکی کاریگەرتر و کاراتر لە سیاسەتمەدارەکان دەستنیشانی سەرچاوەکان دەکەن. بۆیە ئامانجی ستراتیژیمان لە چەند مانگی داهاتوودا بریتی دەبێت لە پێشنیارکردنی سیاسەتگەلێکی کاریگەر بەسەر دووبارە دامەزراندنەوەی ئەو دەرامەتە مرۆیی و ماددیانەی کە لە پرۆژەکانی دەوڵەتەوە بەکارخرابوون، ئینجا بەکارخستنیان لە کۆمپانیاکانی کەرتی تایبەت کە بێگومان سوودو بەرهەمی زیاتریان دەبێت."

لە ١٩ ئەیلولی ٢٠٠٣، برێمەر یاسایەکی دەرکرد کە بە یاسای ٣٩ ناسرا، بە پێی ئەو یاسایە وەبەرهێنەرە بیانیەکان بۆیان هەیە بە تەواوەتی ببنە خاوەنی کۆمپانیا عێراقیەکان بێ ئەوەی داوایان لێبکرێت قازانجەکانیان لە عێراق وەبەر بهێننەوە. بەو جۆرەش بە پێی دەستووری عێراقی رێگریەکی پێشوەخت لەبەردەم هاولاتی و وەبەرهێنەرانی ولاتە عەرەبیەکان دانرا. پیشەسازی نەوتیش تەنیا پیشەسازی بوو کەوا بەتایبەتیکردن نەیگرتەوە،

وەکو چۆن جەی گارنەر ئاماژەی پێدابوو، کە هەرگیز ئەو شتە لەلای خەڵکی عێراقەوە قەبوڵ ناکرێت.

بە پێی فرمانێکی پابەندکار کە ژمارەکەی ۱۳۳۰۳ بوو، لەلایەن سەرۆك بۆشەوە لە کۆتایی ئایاری ۲۰۰٤ ئیمزا کرابوو، بەڵێندەرەکانی نەوت لە عێراقدا تا هەتایە رووبەڕووی دادگاییکردن نابنەوە. کە ئەو فرمانەش هەموو بەرهەمە نەوتیەکانی عێراقی کە لە "وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایەو ئەوەشی لە دوارۆژدا دێنە نێو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئەوانەشی کە هەن یاخود لە ئایندەدا لە رێگەی موڵکی یان لەسەر دەستی کەسەکان دێنە نێو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا." دەگرێتەوە.

بە واتایەکی تر و هەروەك چۆن "جیم ڤالێت" شیکەرەوە لە تۆڕی وزەو ئابووری بەردەوام لە پەیمانگای توێژینەوە سیاسیەکان لە واشنتۆن، روونی دەکاتەوە: "گەر بێتوو کۆمپانیاکانی وەك ExxonMobile یان ChevronTexon مامەڵە بە نەوتی عێراقی بکەن، ئەوا گشت کەلوپەل و موڵك و بگرە کارمەندی ئەو کۆمپانیانە پارێزراو دەبن لە هەموو جۆرە دادگایی کردنێك لە ئەمریکادا. هەر شتێکیش کە پێشوتر بەسەر کۆمپانیا نەوتیەکان لەسەرتاسەری جیهاندا هاتبێت، بۆ نموونە وەك رووداوێکی توندی تانکەری گواستنەوەی نەوت، تەقینەوەی پاڵاوگەی نەوتی، بەکارخستنی دەستی کار بە سوخرە بۆ دانانی بۆڕی نەوت، کوشتنی خەڵکی لۆکاڵی لەلایەن کۆمپانیا ئەمنیەکانەوە، پیسکردنی ئاوو هەوا لە رێگەی بەهەوادادانی ملیۆنەها تۆن لە گازی کاربۆنی ژەهراوی، یاخود بەرزکردنەوەی داوای دادگاییکردن لەلایەن خاوەن قەرزە عێراقیەکانەوە یان لەلایەن حکومەتێکی راستەقینەی داهاتووی عێراقی بۆ قەرەبوو کردنەوە- ئەوا ئەو کۆمپانیانە لە هەموو لێپرسینەوەیەکی دادوەری پارێزراو دەبن."

۲۸٤

ئەو یاسا تازەیە، هەلپەرستەکانی لە واشنتۆندا ورووژاند. "جۆی ئەلباوف" بەڕێوەبەری هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانی جۆرج بۆش لە ٢٠٠٠، کۆمپانیایێکی راوێژکاری لە گرووپەکانی فشاری کۆماریەکان پێکهێنا، بۆ یارمەتی دانی کۆمپانیا ئەمریکیەکان لە بەدەستهێنانی مافی دابەشکردنی هەموو شتێك، بگرە لە دانەوێڵەوە تا دەگاتە پارچەکانی ماشێنو شامپۆش. یەکێك لە پشکدارەکانی "نیو بریدج" بە واشنتۆن پۆستی راگەیاند: "بەدەست هێنانی مافی دابەشکردنی بەرهەمەکانی (پرۆتەرو گامبڵ) وەکو دۆزینەوەی کانێکی زێڕ وایە. کۆگایەکی ٧-Eleven دەتوانێت ٣٠ کۆگای عێراقی پڕبکاتەوە، هەروەها Wal-Mart لە توانای دایە بەرهەمەکانی لەسەرتاسەری ئەو وڵاتەدا بڵاوبکاتەوە." کۆمپانیایێکی تری گرووپی فشار کە لەلایەن "بۆب لیڤینگستۆن"ەوە ئەندامێکی پێشووی کۆنگرێس کە نوێنەری ویلایەتی لویزیاناو سەرۆکی لێژنەی دەستنیشانکردنەکانیش بەڕێوە دەبرا، بە نوێنەرایەتی خانەوادە عێراقیە دەوڵەمەندەکان بە دوای هاوپشکی بازرگانی لەگەڵ کۆمپانیا بیانیەکان بۆ دەسپێکردنی پرۆژە لەسەر ئاستی نێوخۆییدا دەگەڕا.

رەخنەگرانیش سەرەکۆنەی ئەو ریکەوتنەیان کرد، وەکو جۆن "جۆن مەکەین" سیناتۆری کۆماری لە ئەریزۆناوە دەڵێت: "ئەوە لە دەفرێکی پڕ لە هەنگوین دەچێت، کەفایل و مەسەلەی تر بە دوای خۆی رادەکێشێت." ٢٨٥ لەگەڵ ئەوەش هیچ جۆرە بەربەستیەك لەبەردەم حەزو ئارەزووی بەتایبەتیکردن نەبوو. لە تشرینی یەکەمدا "فۆڵی" لە نێو پێنتاگۆن کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانی ئەنجامدا، کە تیایدا رایگەیاند لە ماوەی حەوت مانگی تر، پرۆپۆزەڵێك دەداتە ئەنجوومەنی حوکم لە عێراق دەربارەی بەتایبەتکردنی کاروپرۆژە حکومیەکان. پلانەکەی فۆڵی بریتی بوو لە فرۆشتنی نزیکەی ١٥٠ تا ٢٠٠ کاروپرۆژەی حکومی لە عێراقدا ( کە نزیکەی

نیو ملیۆن عێراقی کاریان تێدا دەکرد)- جگە لە وێستگەکانی سەرچاوەی کارەباو دەزگا داراییەکانی وەك بانکە حکومیەکانو کۆمپانیاکانی بیمە، هەروەها پیشەسازی سوتەمەنیەکانیش. ئەو کۆمپانیانەی کەوا فۆڵی بە نیاز بوو بیانفرۆشێت بریتی بوون لە کۆمپانیاکانی چەمەنتۆ، کارگەکانی پەیینی کیمیایی، کارەکانی پەیوەست بە کانەکانی فۆسفات، کانەکانی کبریتو کارەکانی دەرهێنان، کۆمپانیاکانی دەرمانو هەروەها هێڵەکانی ئاسمانی و کارگەی دروستکردنی تایەی ئۆتۆمۆبیلیش.

وەکو چۆن ناوبراو دەیگوت: "لەگەڵ ئەوەی ئەرکێکی قورسە لە عێراق، بەلاّم بە شێوەیەکی گشتی قورستر نیە لەو ئەرکەی کە لە زۆربەی ولاّتەکانی رۆژهەلاّتدا ئەنجام دراوە، کاریگەریشی تەنیا بەسەر هەریەك لە ژمارەی کۆمپانیاکان و رێژەی هێزی کارەوە دەبێت." ٢٨٦

دوای دوو رۆژ، ناوبراو لە بەغدا لەگەڵ پەیامنێرەکان کۆبوّوە بۆ شرۆڤەکردنی ووردەکاریەکانی بیرۆکەکەی، کە دەیگوت: "بۆ دەسپێکردنی هەنگاوەکانی بەتایبەتیکردن، گرووپێکی بچووکمان هەڵبژارد، کەمتر لە دە پرۆژەوکاری حکومی، کە زۆر بچووكو سادەنو هەروەها کاریگەریەکی ئەوتۆشیان نیە." ٢٨٧

بەلاّم لە دیوە نادیارەکەی ئەو کارە، شتەکان بە باشی بەرێوە نەدەچوون، یەکێك لە پرۆژە حکومیە سەرەتاییەکان، کە بە نیاز بوو بخرێتە زیادکردنی ئاشکراوە بۆ فرۆشتنی، رووبەرووی کارەساتێکی کتوپڕ بۆوە. کۆمپانیایێکی حکومی تایبەت بە بەرهەمهێنانی رۆنی رووەك، کە یەکێکە لە چلو هەشت کۆمپانیای سەر بە وەزارەتی پیشەسازی، سەرپەرشتی هەشت کارگەی بەرهەمهێنانی کەرەستەی بەکاربردنی هەرزانی دەکرد وەك رۆنی زەیتی خواردن تا شامپۆ و مادده پاك کەرەوەکانیشی. حکومەت پاڵپشتی دارایی تەرخان کردبوو بۆ هێنانی مادده خاوەکانی کە ئەو بەرهەمانەی لێ

دروست دەکرا، بەمەش کۆمپانیاکە لە هەر شەش هەزار دۆلار تەنیا یەك دۆلاری دەکەوتە ئەستۆ لە بەرانبەر هێنانی ئەو ماددە خاوانە.

لێزانە ئەمریکیەکانی کەوا لە هاویندا ئەزموونی کۆمپانیاکەیان دەکرد، بڕیارياندا وەکو سەرەتایەك لە هەنگاوێکی ئاسانەوە دەست پێبکەن- ئەویش: پاڵپشتی دارایی حکومەت بوەستێنەو دەرفەتیش لە بەردەم وەبەرهێنەرە تایبەتیەکان برەخسێنە بۆ ئیش پێکردنی کۆمپانیاکە، بە مەرجێك ئازادیەکی تەواویان هەبێت لە وەرگرتنی بڕیاری ستراتیژی کارکردن، وەك داخستنی کارگە کۆنەکان و دەرکردنی کرێکاری زیاد بۆ کۆنترۆڵکردنی تێچوونەکان، هەروەها چاودێریکردنی کڕینی ماددە خاوەکانو فرۆشتنی بەرهەمەکانیش بە نرخی بازاڕ. بۆیە بەڕێوەبەری ئەو کاتەی کۆمپانیاکەی کەوا رۆنی رووەکی بەرهەم دەهێنا، "فازڵ غەنی عەزیز" زۆر بە گەرم و گوڕیەوە دەیگوت: "پێویستیمان بە وەبەرهێنەرانی دەرەکی هەیە، ناتوانین بەو شێوەیە بەردەوام بین."

هەر لەسەر ئەو بنەمایە ناوبراو دەیان کرێکاری دەرکرد، دواتریش لە پڕێکدا کارەکانی کارگەکە رووی لەلاوازی کرد. ناوبراویش لە کاتی چوونی بۆ سەر کارەکەی لە رێگا تەقەی لێکراو کوژرا، ئەم رووداوەش مەترسیەکی زۆری لە نێو وەزارەتی پیشەسازیدا دروست کرد، کە بووە هۆی دەسبەجێ راگرتنی گشت رێو شوێنەکانی بەتایبەتیکردن. ٢٨٨ لە ئاکامدا بەڕێوەبەرەکانی تری کاروپرۆژە حکومیەکان، دژایەتی خۆیان راگەیاند لە بەرانبەر پرۆسەی بەتایبەتیکردن. کە "دەسار ئەلقەساب" بەڕێوەبەری پاڵاوگەی دۆرە دەڵێت: "دەبوایە ١٥٠٠ کرێکار لە کۆی ٢٠٠٠ کارمەند و کرێکاری پاڵاوگەکە لەسەر کار لابدەم. لە ئەمریکا کاتێك کۆمپانیایێك خەڵکی لەسەر کار لادەبات، ئەوا بیمەی کۆمەڵایەتی هەیەو یارمەتی دەدرێت، بۆیە نیگەرانی پەیداکردنی بژێوی رۆژانە زۆر بەسەریاندا زاڵ نابێت. لەبەرئەوە

گەربێتو من ئەو کارمەندانە دەربکەم، واتە بڕیاری کوشتنی خۆیانو خێزانەکانیشیان دەدەم." ٢٨٩

لە کانوونی یەکەمدا، بە هاوکاریەکی کەم لە ناوەوەی عێراقیدا، فۆڵی دووبارە نیازی خۆی ڕاگەیاند بۆ گرێدانی کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی لە پێنتاگۆن. کە تیایدا بەم شێوەیە لێدوانی دایە پەیامنێرەکان: "پرۆسەی بەتایبەتیکردن، پرۆسەیەکی درێژخایەنە، بۆیە پێم وایە چەند ساڵێك دەخایەنێت بەرلەوەی سەرەداوی بەتایبەتیکردنێکی گرنگمان بەرچاو کەوێت، هەروەها پێشبینی ئەوەش دەکەم زۆربەی ئەو کاروپرۆژانە لە کۆتاییدا خاوەندارێتیەکەی بۆ عێراقیەکان بگەڕێتەوە."

ناوبراو لە درێژەی لێدوانەکەیدا، بێ ئەوەی ئاماژە بەوە بدات کەوا کام لە کۆمپانیاکان دەسپێکی بەتایبەتیکردنەکە دەبێت، گوتی:"لە ئایندەدا چۆنیەتی جێبەجێکردن و کاتی پێویستی بەتایبەتیکردن رادەگەێنرێتو هەروەها حکومەتی عێراقیش بۆ ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیە ڕۆڵێکی کاریگەر دەگێرێت." ٢٩٠

لە شوباتی ٢٠٠٤، فۆڵ دانی بە سەرنەکەوتنی پلانەکەی نا. بەوەی کە ئەنجوومەنی حوکم لە عێراقدا سەرتاپای پلانەکەی بۆ بەتایبەتیکردن رەت کردەوە. هەر بۆیەش ناوبراو بە دلگرانیەوە لەو بەڵێنانەی کە لە ساڵی ٢٠٠٣ دابووی پاشگەز بۆوە. لە لێدوانێکیشیدا بۆ رۆیتەرز گوتی: "بە هیچ جۆرێك پلانی فرۆشتنی کاروپرۆژە حکومیەکان بۆ هیچ کەس و کۆمپانیایێکی بیانی لە ئارادا نەبووە. بەڵکو تەنیا بۆ عێراقیەکان بوو." ناوبراو هۆکارەکەش بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە، بەوەی وەزارەتی پیشەسازی تەنانەت توانای سەرپەرشتیکردنو بەڕێوەبردنی گرێبەستیەکانی بەکرێدانی کاروپرۆژە حکومیەکانیشی نەمابوو.

دواتر ناوبراو لە کۆتایی مانگدا عێراقی جێهێشت، ئەرکی

سەرپەرشتیکردنی پەرەپێدانی وەبەرهێنانی کەرتی تایبەتی عێراقی لە دەرەوەی عێراقدا پێ سپێردرا. ٢٩١ لەگەڵ رۆیشتنەکەشیدا، وتەیەکی ماڵئاوایی پێشکەش کرد سەبارەت بەو داخوازیە زۆرەی عێراقیەکان لەسەر سەتەلایت وەکو چۆن لە ئەوروپاو ئەمریکادا هەیە: "لە زۆربەی بالکۆنەکان سینی سەتەلایت دەبینرێت، ئەوەش مانای ئەنجامدانی کارێکە کە جێپەنجەی لە بازاڕەکاندا جێهێشتووە. پێشم وایە لە دوای سەتەلایت داخوازی لەسەر تەلەفونی مۆبایل بە پلەی دووەم دێت.... کە سەرەی دوورو درێژی عێراقیەکان بۆ کرینی ئەو ئامرازە بەڵگەیە بۆ ئەوە."٢٩٢ ئینجا لە کۆتاییدا، فۆلی بە بێ دەنگیو بە یەکجاری عێراقی جێهێشتو گەڕایەوە بۆ "کۆنێکتیکت" بۆ بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکەی بە ناوی گرووپی NTC. ٢٩٣

## داهێنانی دیموکراسیەت لە کارۆلاینای باکوور

هێشتا زۆری ماوە بۆ ئەوەی وەزارەتەکان رێك بخرێنەوەو هەوڵیش بدرێت لایەنە سوودبەخشەکانی حکومەت دەربخرێن. ئەو کێشە ئاڵۆزانەی کە لە کاتی هەڵبژاردنەکان سەرهەڵدەدەن، گەورەترین قەیران بوو رووبەڕووی دەسەڵاتەکانی داگیرکەر دەبۆوە. چونکە ئەگەر راستەوخۆ دوای کۆتایی هاتنی پرۆسەی ئازادکردنی عێراق هەڵبژاردن ئەنجام بدرابوایە، هیچ گەرەنتیەك نەبوو بۆ ئەوەی عێراقیەکان دەنگ بە بەعسیەکان نەدەنەوە، لەبەرمەترسی ئەوەی نەوەك ئەمەریکا وەکو جارەکانی تر پشتیان لێبکات. نیگەرانیەکی تریش، بریتی بوو لە ئەگەری دەورەدانی زۆرینەی شیعەکان بۆ کەمینە سوونیەکانو بەرپابوونی شەڕی ناوخۆ. هەڕەشەی هەرە مەترسیدارترو گەورەتریش لەوانەی باس کران، بریتی بوو لەو راستیەی کەوا حکومەتەکانی وڵاتانی دراوسێی عێراق (عەرەبستانی سعودی و ئێران) لەلایەن ئەو دەسەڵاتە ئاینیانەی کەوا ناحەزی خۆیان بەرانبەر ئەمریکا

دەردەبڕی، حوکم دەکران. بۆیە ئەمریکا نیگەران بوو لەوەی عێراق بەرەبەرە بۆ وڵاتێکی توندڕەو ڕێچکە بگرێت.

هەر لەبەر ئەوە، بڕیاردەرەکان لە واشنتۆن گەیشتنە ئەو قەناعەتەی، کە دەبێت هێدی هێدی دیموکراسیەت بناسێنرێت و کاریش بۆ ئەوە بکرێت ڕژێمێکی هاوشێوەی سیستەمی ئەمریکی دابمەزرێنرێت، بەمەش ڕێگا لەبەردەم بەشداریکردنی گشت چینو توێژەکانی وەك ئافرەت، کەمینە عەشایەریەکان و ڕەنگبێ گرووپە ئاینیەکانیش خۆش بکرێت.

بۆ ئەو مەبەستەش داوا لە پەیمانگای نێودەوڵەتی بۆ توێژینەوەی سێ گۆشەیی RTI کرا کە ڕۆشنبیری دیموکراسی لە نزیکەی ١٨٠ شارو شارۆچکەی عێراقیدا بڵاو بکاتەوە. لە بەرانبەر ئەو کارە USAID گرێبەستیەکی بایی ١٦٧ ملیۆن دۆلار لەگەڵ پەیمانگای ناوبراودا ئیمزا کرد، کە ئەوەش گەورەترین گرێبەستیە لەوەتەی دامەزراندنیەوە بەدەستی هێنابێت. شایەنی ئاماژە پێکردنیشە ئەو پەیمانگایە کە بە گرووپی بیرکردنەوەو پلاندانانیش ناسراوە، بنکەکەشی دەکەوێتە کارۆلاینای باکوور، لە ساڵی ١٩٥٨ بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە لەسەر بازاڕەکان بۆ زانکۆکانی ئەمریکا دامەزرێنراوە.

هەر لەگەڵ دەسپێکردنی کارەکانی، RTI دەستی کرد بە ناردنی پیاوێکی ئاینی لە یوتاه، سەرۆك شارەوانیەك لە هیوستنو پرۆفیسۆرێکی بواری ئەنسرۆپۆلۆجیش لە نیویۆرکەوە، بۆ عێراق بە مەبەستی ئەزموونکردنی پرۆژەکە-یاخود پرۆژەی نەخشەکێشان بۆ دأهێنانی کیانێکی لایەنگر لە بڕیاربەدەستەکان لە عێراقدا، وەکو هەوڵێك بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی حوکم کە دواتر ببێتە دۆستی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا!!

"ڕۆناڵد جۆنسن" سەرۆکی RTI دەیگوت: "هەمیشە ئەنجامدانی هەڵبژاردنی پێشوەختە، توندوتیژی لێ دەکەوێتەوە." ٢٩٤ بۆ خۆلادانیش

لەوە RTI پلانێکی بەکارهێنا کە پێشتر بە هەندێ شێوازی سنوردار لە ئەندەنوسیا و سیلڤادۆر پەیڕەوی لێکرابوو. جۆنسۆن ئەو پلانەی بەم شێوەیەی خوارەوە بۆ "نەعومی کلاین" شرۆڤەکرد کە رۆژنامەنووسێکی کەنەدیەو ریپۆرتاژی بۆ "گاردیان" لەسەر بارودۆخی عێراق ئامادە دەکرد،:

بۆ هەلگرتنەوەی زبڵو پاشماوەکان، رێگەیەکی تایبەت بە سوونەکان یان شیعەکان یاخود سوریەکان نیە. هەموو بوارەکانی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری لەلایەن حکومەتەوە بە تەواوەتی لەکار کەوتوون. گەلێ سیاسەت و رێچکەش هەن بۆ ئەوەی بزانیت چەند کارت بە ئەنجام گەیاندووە، بێگومان گەر بێتوو گەڕەکێکی دیاری کراو لە زبڵ و پاشەڕۆ پاك بکەیتەوەو گەڕەکێکی تر نا، ئەوا لە بەر هۆکاری سیاسیەوە دەبێت.

بۆیە پەیمانگاکەی ئێمە، بریتیە لە دۆزینەوەی رێگا چارە بۆ نزیکبوونەوە لە عێراق و کارکردن تیایدا – (وا دیارە کە لە گرێبەستیەکەمان دا هاتووە مامەڵە لەگەڵ حکومەتە لۆکاڵیەکە دەکەین)- دەشتوانی بڵێی کە سەرەتای کارەکانمان بریتی دەبێت لە دابینکردنی خزمەتگوزاریەکی کاریگەرو کارا، بە شێوەیەك، سەرنجی خەڵکی رابکێشرێت و بتوانن چاودێریشی بکەن- بێگومان ئەو کاتە تۆ دەزانی حکومەت چی ئەنجام داوەو چی تریشی ئەنجام نەداوە.

شێوازی یارمەتی دانیشمان بۆ ئەنجوومەنی گەڕەکەکان بریتیە لە گرێدانی کۆبوونەوە بۆ خەڵکی گەڕەکەکاو بە ئامادەبوونی ئێمەش. بۆیە راگەیاندن بلاّودەکرێتەوە، خەڵکی بانگێشت دەکرێنو هانیش دەدرێن کەوا خەڵکی تریش لەگەڵ خۆیاندا بێنن، بەم جۆرە توانیت کۆبوونەوەیەك لەسەر ئاستی شاردا ئەنجام بدەیت. تەنیا لە رێی ئەو جۆرە کۆبوونەوانەشدا دەتوانرێ گفتوگۆ لەسەر کێشەو مەسەلەکانی

ناوچەیەکی بچووك بکرێت. لە هەمان کاتیشدا تۆ وا لە دانیشتوانە پێگەیشتووەکانی ئەو گەڕەکانە دەکەیت کە خودی خۆیان بەیەکەوە لەگەڵ یەکتری بێن و بەشداری لە کۆبوونەوەکاندا بکەن. ٢٩٥

## عابدێك لە یوتاهەوە

"جەیمس مایفێڵد"ی تەمەن حەفتا ساڵی و پرۆفیسۆری فەخری RTI لە زانکۆی یوتاه بەکارخست، کە ماوەی سێ ساڵە ئەرکی بەڕێوەبردنی کلێسای "Latter Day Saints"ی لە دەوروبەری هیوستن، گرتۆتە ئەستۆ. ناوبراو لە شاری "بابل" کە دەکەوێتە باشووری بەغدا بە دووری ١٢٨ کیلۆمەتر سەرپەرشتی کۆبوونەوەکانی دەکرد، لە ژوورێکدا کە زیاتر لە ژێرزەمین دەچوو لە پشتەوەی مزگەوتێکی گەورەی شارەکە. ئەو مزگەوتە سەدام وەکو سومبولێك بۆ هێشتنەوەی ناوی خۆی دروستی کردبوو. مایفێڵد بەرپرسی شارەکانی بابل، کەربەلا، نەجەف، قادسیە، واسیت بوو.

خەڵکێکی زۆر بانگێشتی ئەو کۆبوونەوەو دانیشتنانە دەکران لە ئەنجوومەنی شارەکە کە لەلایەن RTIـیەوە رێك دەخران. لەسەرەتادا خەڵکێکی زۆر ئامادە دەبوون، رەنگبێ کەسێك پرسیاری ئەوە بکات چی هانی ئەو خەڵکەی دەدا ئامادەی ئەو جۆرە کۆبوونەوانە ببن. ناوبراو لە ئیمەیلێکیدا لە رێکەوتی ٣ ئابی ٢٠٠٣، باسی رووداوێك دەکات کە لە بابل کاتێك خەڵکەکە پرسیاری قورسیان ئاراستە کردبوو:

شەوی رابردوو چووم بۆ یەکێك لە کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی گەڕەکێك. ژمارەی ئامادەبووان خۆی لە ١٠٠ کەس دەداو شوێنی کۆبوونەوەکەش قوتابخانەیەکی گەڕەکەکە بوو کە تیایدا بابەتەکەی خۆمم پێشکەش دەکرد. باسی ئەوەم دەکرد، کەوا دەکرێ سیستەمێکی دیموکراسی لەو گەڕەکە دابمەزرێت. ئینجا خەڵکێکی زۆر لە

ئامادەبووان هەڵسانەوەو قسەیان کرد، بە تەنیا یەك ئافرەتیش کە خاوەن جورئەت بوو هەڵسایەوەو قسەی کرد. دواتر گەنجێك کە تەمەنی لە نێوان ١٧-١٨ ساڵ دەبوو هەڵسایەوەو پرسیارێکی قورسی لێکردم. پرسی: "چۆن دیموکراسیەت دەتوانێ یارمەتیم بدات لە دۆزینەوەی کار؟"

منیش پێم گوت، کاتێك کە رژێمی دیکتاتۆری یابان لە دوای شەڕی دووەمی جیهانی رووخا، دوای نۆ ساڵی تر ئینجا خەڵکی یابانی سیستەمێکی کارای دیموکراسیان بینی. ئێستاش ئەوان یەکێکن لە هەرە دەوڵەمەندترین وڵاتانی دونیا. بۆیە بەو گەنجە عێراقیەم گوت: "گەر بێتوو پرسیار لە پیاوێکی یابانی بکەیت، ئایا ئەوەندەی دەهێنا کەوا نۆ ساڵ چاوەڕێ بکەن بۆ بەدیهاتنی سیستەمێکی دیموکراسی؟ بێگومان یابانیەکان هەموویان لە وەڵامدا دەڵێن بەڵێ ئەوەی دەهێنا." دواتر پێم گوت: "تکایە سەبر بگرن، لای ئێوە نۆ ساڵ ناخایێنێت، رەنگبێ دوو تا سێ ساڵی تر ئەو شتە بەدی بێت، دەتوانن سەبربگرن." ئەویش لە وەڵامدا گوتی: "نەخێر، من ئێستا پێویستیم بە پارە هەیە!!"

ئینجا لە قسەکردن وەستام و رووم کردە خەڵکەکەو پێم گوتن: "ئەوە بزانن کەوا ئەو گەنجە ئایندەی عێراقە. ئەو بە جورئەتەوە هەڵساوەتە سەر پێ و رووبەڕووم بوەتەوەو پرسیاری قورسیشم لێدەکات. ئەوە دیموکراسیەتە. گەر بهاتایە لەسەردەمی رژێمی سەدامدا ئەو لاوە پرسیاری ئاوا قورسی بکردایە، رەنگبوو لە سێدارە بدرابوایە." دواتریش گوتم: "دەمەوێ دەسخۆشی لەو گەنجە بکەم و رێز لە جورئەتی بگرم."

لە پڕێکیشدا، ئامادەبووەکان هەموویان هەڵسانەوە سەر پێ و

چەپڵەیان بۆ گەنجەکە لێدا. گەنجەکەش زۆر دڵی خۆشبوو، منیش بە پەنجە گەورەکەم ئاماژەی سەرکەوتنم بۆ کردو ئەویش وەڵامی دامەوە، دواتر زانیم هاوڕێیەتیەکم بەدەست هێناوە." ٢٩٦

کاتێکیش ماڵفیڵد بۆ جاری دووەم ویستی ئامادەی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی هەمان ئەو گەڕەکە ببێتەوە، زانی کەوا ئەو گەنجە بۆ ئەندامێتی ئەنجوومەنی گەڕەکەکەی کە لێی نیشتەجێیە هەڵبژێردراوە. بۆیە گوتی :"رۆژێك دێت ئەو گەنجە دەبێتە سەرکردە لە عێراقدا."

رەنگبێ زۆر لە رەخنەگران بە گاڵتەوە بڕواننە ئەو بەسەرهاتە، بەوەی زۆربەی ئەو کەسانەی ئامادەی کۆبوونەوەکان دەبوون، بە نیازی گەڕان بە دوای کارو دەسەڵات بەشداری کۆبوونەوەکانیان دەکرد، نەوەك بەشداری کردنی دیموکراسیەت.

"جۆن بێرنس" رۆژنامەوان لە "نیویۆرك تایمز" کە لە کانوونی یەکەمدا، بانگێشت کرابوو بۆ ئامادەبوون لە یەکێك لە کۆبوونەوەکانی مایفێڵد، باس لە بەسەرهاتێکی تر دەکات وەکو نموونە لەسەر پاڵنەرەکانی کە وایان لە خەڵکی دەکرد ئامادەی ئەو کۆبوونەوانە بن. کاتێك ناوبراو چاوی بە "سەید فاروق ئەلقەزوینی" سەرۆکی کۆلێژی لاهوتی کەوت، کە دوای داگیرکردنی عێراق دەستی بەسەر مزگەوتەکەی بابلدا گرتبوو. قەزوینی بە ناوبراوی گوتبوو: "ئێمە دوو ڕووین"، بەوەی کە ساڵێك بەر لە ئێستا ئەگەری ئەوە هەبوو لە هەمان ئەو مزگەوتە نزاو پاڕانەوەی ئاراستەی خوا بکرایە بۆ ئەوەی سەدام بپارێزێت. (بێگومان قەزوینی ئێستا کەسێکی دەسەڵاتداری رەوتەکەی موقتەدا سەدرە، ئەو گەنجە رادیکاڵەی بۆتە سەرئێشە بۆ ئەمریکیەکان.) ٢٩٧

بەڵام مایفێڵد، کە پیاوێکی ئایینی پابەندە و بە شێوەیەکی رێكوپێك لەگەڵ سەربازەکان نوێژو نزا دەخوێنێت، تەواو باوەڕی بەوە هەبوو ئەو

ئەزموونـەی خـۆی لـە عێراقـدا سـەرکەوتوو بـووە، کـە لـە ئیمـایلێکی دا بـۆ "ستیڤن ڤێنسنت" رۆژنامەوان لە "ناشیونالْ رڤیو"ی ناردووە، نووسیبوی:

"دەکـرێ بـەدوای ئـەو نموونەیـە دا بـچین کـەوا ژمارەیـەك لـە بەغداییـەکانی چێـشتخانەیەك لـە وەلامیانـدا بـۆ ئـەو پرسـیارەی ئاراستەیان کرابوو سەبارەت بـەوەی چۆن سـەیری داگیرکـەر دەکـەن؟ ئەوانیش لە وەلامدا دەیانگوت؛ داگیرکەر؟!!! ئەوە ئازادکردنە." بۆیە پێـشبینیەکان سـەبارەت بـە خراپبـوونی بارودۆخەکـە نەهاتنـە دی، لەگـەلْ ئەوەشـی کـەوا میـدیاکان بـەردەوامن لەسـەر دەرخـستنی ئـەو رووداوانەی باس لە هەرەسهێنانی هەوڵەکانی ئـەمریکا دەکـەن. بـەلام لە راستیدا تەقینەوەکان زیـاتر ئاڕاسـتەی خـەلکی مـەدەنی دەکرێـتو ئازاریـان دەدات لـەوەی هێزەکـانی ئـەمریکی بگرێتـەوە. چـونکە هێرشەکان لە دژی داگیرکەری ولاتە یەکگرتووەکانەوە ئەنجام نادرێت، بەلکو لە دژی دانیـشتوانە نەبـەردو ئازاکـانی عێـراق ئـەنجام دەدرێـن، ئەوانەی رێگەیان بەرەو دیموکراسیەت گرتووە. بەرهـەمهێنانی نـەوت لـە زیـاد بـوون دایـە، کـرێو مووچـەکان بەرزبوونەتـەوە، مادەکـانی بـەکاربردن بازاڕەکـانی پـڕ کـردووە، خزمەتگوزاریـە گـشتیەکانیش باشـترن. بـە پێـی راپـۆرتێکی واشـنتۆن تـایمزیش لەوەتـەی رووخـانی رژێمی سەدام نزیکەی ملیۆنێکی تـر لـە عێراقیـەکان بوونەتـە خـاوەن ئۆتۆمۆبیل.

دواتر لە ١٢ کانوونی دووەمی ٢٠٠٤، RTI ماشـێنێکی بـەنرخی بەخـشیە مایفێلد، کە ناوبراو بەو جۆرە وەسفی دەکرد:

ئەو ئۆتۆمبێلەی کە نرخەکەی ٢٠٠٠٠٠ دۆلارەو هەموو بەدەنیشی زرێپۆشە پێم بەخشرا، چونکە من بەرێوەبـەری هـەرێمیمو پێویـستە بەردەوامو بە شێوەیەکی رێكو پێك بە ناو هەرێمەکەدا سەفەر بکەم.

ئەستووری شوشەکانی پەنجەرەکان دوو ئینجە، سێ رادیۆی بێ تەلی تێدایە، زەنگی ئاگادارکردنەوە لە کاتی داواکردنی یارمەتی دەنگەکەی بەرزەو هەموو کوشینەکانیش بە چەرم داپۆشراون. ئەو جۆرە ماشێنانە بۆ باڵیۆزەکان دروست دەکرێن و تایەکانیشی زۆر تایبەتن، گەر بێتوو تەقەشیان لێ بکرێت و کون بکرێن، ئەوا هەر توانای لێخوڕینیان دەبێت. ئەوە ماوەی هەشت مانگ دەبێت من لێرەمو هیچ کەسێکیش تەقەی لێ نەکردووم، کە پێشتر دەبوایە ئێلەگی گوللە نەبڕ بپۆشم، چەند سەنگی قورس بووو ناڕەحەتیش بوو. بەلاّم ئێستا سوپاس بۆ خوا پێویست ناکات ئیتر ئەو ئێلەگە لەبەرکەم. بۆیە گەر بەردەوام تەقەشم لێ بکەن، ئەوا هیچ کاریگەریەکی نابێت. ٢٩٨

سەرەڕای باوەڕی تەواوی ناوبراو بە کارەکانی، بەلاّم راهێنەرەکانی RTI لە عێراقدا گومانیان لە شێوازەکانی هەبوو. "جێری کوهەیدا" سەرۆکی شارەوانی پێشوو لە تێنێسی پێی راگەیاندم: "وا هەست دەکەم ئەوە دوا هێزو توانای ناوبراو بێت، چونکە بە هیچ شێوەیەك گوێی بۆ بیرۆکەو بۆچوونی تر نەدەگرت. جا چ ئەو شێوازە هی خۆی بووبێت یان نا، کێشەکە ئەوەیە کە شێوازێکی ئەکادیمیانە بووە. من ماوەی پانزە ساڵ لە شارەوانی شارەکەمدا خزمەتم کردووە، بەلاّم گومانم هەیە لەوەی ئەو شێوازەی ناوبراو پەیڕەوی لێ دەکات لە ئەمریکا بەسوود بێت."

کاوهایدە باسی چەند شتێکی مەترسیداریش دەگێڕێتەوە، سەبارەت بەوەی چۆن مایلفێڵد، دەرامەتە گرنگەکانی سوپای بەکارهێناوە بۆ دابەشکردنی ئەو دەرمانانەی لەلایەن مۆرمۆنەکانەوە بە کۆمەڵگەکەی بەخشراوە. کە دەیگوت: "ئێمە هەرگیز داوامان لێ نەکردوون دەرمان ببەخشن، لە راستیشدا هەرگیز ئەو شتەشمان پێ نەگەیشتوو کە داوامان کردوون، لە بری ئەوەدا ئێمە ناچاردەبووین بڕی زۆری پارە خەرج بکەین -

دەیان هەزار دۆلار- بۆ گواستنەوەی ئەو کەلوپەلانە لە ژێر چاودێریکردن و پاسەوانێتیەکی توندی چەکداریەوە. لە کۆتاییشدا زۆربەی کەلوپەلەکان لای مـن کەڵەکـە دەبـوونو دەبوایـە بـە دوای کەسـانێك بگـەڕێم تـاوەکو پێیـان ببەخشم." ٢٩٩

## لە تەکساسەوە، کەسێك بە مووچەیەکی بەرزی خانەنشینەوە

هاوشێوەی مایلفێڵد لە بەغدا، پیاوێك بوو بە ناوی "ئەلهاینێس" کە ئەویش تازە لە هیوستنەوە گەیشتبوو. بە پێچەوانەی ئەو ئامۆژگاریکارە خانەنشین بووە، ئەو کارمەندێکی پێشووی شارەوانی بوو، کە دەستی لەکارەکەی کێشابۆوە دوای ئەوەی دەسەلاتی خۆی لە پۆستەکەی بەکارهێنابوو بۆ زیادکردنی مووچە خانەنشینەیەکەیو هەروەها ساغ بوونەوەی کەمو کورتیەکی زۆر لە پارەی دانراوی بودجەی شارەوانی لە ئەستۆی ئەودا.

ناوبراو دوای دەست لەکار کێشانەوەکەی، هاتە عێراق بۆ ئەوەی سەرپەرشتی تیمێك بکات کە ئەرکە سەرەکیەکەی بریتی بوو لە ئامۆژگاری کردنی شارەوانی بەغدا تەنیا دوای دوو مانگ پێش ئەوەی بەرپرسە پێشووەکەی، "لی براون"ـی سەرۆکی شارەوانی، وادەی سەرۆکایەتیەکەی تەواو بکات کە دوا سێهەمین دەورەی بوو لەو پۆستە، لەکار لادرا. ٣٠٠ گلەیی و گازاندەیەکی زۆری لە دوای خۆی جێهێشت بەوەی توانای چارەسەرکردنی ئەو قەیرانە داراییانەی نەبوو کە لە ئاکامدا هۆکاری نەهامەتی بوون بۆ خۆی سەرۆکەکەشی لە شارەوانی شارەکە.

بۆ نموونە لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٠، دەبوایە ناوبراو داوای سوودی کۆتایی مانگی بکردایە- کە بڕی هەشت ملیۆن دۆلار لە پارەی تەرخانکراو بۆ کاروباری تەندروستی شارەکە بە قەرز وەرگیرابوو، هەروەها بڕی یەك ملیۆن

دۆلاری تریش لە کرێی کرێکارەکانی شارەکە- بۆ ئەوەی شارەوانی بتوانێت لە ٢٩ کانوونی یەکەم مووچەی نۆ هەزار پۆلیس و ئاگرکوژێنەوە بدات. کە "ئانیس پارکەر" ئەندامی ئەنجوومەنی شارەوانیەکە گوتی: "تێناگەم چۆن شتی ئاوا روودەدات، ئەوە وەکو ئەوە نیە کە مووچە بکەیتە هۆکارێك بۆ سەرسامکردن." هانیاس بۆ بەرگریکردن لە خۆی، دەڵێت: گەلێك رێسا و یاسا هەن لەبەردەم ئەو برە پارانەی کە دەبێت لەبەردەستی ئەنجوومەنی شارەوانیدا بن بێ ئەوەی لەلایەن خزمەتگوزاری داهاتی ناوخۆییەوە IRS رووبەرووی لێپرسینەوە ببێتەوە. بەلام لە مانگی حوزەیرانی پێش ئەو رووداوە، ئەنجوومەنی شارەوانی ناچاربوو، دوو رۆژ بەر لە وادەی دانی مووچە دەنگ لەسەر گواستنەوەی ٣٠ ملیۆن دۆلار لە بەندێکەوە بۆ بەندێکی تر بدات، بۆئەوەی بتوانێت مووچەی کارمەندەکان لە کاتی خۆی بدات. هەروەها لە ١٩٩٩، دوای ئەوەی لە داهاتی باج زیادەخەملاندن هەبوو، بوودجەی شارەکە بە بری ٣٨ ملیۆن دۆلار کورتی هێنا. ٣٠١

خراپی بەرێوەبردنی دارایی لە ئەمریکا، وەکو پەتایەك زۆربەی شارەوانیەکانی گرتەوە، بەلام ئەوەی هاینێسی لە ئەوانی تر جیا دەکردەوە ئەوە بوو کە لەسەردەمی ئەو، ئەنجوومەنی کارگێری مووچەی خانەنشینی لە ساڵی ٢٠٠٣دا، بری ١,٣ ملیار دۆلاری وەکو قەرز دایە حکومەتی ئەو شارە، کە بە پێی پلان دەبوایە تا ساڵی ٢٠٠٩، بگاتە ١,٨ ملیار دۆلار.

بە پێی شیکردنەوەیەکی بلاوکراوە لەلایەن رۆژنامەی "هیوستن کرۆنیکاڵ" لە ئاداری ٢٠٠٤، هانیاس پێنج مانگ دوای جێهێشتنی پۆستەکەی، دەرکەوتووە کەوا مووچەی خانەنشینیەکەی بە پێی پلانێکی کۆنی ساڵی ١٩٩٨ بریتی بووە لە ٣٦٠٠٠ دۆلار لە ساڵێکدا، بەلام دواتر بە پێی پلانێکی تازەی ساڵی ٢٠٠٣ بەرز بۆتەوە بۆ ١٠٣٠٠٠ دۆلار ساڵانە. بە پێی لێکدانەوەیەکی رۆژنامەکە، هاینێس نەخشەی کێشاوە تاکو رێژەی ٧١,٣٪ کۆی

مووچــەکەی کــە دەگاتــە ١٤٥٠٠٠ دۆلار لــە ســاڵێکدا وەربگرێــت لەبەرانبــەر خزمــەتکردنی لــە شــارەوانی بــۆ مــاوەی دە ســاڵو نــۆ مــانگ. چــونکە گــەر بهاتبوایە کار بە پلانەکەی ساڵی ١٩٩٨ بکرایە، ئەوا ناوبراو رێـژەی کـەمتر لـە ٢٥٪ کۆی مووچـەکەی وەردەگـرت. لـە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەکـەش لەگـەڵ ناوبراودا لە رێی ئیمایلەوە، هاینێس دەڵێت: لەسـەردەمی سـەرۆکایەتیکردنی "لی بـڕاون" بـۆ شـارەوانی، زۆربـەی مووچـەکانی خانەنـشینی دەگـۆڕان، بـە شێوەیەك دادەنران قەرەبووی مووچە هەرە نزمەکانی کارمەندەکانی شارەکە بکەنەوە.

کـاتێکیش کاربەدەسـتانی شـارەوانی پێیـانزانیو پەسـت بـوون، نـاوبراو گەیشتبووە دیوەکەی تری جیهان و ژیانی لـە یـەکێك لـە کۆشـکەکانی یـەکێك لـە کوڕەکـانی سـەدام حوسـێندا بەسـەر دەبـرد. (وەکـو چـۆن "شـێلی سـیکۆلا گیــبس" کــە ئەنــدامێکی چــالاکی ئەنجوومــەنی شــارەوانی هیوســتنە لــە لێدوانێکیدا بۆ هەواڵەکانی کەناڵی تەلەفزیۆنی١١، گوتبووی: "لێـرە حکومـەت بۆ ئەوە نیە خەڵکانێك دەوڵەمەند بکات.") ٣٠٢. نـاوبراو بـەردەوام دەبێـتو لـە لێـدوانێکی تـری دا بـۆ پـەیامنێری خزمـەتگوزاری هەواڵـەکانی کـۆکس: "لەگەڵ ئەوەشی، هاینێس لـە شـارەوانی دوو شـاری زۆر لەیەکچوو کاردەکات (لە هیوستن کە دابەش دەبێتە سەر ٨٨ گەڕەك، هەروەها بەغداش بە هـەمان شـێوە ٨٨ گــەڕەکی هەیــە)، جگــە لــە لێکــچوون لــە ژمــارەی گەڕەکــەکان، لێکچوونێکی نائاسایی هەیە لە جۆری ئەو باس و گفتوگۆیانەی کـەوا خـەڵکی هەردوو شار سەرقاڵینە، منیش پێشتر گوێم لە هەردوو لا بووە."٣٠٣

کاتێـك کاربەدەسـتەکانی RTI "ئیـبراهیم موسـتەفا حوسـێن" جێگـری سەرۆکی شارەوانی بەغدا بۆ کارەکانی خزمەتگوزاری سیستەمی ئـاو و بـۆڕی لە شارەکە، بە شاندێکی رەسمی بۆ گۆڕینەوەو فێربوونی ئەزموون لەیـەکتری دەنێرنە شاری هیوستن لە ئەمریکا، ناوبراو سەرسام دەبێت بـەو لێکـچوونەی

که له نێوان هەردوو شارەکەدا هەبوو. لە لێدوانێکیشیدا بۆ رادیۆی گشتی نیشتمانی دەیگوت: "هەردوو شارەکە ٨٨ ئەنجوومەنی گەڕەکی لێیە.... هەروەها جۆری خاکەکەشیان تەختاییە. هەمان جۆری خزمەتگوزاریش لە هەردوو شارەکەدا هەیە. مەبەستم لە دابەشبوونی تۆڕی بۆڕیەکانی ئاوە- کەرەستەی بەکارهاتوو هەمان شتە. کێشەی رێگاوبان و هات وچۆکانیشمان لەیەکتری دەچن." ٣٠٤

بەلاّم لەلایەکی ترەوە هەندێ جیاوازی زۆر گرنگ لە نێوان هەردوو شاردا هەیە. یەکەمیان، کاربەدەستەکانی شارەوانی لە هیوستن لەلایەن خەڵکیەوە هەڵبژێردراون، کەچی لە بەغدا لەلایەن دەسەلاّتی داگیرکەرەوە دامەزرێنراون و لەلایەن RTIیشەوە بەڕێوەدەبرێن. جیاوازیەکی تریش کە شیاوی ئاماژەپێکردنە، هیچ کام لە ئەنجوومەنی شارو ئەنجوومەنی نێوخۆیش لە بەغدا کۆنترۆڵیان بەسەر بودجەدا نیە.

## دەستەبژاردن نەوەك هەڵبژاردن

لە ئایاری ٢٠٠٣، کەمتر لە مانگێك دوای داگیرکردنەکە، هەڵبژاردنەکانی شاری موسڵ کە دەکەوێتە باکووری عێراق و مشت و مڕێکی زۆریشی لەسەر بوو، راگیرا. بۆیە سوپا هەڵسا بە دابەشکردنی کورسیەکانی ئەنجوومەنی ئەو شارە کە ژمارەکەی ١٨ کورسی بوو بەم شێوەیە: ١٠ کورسی بۆ زۆرینەی عەرەبی، ٢ کورسی بۆ کوردەکان، دوو کورسیش بۆ کریستیانەکان، هەروەها تورکمان و ئێزیدی و مەسیحیە ئاشووریەکانیش هەریەکەیان کورسیەکیان بەرکەوت. بەلاّم شێوازی هەڵبژاردن لەسەرتاسەری عێراقدا، بریتی بوو لە هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی شارەوانیەکان لەلایەن گرووپێکەوە کە لە نزیکەی ٢٠٠ کەسایەتی بەرچاوی ناوچەکە پێك هاتبوو. نەوەك پەیڕەویکردن لە سیستەمی دەنگدانی تاك، واتە هەر کەسێك مافی دانی یەك

دەنگی هەبێت، بۆیە خەڵکانێکی زۆر مافێکی رەوای دەنگدانیان لە کیس چوو. ٣٠٥

RTI لە نزیکەوە لەگەڵ دەسەڵاتی هێزەکانی داگیرکەر بۆ دامەزراندنی ئەو ئەنجوومەنە نوێیە و (دیموکراسیە) کاری دەکرد. بۆ نموونە لە کانوونی یەکەمدا کاربەدەستانی RTI لە شارۆچکەی رۆمێسە کە سەر بە پارێزگای موسەننایە، بە هاوکاری سوپا کۆتاییان بە دامەزراندنی ئەنجوومەنی شارەکە هێنا، لەسەرەتا دەستیان کرد بە بلاّوکردنەوە و هەڵواسینی پۆستەر کە تیایدا داوایان دەکرد کەسی شیاو خۆی بۆ ئەنجوومەنی شارەکە کاندید بکات. ئینجا لە نیسانی ٢٠٠٤ لیستی کاندیدەکانی کەوا ناوی خۆیان تۆمارکرد لەلایەن ئەنجوومەنێکی هەشت کەسی پێکهێنراو لەلایەن هێزەکانی سەربازی ئەمریکاوە پێداچوونەوەی بۆ کرا. ئەنجوومەنە پێکهێنراوەکە سەد ناوی لە لیستە پێشکەشکراوەکەدا هەڵبژارد و بانگێشتی کردن بۆ ئەوەی لە هۆڵێکی شارەکەدا کۆببنەوە، تاکو دەنگ بەو کەسە بدەن کە دەیانەوێت کورسی ئەنجوومەنی بەرکەوێت. دەنگدانی یەکەم بۆ هەڵبژاردنی بەڕێوەبەر بوو، کە دواتر کەسی هەڵبژێردراو بۆ ئەو پۆستە سەرپەرشتی گشت پرۆسەکانی تری هەڵبژاردنەکەی دەکرد. ئەنجوومەنە پێکهێنراوەکە لە حەوت کەس پێکهاتبوو، کە هەر یەکەیان بەرپرسیارێتی سێکتەرێکی وەك تەندروستیو ئاوو ئاوەڕۆ یان ئاسایش کەوتە ئەستۆ. ٣٠٦

مەبەست لەو کردارە بریتی بوو لە بەشدارییپێکردنی ناڕاستەوخۆی خەڵکی لە "دەستەبژێرکردنێکی دیموکراسیانە" لەسەر ئاستی نێوخۆییدا، بۆ ئەوەی وەکو هەنگاوی یەکەم لە رێی بەدیهێنانی دیموکراسیەت، بۆ جیهان دەربخرێ. لەوەش دەچوو سیستەمەکە بە ئەنقەست؛ بیرۆکەی بەشدارییپێکردنی گشتی(هەموو کەسێك لە توانای دابوو ناوی خۆی تۆمار بکات)، ئاوێتەی ئاستێکی دیاریکراوی دەنگدان کرابوو (تەنیا ئەوانەی ناویان

له لیستی کاندیدەکاندا هەبوو دەیانتوانی دەنگ بدەن)، لە کۆتاییشدا، دوای پەسەندکردنی سوپا بۆ کاندیدەکان ئینجا دەسەلاتەکان دەبەخشران.

دەسەلاتی داگیرکەر بەو هیوایە بوو ئەو کارە دواتر ڕێگەیان پێ بدات، سیستەمێکی ئەنجوومەنی پێنج ئاستی پێك بهێنن، بە جۆرێك کۆسپو تەگەرە نەخەنە بەردەم چاودێرو سەرپەرشتە ئەمریکیەکان. دوای ئەوە ئەنجوومەنە هەڵبژێردراوەکانی گەڕەکەکان، دەست دەکەن بە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی ناوچەکان، ئەوانیش لەلای خۆیانەوە ئەنجوومەنەکانی هەرێمەکان هەڵدەبژێرن، ئینجا ئەوانیش ئەنجوومەنەکانی پارێزگاکان هەڵدەبژێرنو لە کۆتاییشدا ئەنجوومەنی پارێزگا لە ڕێی دەنگدانەوە پارێزگار هەڵدەبژێرن. سیستەمێکی سیاسی تەواو نوێ کە لە توانای دا دەبێت پشتگیری لە داگیرکەر بکاتو لە هەمان کاتیشدا کۆمەڵێك پێوەری تایبەت بە نوێنەرایەتی کردنێکی بنکە فراوانیش دابین دەکات.

لە کاتێکدا ئەو ئەزموونانەی "دیموکراسی" تاقیدەکرانەوە، زۆر لە عێراقیەکان گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی کەوا ئازادن لە چۆنیەتی ڕێکخستنەوەی کاروبارەکانی خۆیان، لە تواناشیاندا هەیە هەڵبژاردنێکی ڕاستەقینە ئەنجام بدەن. بەلام لە کۆتایی مانگی حوزەیراندا، زۆربەی سەرکردەکانی سوپای ئەمریکی، بە مەیجەر ژەنەڕاڵ "ڕێی ئۆدێرنۆ"شەوە(سەرکردەی یەکەی پیادە سەربازیەکانو بەرپرسی نیوەی سەرەوەی عێراق) فرمانیان دا بە ڕاگرتنی هەڵبژاردنە ناوچەییەکانو وەرگرتنەوەی بەرپرسیارێتی لە لۆکالیەکان. بەهانەشیان بۆ ئەو کردارە بریتی بوو لەوەی، "پۆڵ برێمەر" لە چاوپێکەوتنێکدا گوتبووی: "زوو ئەنجامدانی ئەو هەڵبژاردنانە ڕەنگبێ ئاکامی خراپی لێ بکەوێتەوە. چونکە دەبێ زۆر بە وریاییو لەسەرەخۆ ئەنجام بدرێن."

بەلام وادیاربوو سوپا تەواو وریا نەبوو. چونکە ئەفسەرە سەربازیەکانو

سەرکردەکانی پۆلیسی عێراقی، ئەوانەی لە حیزبی بەعسەوە نزیک بوون، بە سەرۆکی شارەوانی گەلێك لە شارو شارۆچکەکانی وەك: سامەڕا، نەجەف، تکریت، بەلەدو بەعقوبەش دامەزرێنرابوون. "عبدول مونعیم عەبود" کە بە سەرۆکی شارەوانی نەجەف دەستنیشان کرابوو، پێشتر پلەی عەقیدی هەبوو لە یەکەی تۆپخانەکانی سەربە سوپای پێشووی عێراقی، "نەبیل دەروێش موحەممەد" ئەویش پلەی عەقیدی هەبووە لە یەکەیەکی پۆلیسی عێراقی، بە سەرۆکی شارەوانی بەلەد دانرابوو، هەروەها سەرۆکایەتی شارەوانی سامەڕاش درابووە "شاکر مەحمود موحەممەد" لیوای خانەنشینکراوی سوپای پێشووی عێراقی.

بۆیە عێراقیەکان دلگران بوون، وەکو چۆن "باحیس سەتار" کە مامۆستای زانستەکانی زیندەوەرزانیەو کەسایەتیەکی عەشایریشە، خۆی کاندید کردبوو بۆ سەرۆکایەتی شارەوانی سامەڕا لەو هەڵبژاردنانەی کە دواتر بۆ جاری دووەم رەت کرایەوە، لە لێدوانێکیدا بۆ واشتۆن پۆست گوتی: "ئەوان لیوایێکی خانەنشینکراویان بۆمان هێناوە، ئەمە مانای چیە؟ بەر لە هەموو شتێك ئەو لیوا عێراقیانە تا ئێستا سێ شەڕیان دۆڕاندووە! ئەوان بگرە نەیانزانیوە کارەکەی خۆیان کە سەربازی بووە بە باشی ئەنجامی بدەن، چی لە بارەی بەڕێوەبردنی شارێك دەزانن؟ مەرج نیە ئەو سەرۆك شارەوانیە نوێیانە مرۆڤی کامڵ بن، بەڵام پێم وایە گەر بێتوو رێگەمان پێ بدەن بۆخۆمان حکومەتی خۆمان هەڵبژێرین، ئەوا گەلێك لە کێشەو گرفت چارەسەردەکرێن. گەر بێتوو لە زۆرینەی عێراقیەکان بپرسیت، ئایا حکومەتتان هەیە؟ بێگومان بە نەخێر وەڵامت دەدەنەوە، ئەوەی هەمانە هێزێکی داگیرکەرە. بۆیە ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەی خەڵکی بیرکردنەوەیەکی مەترسیدارە."[٢٠٧]

# ڕۆیشتن بەرەو دواوە

لە شارۆچکەی تاجی کە نزیکە لە بەغداو دەکەوێتە باکووری شارەکە. دەستەیەك لە راوێژکارەکانی RTI (بە سەرپەرشتی ئەمەل رەسام کە پرۆفیسۆرێکی عێراقی ئەمریکیە لە بواری ئەنسرۆپۆلۆجیدا و نیشتەجێی شاری نیویۆرکە) بە خۆیان و کۆڵەگەیەك نەخشەی ئەو ناوچەیە گەیشتنە شارەکە، بۆ چاودێریکردن و سەرپەرشتیکردنی پرۆسەی "دەستەبژاردن"ەکە. مەبەستیشیان تەنیا دڵنیا بوون بوو لەوەی خەڵکەکە پێشتر سەرکردەکانی خۆیان هەڵبژاردووە.

"جۆنسۆن" کارمەندێکی رێکخراوی ناوبراوە و لە رۆژانی سەرەتای داگیرکردنەکە سەردانی تاجی کردبوو، دەڵێت، تا رادەیەك هەڵەکانی سوپا بەشێك بوو لەو شپرزەییەی کەوا RTI تێی کەوتبوو:

ئەفسەرێکی لۆکاڵی کە پلەی یاریدەدەری عەقیدی هەبوو، هەروەها سەرکردایەتی بەتالیۆنێکی تۆپخانەی دەکرد کە لە نێو سەربازگەیەکی سوپادا جێگیر ببوو، کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرۆك هۆزەکانی شارەکە ئەنجام دابوو، داوای کۆمەڵێك کەسیشی کردبوو لە خەڵکی شارەکە بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن لە ریزبەندکردنی کۆمەڵێك پرۆژە بە پێی گرنگیان- وەك چاککردنەوەی قوتابخانە و.. هتد- هەربۆیە داوای کۆمەڵێك خەڵکی کرد بۆ ئەوەی ئەمریکیەکان بە هەرەمەکی ئەو قوتابخانانە هەڵنەبژێرن کە پێویستیان بە چاککردنەوە نیە، بەڵکو ئەو گرووپە خەڵکە پێویستن تاکو رێنوێنی ئەمریکیەکان بکەن بۆ قوتابخانەکانی کە پێویستیان بە چاککردنەوە هەیە. بۆیە ناوبراو گوتی ئێمە ئەو کارە دەکەین واتە قوتابخانەکان چاك دەکەینەوە. لەوەش زیاتر پرۆژەی تریشمان هەیە کە دەبێ

جێبەجێیان بکەین، بۆیە پێویستیمان بە ئێوە هەیە تاپێمان بڵێن کام پــرۆژە گرنگــە تــاوەکو لــەوێوە دەســت پــێ بکــەین. پێویــستە ئێــوە یارمـــەتیمان بـــدەن لـــە دەستنیـــشان کردنیـــان. بەشـــێکی زۆری گرووپەکانیش بریتی بوون لەسەرکردەی هۆزەکانی ئەو ناوچەیە. بـە جۆرێـك کـە دەتوانیـت بڵێیـت نوێنەرایـەتی کردنێکـی باشـی سـەرۆك هۆزەکـان لـە گرووپەکـەدا هـەبوون. ئـەوەش لـە بنەڕەتـدا ئاماژەیـەك بوو، بۆ سەرۆك هۆزەکـان کـە ئێـوە دەتـوانن خۆتـان بـۆ ئەنجوومـەنی شارەوانی کاندید بکەن، دواتریش خۆیان کاندید کرد. ٣٠٨

مـولازم "ئـــەنتۆنی فۆنکهاوســـەر" ســـەرکردەی بـــەتالیۆنی پێنجـــەمی ئەندازیاری لە لیونارد وودی سەر بە ویلایەتی میزۆری. وەسفی ئەنجامـدانی پرۆسـەی هەڵبـژاردنی عێراقیـەکان لەلایـەن سـەربازە ئەمریکیەکانــەوە، بـۆ واشنتۆن پۆست دەکات و دەڵێت: "ئێمە چووینە گوندێك و گوتمان: کێ لێـرە بەرپرسە؟ ئێوە پێویستیتان بە نوێنەر هەیە؟ بۆیە چوار تـا پێـنج کـەس لـە نێـو خۆتانـدا هەڵبـژێرن." راپۆرتەکـە بـەو شـێوەیەی خـوارەوە درێـژە بـە باسەکە دەدات:

لە ماوەی یەك هەفتەدا، خەڵکی گوندەکە هەڵبژاردنیان ئـەنجام دا. زیـاتر لـە ٦٠٠ پیـاو بەشـداریان لـە دەنگـدان کـرد و دەنگەکانیـشیان لەســەر تەختــە رەشــەیەك لــە نێــو قوتابخانەیــەکی کــچاندا تۆمــار دەکـرا.... دەیـان کـەس خۆیـان کاندیـد کردبـوو، بـەلام تـەنیا پێـنج کەسیان هەڵبـژێردران. ئینجا خـەڵکی گوندەکە لیستێکیان بـە نـاوی پێنج هەڵبژێردراوەکە هێنـا بـۆ لای فۆنکهاوسەر، پشتگیری خۆشیان دەربـڕی بـەوەی خـەڵکی ئـەو گونـدە کەسـە هەڵبـژێردراوەکان بـە سەرکردەی خۆیان دەزانن.

دواتــریش فۆنکهاوســەر چــووە مــاڵی "رەحمــان حەمــە رەحــیم"

سەرۆکی پێشووی شارەوانی و سەرۆکی هەڵبژێردراوی ئەنجوومەنی گەڕەك. لە دوانیوەڕۆیەکی هاویندا و لەمیانەی خواردنی کەباب و خواردنەوەی پیپسی، هەردوو ناوبراو دانوستانیان دەکرد بۆ گەیشتن بە رێکەوتنێکی ئاشتیانە. سوپا یارمەتی گوندەکە دەدات لە چاککردنەوەی قوتابخانەو نەخۆشخانەکان، هەروەها بۆ دۆزینەوەی کاریش بۆ گوندییەکان. لە بەرانبەریشدا، حەمە رەحیم و سەرکردەکانی تریش قسە لەگەڵ هەڵگەراوەکان دەکەن بۆ ئەوەی هێرشەکانیان لە دژی سوپای ئەمریکی رابگرن و زانیاریشیان بدەنێ لەبارەی شوێنی حەشاردانی چەك و تەقەمەنی. بۆیە بە پێی راگەیاندنی هەردوو لاوە، رێکەوتنێکی باش بوو. نەخۆشخانەو قوتابخانەکان ئێستا پانکەو تەختەی دانیشتنی تازەیان بۆ هێنراوە. کارەباش گێردرایەوە. ئەو ناوچەیەش ئێستا لە ئارامترین شوێنەکانی ئەو دەڤەرەیەو سەربازەکانیش بە بێ ترس سلاو لە گوندییەکان دەکەن و شیرینی لەگەڵ یەکتریدا دەگۆڕنەوە. ٣٠٩

کاتێکیش، ئەمەل رەسام لە ٣٠ تشرینی یەکەمدا گەیشتە ناوچەکە، بەلایەوە سەیر بوو کاتێك زانی یازدە ئەنجوومەنی گەڕەکی هەڵبژێردراو لە گوندەکاندا هەیە و لە شارۆچکەکانیش گروپێك هەن ناویان لە خۆیان ناوە "ئەنجوومەنی شارەوانی تاجی" کە ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتیە دیارەکان دەگرێتە خۆی. بۆیە ناوبراو بە خەڵکەکەی راگەیاند، پێویستە پەیڕەوی لەو مۆدێلەی کەوا RTI دایناوە بکەن و پێی گوتن: "گەلێك زانیاری هەڵە و بەرژەوەندی دژ بە یەکتر و پێشبینیکردنی دوور لە ئارادایە، پێویستیشی بە راستکردنەوە هەیە." لە ئەنجامی ئەمەشدا، "سەدام عبدالرحمان زێدان" ئەندامی ئەنجوومەنی شارەوانی تاجی زۆر بەم شتە دلگران بوو، دەیگوت: "ئێمە بۆچی دەبێ مانگێکی تریش دووبارە سەرقاڵی هەمان شت بینەوە؟"

یەکێکی تریش کە نارەزایی دەردەبڕی دەیگوت: "هەست دەکەین بۆ دواوە دەگەڕێینەوە."

ژمارەیەك لەسەرکردەکانی هۆزەکان، بە "صباح زەیداق"یشەوە کە سەربازە ئەمریکیەکان بە "شێخی شێخەکان" ناویان دەبردو بەوتەی خۆی نوێنەرایەتی نیوەی دانیشتوانی تاجی دەکات، بڕیاریان دا هاوکاری RTI و سوپاش نەکەن، لە ترسی ئەوەی نەوەکو بە بەکرێگیراو سەیریان بکرێت.

کەسانی تری وەك "کەمال کەیوان عبدالرزا" سەرۆکی ئەنجوومەنی شارەوانی تاجی، دەیگوت رێکخراوی RTI بریتیە لە پیلانێکی بەعسیەکان بەمەرامی گێڕانەوەیان بۆ دەسەلآت بەکاری دەهێنن. کە دەڵێت: "ئەو پلانە لەلایەن چەند بەکرێگیراوێك کە پەیوەندیان لەگەڵ رژێمی پێشوودا هەیە نەخشەی بۆ کێشراوە." ٣١٠

## ناوچەی سەدر

لە ناوچەی سەدر کە یەکێکە لە گەڕەکە هەرە هەژارەکانی بەغدا، نزیکەی دوو ملیۆن کەسی کەم دەرامەت ژیان بەسەر دەبەن‌و بە دژایەتیکردن‌و بەرهەڵستی کردنی ئەمریکیەکانیش بەناوبانگە. بۆیە سیستەمی "دەستەبژاردن" لەوێ بووە هۆی دەربڕینی نارەزایی‌و دواتریش خۆێنڕشتنی لێ کەوتەوە. سەرەتا سوپاو RTI یارمەتیان دان لە هەڵبژاردنی نوێنەرەکان بۆ ئەوەی ئەنجوومەنی ناوچەکە پێك بێنن، بەلآم هەر زوو ئەنجوومەنی دامەزرێنراو لەلایەن هەزاران لە لایەنگرەکانی موقتەدا سەدرەوە بەدەر نران‌و لەبری ئەوە ئەنجوومەنی بەرهەڵستیکار پێك هێنرا. کە "نەعیم ئەلکەعبی" ئەندازیارو سەرۆکی ئەنجوومەنی بەرهەڵستیکار بە "Christian Scince Monitor"ی گوت: "کاتێك کە ئەمریکیەکان سەرپەرشتی ئەو پرۆسەیان دەکرد، تەنانەت نەماندەزانی کە سەرقاڵی

هەڵبژاردنی ئەنجومەنین. هەربۆیەش دانیشتوانی ناوچەی سەدر ئەوانیان رەت کردەوە و ئێمەیان هەڵبژارد."

هەروەها "حوسێن داین ئەلعەلاوی"، بەرپرسی لقی ناوچەی سەدری حیزبی دەعوە دەڵێت: "ئێمە بە تەواوەتی دژی ئەو ئەنجوومەنەی کەوا لەلایەن سەربازەکانی ئەمریکاوە پێك هێنرابوو وەستاینەوە. چونکە گەر خەڵکی مەدەنی بنێرن بۆ ئەوەی قسەمان لەگەڵدا بکەن ئەوا زیاتر ئامادەییم دەبێت بۆ گوێگرتن لێیان."

لە ١٦ تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣، سەربازەکانی سوپای ئەمریکی و پۆلیسی عێراقی لە رێگەی تانکەوە ئەنجوومەنەکەی کەعبیان ناچارکرد بالآخانەکەی ئەنجوومەن چۆڵ بکەن، ئینجا دووبارە ئەنجوومەنەکەی کە سەر بە خۆیان بوو پێك هێنایەوە. "سیهام حەتاب" پرۆفیسۆری ئەدەبی ئینگلیزی کە مامۆستای "جەیمس جۆیس" بووە لە زانکۆی بەغدا، هەروەها یەکێك بووە لەو ژمارە کەمەی ژنانی کەوا لە ئەنجوومەنەکەی یەکەمدا هەڵبژێردرابوون، گوتی: "کارمەندانی نووسینگەی سەدر ستەمیان لە خەڵکی دەکرد. ئێمەش نوێنەری شەرعی خەڵکین‌و یارمەتی‌و دەرمانمان بۆدابین دەکردن. کەچی لایەنگرەکانی سەدر ئەو شتەیان راگرت." ٣١١

لە ٩ تشرینی دووەمی ٢٠٠٣یشدا، کەعبی گەڕایەوە بالآخانەکە و داوای کرد رێی پێ بدەن بچێتە ناو بالآخانەکە، رازیش نەبوو بپشکنرێ، چونکە پێی وابوو ئەوە سووکایەتی پێکردنە، بۆیە کەوتە دەمەقاڵێ‌و شەڕ لەگەڵ سەربازە ئەمریکیەکانی کە تەقەیان لێکردو کوشتیان، ئەم رووداوەش ناڕەزایی‌و خۆپیشاندانی زۆرتری لێکەوتەوە.

ئەمریکیەکان ویستیان لە رێگەی دەرخستنی سادەیی‌و نیازپاکیان کاردانەوەکانی کارەساتەکەی هەڵبژاردنەکانی ناوچەی سەدر هێور بکەنەوە. کە مەیجەر "پۆڵ گاس" مامۆستا لە زانکۆی هیوستن بە " Christian

Scince Moitor" گوت: " خوا دەزانێت، ئێمە مەبەستمان تێکدان نەبووە، هەروەها دەشزانێت هەریەکێك لە ئێمە خاوەن ویژدانە، پێشم وایە عێراقیەکان دەرك بەو شتە دەکەن. ئێمە هەمووما‌ن ئارەزوو دەکەین یارمەتی عێراقیەکان بدەین لە دروست کردنو هێنانەکایەی هەلومەرجێکی باشتر لەوەی پێشتر تێیدا بوونە. هەر بۆیە هاتنە پێشی کۆسپو تەگەرە، تورەبوونو دلگرانی لێ دەکەوێتەوە. هەندێ جاریش وا دەردەکەوێت بارودۆخەکە لەسەرەخۆ دەڕوات." ٣١٢

## لەسەر بەرەوخوارەوە بۆ سەر بەرەوخوار

"عیماد جەنابی" کە عێراقیەکی ئەمریکیەو کارمەندی RTIـیە لە ناوچەی سەدر، دەڵێت: "مەبەست لەو ئەنجوومەنانە، گۆڕینی سیستەمی فرمان کردنە لەسەرەوە بۆ خوارەوە لە ولاتدا. کە پێشتر بۆ هەموو مەسەلەیەك فرمان لەسەرەوە دەهات، لەسەر بنەمای چەوساندنەوەی تاکی ئاسایی عێراقیش بوو، بۆ ئەوەی هاولاتی عێراقی ئەرکی نواندنی هاولاتی بگرێتە ئەستۆ، نەوەك کۆنترۆڵ کردنیان. بۆیە ئەوە ئەزموونکردنی دیموکراسیەتە، ئایا لێرە سەردەگرێ؟" ٣١٣

بەکارهێنانی سوپا بۆ سەپاندنی ئەو ئەنجوومەنانە راستیەك بوو کەوا بە تەواوەتی لەلایەن کاربەدەستەکانی RTI و دەسەلاتی داگیرکەر پشتگوێ خرابوو، چونکە رێ و شوێنی بەرەنگاربوونەوەی ناڕەزاییەکان و سەپاندنی ئەو جۆرە ئەنجوومەنانە هیچ جیاوازیەکی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ سەپاندنی هەڵسوکەوتەکانی رژێمی سەدام حوسێن، تەنیا لەوە نەبێت کەوا رژێمە دیکتاتۆریەکە بە شێوازی زۆر دڕندەتر رووبەڕووی بەرهەڵستکارەکان دەبۆوە.

لە ئاکامدا گەلێ لە ئەندامەکانی ئەو ئەنجوومەنانە لە ترسی هاتنە

پێشی کێشەو گرفت پۆستەکانی خۆیان جێهێشت. لە شوباتی ٢٠٠٤، "سیهام حەتاب" لە ڕێی سیستەمەکەی RTIـەوە لە ئەندامێتی ئەنجومەنی ناوچەی سەدر، بوو بە ئەندامی ئەنجومەنی ناوچەیەکی گەورەتر، دواتریش بوو بە ئەندامی ئەنجوومەنێکی گرنگتری شاری بەغدا. لە مانگی شوباتیشدا، ناوبراو بڕیاریدا کە بچێتە نێو ڕکابەرکێی بەدەست هێنانی کورسی ئەنجوومەنی پارێزگای بەغدا، بەرزترین شوێنگەیە لە چوارچێوەی ئەو سیستەمەی کە بۆ حکومەتە نێوخۆییە تازە دامەزرێنراوەکان دانراوە. "دوو شتی خراپمان لەبەردەم دایە و دەبێ یەکێکیان هەڵبژێرین. چەشتنی عێراقیەکان بۆ ئەو هەموو ناخۆشیانە لە سالآنی رابردوودا شتێکی قورسە، ئێستاش دەبێ ئازاری زیاتر بچێژن. خەڵکی هەست بە بێزاریەکی زۆر دەکەن چونکە هیچ جۆرە گۆڕانکاریەك لە ژیانیاندا نابینن." ٣١٤

راستە ئەو سیستەمە نوێیە رێگەی لە بەردەم عێراقیە ئاساییەکان کردەوە بۆ گەیشتن بە دەسەلآت. بۆ نموونە: "عەلی حەیدەری" کە ئەندازیارێکی میکانیکیە و خاوەنی کۆمپانیایێکی چاککردنەوەی ئامێری فێنك کەرەوەیە، ناوبراو لە چینە مام ناوەندیەکانەو دانیشتووی ناوچەی ئەلعەدلە، بە نیازی دەنگدان نەوەك بۆ خۆکاندیدکردن رووی کردە ئەنجوومەنە نێوخۆییەکەی گەڕەکەکەیان. بەلآم یەکێك لەوێ ناوی خستە نێو لیستی کاندید کراوەکان بۆ ئەنجوومەنی گەڕەکێکی ناوچەکە و دواتریش سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بۆیە هەستی بە بەرپرسیارێتی کرد لە بەرانبەر ئەو خەڵکەی کە دەنگیان پێداوە بەوەی دەبێ خزمەتیان بکات. لە دوای چەند هەفتەیەك لە هەڵبژاردنی، ناوبراو بە نوێنەری ناوچەی ئەلعەدل هەڵبژێردرا لە ئەنجوومەنی کەرتی گەڕەکی مەنسوور. کە لەوێشەوە بۆ ئەندامێتی ئەنجوومەنی شارەوانی بەغدا هەڵبژێردرا. لە تەمموزی ٢٠٠٣یشدا، بە یاریدەدەری سەرۆکی ئەنجوومەنی شارەوانی هەڵبژێردرا.

دواتریش لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٤، بە سەرۆکی سیستەمی سیاسی دامەزرێنرا، کە لە هەشتاو هەشت ئەندامی ئەنجوومەنەکان و زیاتر لە ٧٥٠ نوێنەریش پێك هاتبوو. ٣١٥

ئێستاش ناوبراو بە هۆی ئەو رۆڵە سیاسییەی کەوا لەلایەن ئەمریکیەکانەوە ئاراستە دەکرێت، ژیانی لە مەترسی دایە; چونکە زۆر لە هاوشانەکانی لە ئەندامانی ئەنجوومەنی گەڕەکەکان و شاریشدا، ببوونە ئامانجی ئەو هێرشانەی کە لەلایەن بەرهەڵستکار و خۆکوژەکانیشەوە ئەنجام دەدران.

لە ١٩ نیسانی ٢٠٠٤، دەسەلاتی داگیرکەر بڕیاری دا دەست بکات بە هەنگاوی دووەمی پرۆسەی سیاسی لە شاری بەغدا. کە چل و نۆ لە نوێنەرەکانی حکومەت و ئەنجوومەنە نێوخۆییەکان بانگێشت کران بۆ بالاخانەی شارەوانی کە بە توندی پارێزراو بوو بە مەبەستی هەڵبژاردنی سەرۆکی شارەوانی بەغدا. بۆیە سەیر نەبوو کاتێك کە ئامادەبووان بڕیاریان دا "عەلاو مەحمود ئەلتمەیمی" هەڵبژێرن کە کاتی خۆی لەسەردەمی رژێمی بەعسدا ولاتی جێهێشتبوو، ناوبراو ئەندازیار و ئەکادیمیەکی عێراقی بوو، لە دوای رووخانی رژێمی پێشوو لە میرنشنی یەکگرتووی عەرەبی گەڕایەوە. ٣١٦ کە لە کۆتاییدا لەلایەن پۆڵ برێمەرەوە بڕیاری کۆتایی هەڵبژاردنەکە پەسەند کرا.

## ئایا شتەکان توانای دابەش بوونیان هەیە؟

لەگەڵ کۆتایی هاتنی ساڵی یەکەمی کارکردنی لە عێراقدا، RTI لیستی خەرجیەکانی کە دەگەیشتە ١٥٦ ملیۆن دۆلار بۆ حکومەتی ئەمریکی بەرزکردەوە. لە ئاداری ٢٠٠٤، رێکخراوەکە گرێبەستیەکی تری پێ بەخشرا بۆ ماوەی ساڵێك بە بەهای ١٥٤ ملیۆن دۆلار. بۆیە پرسیاری ئەوە هاتە گۆڕێ،

بۆچی ڕێکخراوی ناوبراو سێ مانگ بەر لە هەموو بەڵێندەرەکانی تری کە مامەڵە لەگەڵ USAID دا دەکەن گرێبەستیەکەی پێ بەخشرا؟ بۆ وەڵامی ئەمە جۆنسۆن بە ڕۆژنامەیەکی لۆکاڵی لە نۆرس کارۆلاینای ڕاگەیاند: "پارچە پارچەکردنی خزمەتگوزاریەکان، ڕەنگبێ گێڕانەوەی دەسەلات بۆ عێراقیەکان دوابخات، بۆیە ئەگەری هاتنە پێشی گرفتو کێشەیەکی زۆر لە ئارادا دەبێت." ٣١٧

بەلام، ئایا تا ئێستا ئەو سیستەمەی RTI بۆ هێنانە دی دیموکراسیەت تا چەند سوودبەخش بووە؟ کەچی باسەکەش لەوەدایە ئایا هەر ئەو سیستەمە دەبێتە هۆکاری بەرپابوونی ناڕەزایی و پارچەبوون؟ لە چەند قسە و باسێکدا کە بەلگەی بۆ هێنراوەتەوە، هاتووە، زۆربەی عێراقیەکان لە پرۆسەکەی RTIدا بەشداریان نەکردووە. پەیامنێرێکی رادیۆی گشتی نیشتمانی دەگێڕێتەوە: لە شوباتی ٢٠٠٤ لە بەعقوبە کە دەکەوێتە باکووری بەغدا بە دووری یەك کات ژمێر ڕێگا بە ئۆتۆمبێل، تەنیا دوو لەسەر سەدی دانیشتوانی ئەو شارە کە ژمارەیان دەگاتە دە هەزار کەس، بڕیاریان دا بەشداری بکەن لە هەلبژاردنەکانی کەوا لەلایەن "عومەر عەبود"ـەوە نەخشەی بۆ کێشرابوو، کە ناوبراو کەنەدیەکی بەڕەگەز سووریە و کارمەندی ڕێکخراوەکەیە. ٣١٨ "هاربەرت دۆسێنا" لە ڕێکخراوێکی ناحکومی کە لە هۆنگ کۆنگە و کارەکانی لە بەشی باکووری جیهانە، پێی گوتم کەوا، لەبەرئەوەی سیستەمەکە لەلایەن RTIـیەوە ئامادەنەکرابوو ئەوا خەوشێکی زۆری تێ دەکەوێت:

ئەو ئەنجوومەنانەی من چاودێریم دەکردن، پێم وایە بە هیچ شێوەیەك توانای هەلبژاردنیان نەبوو. ئەوان تەنیا تۆڕێکی فراوانیان پێك هێنابوو، هەر کەسێکیش کە ئارەزووی هاوکاری کردنیانی هەبووایە، ئەوا مامەڵەیان لەگەڵ دەکرد. بۆیە بەلای منەوە ئەوە

بریتیە لە پرۆسەی هەڵبژاردنی خۆیان لەلایەن خۆیانەوە، کە بووە هۆی بەلاوەنانی خەڵکی ناوچەی سەدر و میلیشیاکانیش. هیچ کەسێکیش نکوڵی لەوە ناکات، کە لە کۆتاییدا بڕیاری ئەو دەستەبژارکردنە بۆ RTI دەگەڕێتەوە. وابزانم تا ئێستاش سەرقاڵی کۆکردنەوەی زانیارین لەسەر خەڵکی لە چوارچێوەی ئەو سیستەمەدا، بۆیە وای دەبینم، دواتر هەر خۆیان خەڵکەکە دەستنیشان دەکەن و هەڵیان دەبژێرن، بۆئەوەی لە پۆستە گرنگەکان دایان بنێن. ٣١٩

کارمەندەکانی RTI لە گەڕانیان دا بۆ ئەو سەرکردە "شەرعیانە"، بە هەموو ناوچەکانی وڵاتدا دەگەڕان بۆ سەرپەرشتیکردنی ئەو کۆبوونەوانەی کە ئەنجوومەنەکان ئەنجامیان دەدان و هەروەها ڕێکخستنی وۆرک شۆپی تایبەت بە ڕاهێنان لەسەر دیموکراسیەت، بەوەی زۆر هانی هاوکارە عێراقیەکانیان دەدا خەڵکی ئەو دەوروبەرە قەناعەت پێ بکەن بۆ ئەوەی متمانە بە هێزەکانی داگیرکەر بکەن و پشتگیری پلانەکانیان بکەن. کە دواتریش لە بەرژەوەندی خۆیاندا دەبێت. لە یەکێك لەو وۆرك شوپانە، بەشداربووێك پرسیارێکی کرد: "هەڵبژاردنەکان چ سوودێکیان هەیە؟ چونکە هەمووومان دەزانین لە کۆتاییدا ئەمریکیەکان خۆیان سەرکردەکانمان بۆ دادەنێن." ستافی RTI لە وەڵامدا گوتیان: "تۆ پێویستە قسە لەگەڵ خەڵکی گەڕەکەکەتدا بکەی و پێشیان بڵێیت ئەو شتە ڕاست نیە. چونکە هەڵبژاردنەکانی داهاتوو پاك و دیموکراسیانە و ئازادانەش بەڕێوەدەچن، بۆیە دەبێ بە دراوسێیەکانت بڵێی کە سەبر بگرن. چونکە بەرلەوە بە درێژایی سی‌و پێنج ساڵی ڕابردوو سەبرتان گرتووە. بۆیە ساڵ‌و نیوێکی تریش هیچ نابێت، بە تایبەتیش بارودۆخەکەی ئێستا زۆر نالەبارە." ٣٢٠

تەنانەت پۆل برێمەریش بێزاری خۆی لەمەڕ ئەو هەڵبژاردنانە دەردەبڕی، کە دەڵێت: "من لە دژی هەڵبژاردنەکان نیم، بەڵام دەمەوێ بە

شــێوەیەك ئــەنجام بــدرێن، دڵەڕاوکێیــەکانمان رەچــاو بگیرێــن... ئــەو هەڵبژاردنانــەی کــە زوو ئــەنجام دەدرێــن رەنگبــێ ئاکــامی خراپیــان لێ بکەوێتــەوە... لــە هەلومــەرجێکی ئــاوادا، گــەر بێتــو دەســت بکــەیت بــە ئەنجامــدانی هەڵبژاردنــەکان، ئــەوا ئەنجامەکــەی لــە بەرژەوەنــدی کەســانێك دەشکێتەوە کــە خــوازراو نــین." ٣٢١ کاربەدەســتێکی تــری بــەرزی دەســەڵاتی هاوپەیمانەکان زیاتر لە مەبەستەکە نزیــك بــۆوە کاتێــك پرســیاری ئــەوەی لێ کــرا، بۆچــی هەڵبژاردنــەکان لــەو زووانــە ئــەنجام نــادرێن؟ لــە وەڵامــدا گــوتی: "چــونکە کــاتێکی زۆر لەبــەردەم میانڕەوەکانــدا نیــە بــۆ ئــەوەی خۆیــان ئامادەبکەنو خۆیان رێك بخەنەوە." ٣٢٢

## خەرجیەکی زۆر و کارێکی کەم

رادەربــڕین یــاخود حــوکم دان لەســەر بنــەمای راگەیاندنــەکانی رێکخراوەکــە، دیــدێکی گەشــبینانەتر دەبەخــشێت لــەوەی کــە لــە راســتیدا بەجێگەێنراوە. لە یەکێك لە راگەیاندنەکانی RTIدا هاتووە: "بــە درێــژایی ســاڵی یەکــەم، ژمــارەی کارمەنــدی تیمــەکانی ســەر بــە رێکخراوەکــەمان لــە عێراقدا، خۆی لە ٢٠٠٠ عێراقی و ٢٠٠ شــارەزای نێودەوڵەتی دەدات لــە بــواری گەشــەپێداندا، کــە دابەشــی ســەر هــەژدە پارێزگــا بوونــە، لــە پێنــاو دەستنیشانکردنی پێداویستیە گرنگەکانی نــاوخۆیی و زێدەکردنی هەلــەکانی گەیــشتن بــە خزمەتگوزاریــە بنەڕەتیــەکانی وەك تەندروســتی تــا دەگاتــە پێکهێنانو مەشق پێکردنی ئەنجوومەنە نێوخۆییەکانیش، کار دەکەن." ٣٢٣

بەڵام سێ لە کارمەندەکانی RTI کە پێشتر قسەم لەگەڵدا کردبوون و لە پرۆژەکەشدا کاریان دەکــرد، پەرۆشــیەکی کــەمتریان هــەبوو لــە باســکردنی سەرکەوتنەکانی رێکخراوەکە. رەخنەی ئەوان بۆ رێکخراوەکە، پەیوەست بــوو بــە بــەکارهێنانی لەڕاددەبــەدەری ئــەو رێکخــراوە بــۆ دەرامــەتو هــەروەها

گرێدانی ژمارەیەکی زۆری کۆبوونەوەو دانیشتن، لەبری ئەوەی کاربکەن بۆ دابینکردنی یارمەتیو پشتگیری بۆ رێکخراوو ئەنجوومەنە نێوخۆییەکان.

"جابر ئەلگەڕاوی" کەسێکی شیعە مەزهەبەو خەڵکی شاری دیوانیەیە، لە ساڵی ۱۹۹۱ دوای ئەوەی بەشداری لەو راپەڕینەی خوارووی عێراقدا کردبوو، کە لەلایەن جۆرج بۆشی باوك بانگێشتی بۆ کرابوو، دواتریش لەسەر دەستی رژێمەکەی سەدام حوسێن دامرکێنرایەوە، ولآتی جێهێشتو لە ویلایەتی ئەریزۆنای ولآتە یەکگرتووەکان نیشتەجێ بوو. ناوبراو کە لایەنگیری داگیرکردنەکەی دەکرد، لە کانوونی یەکەمی ۲۰۰۳، دوای ئەوەی دەستی لە کارەکەی کێشایەوە (کە بەڕێوەبەری جێبەجێکاری سەنتەری پەنابەرەکانی فینۆکس بوو لە ئەریزۆنا) پۆستێکی لە RTI بە دەست هێنا. دەسبەجێ بەرەو شاری عەمارە بەڕێ کەوت کە پایتەختی پارێزگای میسانە لە باشووری رۆژهەڵاتی عێراق، بەمەبەستی یارمەتی دانی عێراقیەکان لە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنێکی نێوخۆیی. لەسەرەتادا ناوبراو دەیگوت: "نزیکەی ٪۹۵ خەڵکی باشوور پشتگیریان دەکردین، بەڵآم ئێستا ژمارەیەکی کەمی خەڵکی پشتگیری کارن، کە تەنانەت جورئەت ناکەن بە ئاشکرا دەریشی بڕن." ناوبراو پێی وایە یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی کەمبوونەوەی پشتیوانیکردنی خەڵکەکە بۆ رێکخراوەکە، کەمو کوڕی بووە لە یارمەتیدانو پاڵپشتیکردنێکی واقیعیانەو بینراو بۆ کۆمەڵگە نێوخۆییەکان.

ئەلگەڕاوی دەیگوت، تەنیا پرۆژە کە توانیبێتی تەواوی بکات، پرۆژەی دروستکردنی رێکخراوەکانی ئافرەتان بووە، کە رێکخراوەکەی ئەو نەوەد هەزار دۆلاری بۆ تەرخان کردبوو. دەڵێت: "ئێمە پارەیەکی زۆر لەوە زیاتر لە خۆشگوزەرانی کارمەندەکانمان خەرج کردووە، کاتێك کە تەلەفزیۆن و سەتەلایتمان بۆ دامەزراندن. زۆر لە کارمەندە بیانیەکان مووچەکانیان زیاتر بوو لەو پارەیەی کەوا رێکخراوەکە لە ساڵێکدا خەرجی دەکرد بە دوو تا سێ

ئەوەندە. رەنگبێ رێژەی ٩٠٪ پارەی رێکخراوەکە بۆ کارمەندەکان چووبێت، لە کاتێکدا برێکی زۆر کەم بۆ پرۆژەکان خەرج دەکرا." ٣٢٤

ناوبراو لە درێژەی قسەکانیدا باسی ئەوە دەکات، کارمەندە بیانیەکانی RTI زۆربەی کاتەکانیان لە نێو کۆمپاوەندە پارێزراوەکان بەسەر دەبرد، کە دەیگوت: "هەندێك لە هاوکارەکانم هەرگیز لە سنووری کۆمپاوەندەکە دەرنەدەچوون، کە زۆربەی کاتەکانیان بە پڕکردنەوەی فۆرم بۆ حکومەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەسەر دەبرد، لەوە دەچوو تەنیا ئامانجی ئێمە بریتی بووبێت لە رازی کردنی لایەنە بەخشەرەکان (پارەدەرەکان)، نەوەك یارمەتی دانی خەڵکی عێراق. ئەوانەشی کە دەچوونە دەرەوە، دەیانگوت بێ پاسەوانە ئوستورالیەکانمان ناتوانین بۆ هیچ شوێنێك بچین، ئەوەش وا لە خەڵکی دەکات لێمان بترسن. خەڵکێکی زۆریش پێیان دەگوتین ئێوە سەر بە CIAین. چونکە بۆشمان نەبوو قسە بۆ میدیاکان بکەین، بۆیە هیچ رێگا چارەیەك لەبەردەممان نەبوو بۆ لابردنی ئەو قسەوقسەڵۆکانە لە مێشکی خەڵکیدا."

وەکو چۆن ناوبراو ئاماژەی پێ دەکات، بەرپرسەکانی رێکخراوەکە، جگە لەوەی کە لە هۆتێلی شیراتۆن لە کوێت مابوونەوە، هەموو پێداویستەکانیشیان لە خۆراك بگرە تا تەلەفزیۆنیشیان هەر لە کوێت دەکڕی نەوەك لە عێراق. کە دەیگوت: "ئێمە هیچ پارەیەکمان نەدایە رێکخراوەکان لە عێراق، ئەمەش وای لە خەڵکی کردبوو بڵێن پێویستیان بە هێنانەوەی سەدام هەیە بۆ ئەوەی پارەی عێراق لە کوێت بسەنێتەوە."

لەسەرەتای نیسانی ٢٠٠٤، ئەلگەراوی و هەندێك لە کارمەندە بیانیەکانیش، ئاگادارکرانەوە، بەوەی دەبێ عێراق جێبهێڵن، ئەویش بە هۆی زیادبوونی رادەی توندو تیژی. دواتریش لە کۆتایی ئایاردا، ناوبراو هەستی بەوە کرد ئەو برە کارە کەمانەی ئەنجامی داون، لەوانەیە تەواو نەکرێن.

چونکە ئەندامی یەکێك لە ڕێکخراوەکانی ئافرەتان کە ناوبراو یارمەتی دامەزراندنی دابوو بە ناوی "دکتۆرە کیفایە حوسێن" لە بەردەم نووسینگەکەی خۆی تەقەی لێکراوە و کوژراوە. کە دەڵێت: "کاتێك کە ئەو دکتۆرەیە کوژرا، ئیتر RTI پێدانی ئەو پارەیەی ڕاگرت کە بەڵێنی دابوو بیدات، بۆیە ئێستا ئەو ژنانەی لە ڕێکخراوەکەدا کاردەکەن، هەموویان خۆبەخشن."

"جێری کۆهەیدا" سەرۆکی پێشووی شارەوانی ئاواك ریدج لە ویلایەتی تێنیسی، کە دیسانەوە ئەویش لە کۆتاییەکانی ٢٠٠٣ دەستی لە کارەکەی خۆی کێشابۆوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ RTIدا کاربکات. ئەو شوێنی کارکردنی لە شاری کەربەلا بوو کە ژمارەی دانیشتوانی دەگەیشتە پێنج سەد هەزار کەس و دەکەوێتە باشووری بەغدا بە دووری ٩٦,٥ کیلۆمەتر. بەهەمان شێوە ئەویش دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کەوا بڕی پارەی تەرخان کراو بۆ پرۆژەو هەوڵەکانی کە پێشکەشی ڕێکخراوەکە دەکران زۆر کەمبوون.

ناوبراو بەرپرسیارێتی دیاریکردنی بڕی پارەی خەرجکراو لە شارەکانی باشووری ناوەڕاستی کەوتبووە ئەستۆ (کە ژمارەیان چوار پارێزگا بوو). بە پێی لێکدانەوەکانی ئەو، RTI پشتگیری دارایی بۆ هەشت تا دە پرۆژە دابین کردووە، بە ڕێژەی ٥٠٠٠ تا ١٥٠٠٠ دۆلار بۆ هەر پرۆژەیەك. گوتی: "ئەو بڕە پارانە زۆر کەمبوون، لە ڕاستیدا ئێمە هیچ شتێکمان بۆ ڕێکخراوە لۆکاڵیەکان نەکرد." ٣٢٥

بەلام"پاتریك گیبۆنس" وتەبێژی RTI لە بەغدا، هاوڕا نیە لەگەڵ ئەلگەڕاوی و کوهەیدا. ئەو پێی وایە پشتگیری کردنی دارایی ڕێکخراوە لۆکاڵیەکان، هۆکار بووە بۆ سەرکەوتنی پرۆگرامەکە. کە دەڵێت: "بودجەی یەکەمین کە بۆ پرۆگرامی حکومەتە نێوخۆییەکان Local Govenance Program (LGP) دەستنیشان کرابوو دەگەیشتە ١٠

ملیۆن دۆلاری تەرخان کراو بۆ پشتگیریکردنی پرۆژە نێوخۆییەکان. بۆیە لەبەر سەرکەوتنی پرۆگرامەکەو دوای بەدەستهێنانی رەزامەندی USAID بودجەیەکی تر بۆ پرۆگرامی ناوبراو تەرخان کرایەوە. تا ئێستاش رەزامەندی لەسەر کۆمەڵێك پرۆژە کراوەو بەهای پارەی داواکراوی ئەو پرۆژانەش دەگاتە ١٥ ملیۆن دۆلار، زۆربەشیان یان لە تەواو بوون دان وەیان تەواوکراون." ٣٢٦

لێرەوە گەر لێکدانەوەیەکی سادە بۆ ژمارەکان ئەنجام بدەین، ١٥ ملیۆن یەکسانە بە کەمتر لە رێژەی ١٥٪ کۆی پارەی کۆنتراکتەکە، کە بریتیە لە ١٥٤ ملیۆن دۆلار دراوەتە RTI بۆ یەك ساڵ. بەمەش دەردەکەوێت، ٩٠٪ پارەکە لە ستافی رێکخراوەکەو تێچوونەکانی کارگێڕی خەرج کراوە.

لەوەش زیاتر "کوهەیدا" دەیگوت RTI پلانێکی راستەقینە و تۆکمەی نیە بۆ گەیاندنی چەمکی دیموکراسیەت، کە دەپرسێتو دەڵێت: "ئێمە تەنانەت لە ئەمریکا ئەو توانایەمان نیە کە هانی خەڵکی بدەین تاوەکو بێن بۆ دەنگدان، ئەی چۆن لە عێراق ئەو شتەمان پێ دەکرێت؟"

> بەلانی کەمەوە پێویستیمان بە دارشتنی ستراتیژیەتو بیرکردنەوە هەبوو، بەلام هیچ بەلگەیەك نابینم کە شتێکی وامان کردبێت.... هیچ جۆرە پلانێك بۆ دوای شەڕ لە ئارادا نەبووە.... لە بنەڕەتدا شتەکان تەنیا بە پێی حەزو ئارەزوو کراون. تەنانەت نەخشەو پلانی خراپیشمان نەبووە. من تەواو لە حکومەتەکەمو ئەو درۆیانەشی کە دەیکات بێزارم. بۆیە وادەزانم بە ئەنقەست بووە. ٣٢٧

لە وەلامی ئەمەدا، گیبۆنس پێی گوتم: "هەلومەرجەکە بۆ ئەو کەسانەی لە ناو مەسەلەکان دان دژوارە. تا ئێستا هەوڵەکانمان بە پێی پێوەرەکان جێی خۆیان گرتووە، بۆیە سەیری دوورتر دەکەین تاکو بتوانین بەردەوام بین لە: چاکترکردنی خزمەتگوزاری پێشکەش کراو لەلایەن

حکومەتە نێوخۆییەکانەوە، دڵنیابوون لەوەی ئەو ئەنجومەنانە بە ڕاستی نوێنەرایەتی خەڵکی دەکەن، باشترکردنی رۆڵی حکومەتە نێوخۆییەکان لە بەهێزکردنی دەسەلاتو سەروەری عێراق، هەروەها زیادکردنی بەشداری خەڵکی لە پرۆسە سیاسیەکان لەسەر ئاستی هەرێمەکان و وڵاتەکەش. جا ئایا ئەوانە شتی ئاسانن؟ بێگومان نەخێر."

ئەو کارمەندە پێشووانەشی کەوا قسەم لەگەڵدا کردبوون، هەر هەموویان رەخنەیان لە RTI نەدەگرت. "جیم بیولیو" پاریدەدەری پێشووی وەزیری کاروباری مەدەنی لە هەرێمی مانیتۆبا لە کەنەدا، کە لە ئەیلولی ۲۰۰۳ دەست بەکاربووە لە RTI بۆ ئەوەی یارمەتی پارێزگاری نەجەف بدات، کە بەرزترین پۆستی سیاسیە لە شارەکەدا، دەڵێت: ئەو کارەی ئێستای زۆر دژوارترە لەوەی کە پێشتر لە پرۆژەیەکی کۆمپانیای بەکتلدا دەیکرد بە پێی گرێبەستیەکی لەگەڵ سوپادا بۆ یارمەتیدانی بوژاندنەوە و پارێزگاری کردن لە دەزگا ژێرخانیەکان لە عێراقدا: "RTI دەبوایە مامەڵە لەگەڵ خەڵکی ئاساییدا بکات، ئەوانەی تەنانەت لە چەمکە بنەڕەتیەکانی دیموکراسیەتیش تێناگەن، بۆیە پێویستیمان بەو کارمەندە عێراقیانە هەیە کە لەدەرەوە ژیاون تا ئەو خەڵکە فێر بکەن."

ناوبراو پێی وایە کێشەکە لە خودی دەسەلاتی داگیرکەرە، بەوەی هیچ دەسەلات (جگە لەو دەسەلاتەی کە لە چوارچێوەی نووسینگەکانیان هەیانە)و بودجەو تەنانەت کارمەندیشیان نەدابووە ئەنجوومەنەکانی پارێزگاکان و خودی پارێزگارەکانیش. بۆیە تەنیا لە رووکەش هەبوون بەلام بێ ناوەڕۆک. سەرەڕای ئەوەش لە هەوڵی ئەنجامدانی کارەکان دان، بەلام چۆن گەر بێتوو هیچ بودجەیەکیان لەژێر دەست نەبێتو هیچ دەسەلاتێکیشیان پێ نەدرێت؟ لەوەلامدا گیبۆنس پێ وایە ئەو ئەنجوومەنانە جۆرێك لە دەسەلاتیان هەیە، کاتێك کە دەڵێت:

ئەو قسانە راست نین کە باس لە رۆڵی ئەنجوومەنەکان دەکەن، بەوەی تەنیا رۆڵێکی راوێژکاریان پێدراوە لە ژێر دەسەڵاتی داگیرکەر. چونکە ئەو ئەنجوومەنانە لەسەرتاسەری ولاّت نەخشەو پلان دادەڕێژن بۆ پەرەپێدانو ئەنجامدانی پرۆژە گرنگو پێویستەکان بۆ کۆمەڵگا. لەهەمان کاتیشدا هەر پارێزگایەك بودجەیەکی دوو ملیۆن دۆلاری بۆ تەرخان کراوە تەنیا بۆ ئەنجامدانی ئەو پرۆژانەی کە ئەنجوومەنەکە پەسەندیان دەکەن و هەر خۆشیان سەرپەرشتی جێبەجێکردنیان دەکەن. بێگومان سیستەمەکە بێ کەمو کوڕی نیە، بەلاّم تا ئێستا ئەنجوومەنەکان رۆڵی گرنگیان بینیوە لە چارەسەرکردنی کێشەکان و دانانی سەرۆك شارەوانی پارێزگارەکانیشو ئەنجامدانی پرۆژەکانیش. ٣٢٨

بەلاّم ئەو دڵنیاکردنەوانەی گیبۆنس بە رادەیەکی کەم دڵەڕاوکێو نیگەرانیەکان کەم دەکاتەوە. چونکە لە بەهاری ٢٠٠٤، هەرسێ کارمەندەکە لە ئاکامی کەمی کارە ئەنجام دراوەکان لەلایەن رێکخراوەکەوە بێ ئومێدی باڵی بەسەر داگرتنو دەستیان لە کارەکەیان کێشایەوەو گەڕانەوە بۆ ئەمریکا. "جیم بیولیو" بەو جۆرە باسی هۆکارەکانی کەوا لەپشت دەست لەکارکێشانەوەکەی بوون، دەکات: "من دەستم لەکارەکەم کێشایەوە چونکە بۆم دەرکەوت ناتوانین ئەو ئەرکە بەجێبگەیەنین کە بە هۆیەوە لە رێکخراوەکە دامەزراین. بە کورتی هیچ ئاماژە و بەڵگەیەك نەبوو لەسەر ئەوەی ئەمریکا چاوڕوونیو پلانی هەبووبێت یان هەیەتی بۆ ئەوەی دەیەوێت چی بکات." بەهەمان شێوە "ئەلگەڕاو"یش بێ ئومێدبوو لە کارکردنی لەگەڵ RTIدا، کە دەڵێت: "رێکخراوەکە چۆتە عێراق بۆ بەدەست هێنانی قازانج، نەوەك یارمەتی دانی خەڵکی."

گیبۆنس دەڵێت، ئەو سیانەمان تەعبیر لە بۆ چوونی ستافی RTI

**ناکەین:**

**خەڵکێکی زۆر هاتوونەتە عێراق بۆ بەرژەوەندی تاکە کەسی خۆیان.... هەندێکیان مەبەستەکەیان بەباشی پێکا، هەندێکیشیان وورەیان لەدەستدا، ئەویش لەبەرئاڵۆزی بارودۆخەکەو مەترسیو بێ هیوا بوون، تەنیا لەبەرئەوەی تەنانەت پەیوەندیە بنەڕەتیەکانی نێوان ئەو تیمانەی کە لەسەر یەك پرۆژەش کاریان دەکرد بەبێ ڕێگەدانی پێشوەختە ئەنجام نەدەدران، کە دەبوایە ئەو پەیوەندی کردنانە لە خاڵی دەست پێکردنیەوە لە لایەن هەر یەك لە بەڵێندەرەکان و خودی CPAیەوە بونیاد نرایە. لەو هەلومەرجەدا، هەندێکیان لەبەر بێ ئومێدبوون زوتر لەو وادەیەی کە خۆیان دایان نابوو کارەکانیان جێهێشت. هەندێکی تریش ماوەی کارکردنەکەیان درێژتر کردەوە، چونکە هەستیان دەکرد کاری زۆر گرنگو بایەخداریان لە ئەستۆ دایەو پێویستە بە ئەنجامیان بگەیێنن. ٣٢٩**

## پوختە

**کارە دیار و ئەنجام دراوەکانی SAIC ئاماژەن بۆ ئەوەی بەلانی کەمەوە کۆمپانیاکە خۆی داوەتە بەر کارێك کە لە توانای دا نیە. بەڵام دیسانەوە گەر زۆربەی کارەکانی کۆمپانیاکە نهێنی بن، ئەوا گومان لەوەدا نیە ئەو کارە نهێنیانە هەرەسیان هێناوە بە هەمان شێوازی هەرەسهێنانی پرۆژە ئاشکراکانی! ڕەنگبێ SAIC کۆمپانیایێکی ئاوا قەبە نەبێت وەك چۆن گرێبەستیەکانی لە بواری کارەکانی سیخوریدا دەری دەخەن، بەڵکو وەك هەر بەڵێندەرێکی تری سوپا لەسەر حیسابی ئەو گرێبەستیانەی کەوا دڵنیان لەوەی پێداچوونەوەیان بەسەردا ناکرێت، فراوان دەبن. ڕەنگبێ ناودارترین سیستەمەکانی هەوالگریو گوێگرتن کە لەلایەن کۆمپانیاکەوە**

دامـەزرێنرابوو، هەرەسـی هێنـا. هـەر بۆیـەش دەزگـا هەواڵگریـەکان لـە دەستنیـشانکردنی هەڕەشـەکانی سـەر وڵاتـە یـەکگرتووەکان سـەرکەوتوو نەبوون.

بێگومان زۆر لە شارەزاو پسپۆڕەکانی سوپاو دەزگاکانی هەواڵگری پێیان وابـوو، پـشت بەسـتنی لەڕادەبـەدەر بـە کۆمپیوتـەرو تەکنـەلۆژیای مانگـە دەسـتکردەکان رێگـر بوونـە لەبـەردەم کارەکـانو وەرگرتنـی زانیـاری بەسـوودیش، کـە بـەلای ئەوانـەوە ئـەو جـۆرە زانیاریانـە تـەنیا لـە رێگـەی مرۆڤـەوە بەدەسـت دەهێنرێـت. لـە ئـەیلولی ٢٠٠١، بڵاوکـراوەی Jane`s Defense Weekly لێدوانێکی بڵاوکردەوە کە تیایدا هاتبوو: "تـەرخان کردنـی سەرچـاوەیەکی سـنووردارو کـەمی توانـای مرۆیـی بـۆ کارەکـانی هـەواڵگری لەلایـەن ئـەمریکاوە لـە مـاوەی دە سـاڵی رابـردوودا، دەکـرێ وەکو فاکتەرێك سەیر بکرێت بۆ هەرەسهێنانی سیـستەمی ئـەمنیو هـەواڵگری. لـە کاتێکدا دەزگاکانی تەکنەلۆژیای نیشتمانی، بەردەوام دەرامەتێکی نـەبڕاوەیان بـۆ دابـین دەکـرا بـە مەبەسـتی دامەزرانـدنی مـانگی دەسـتکردی تایبـەت بـە چـاودێریکردن، گەشـتی ئاسمـانی هـەواڵگریو جۆرەکـانی تـری تەکنـەلۆژیای پەیوست بە گوێگرتنیش، بۆیە توانا مرۆییەکان لـە بـواری هـەواڵگری بـەرەو پووکانەوە دەچوون." ٣٣٠

ئایـا پێویـستە ئـەرکی هەڵـسوڕاندنی میـدیاکان بدەینـە دەسـت کۆمپانیاکـانی کـەوا (پرۆسـە سـایکۆلۆجیەکان- psy-ops) ئـەنجام دەدەن؟ هەرچۆنێك بێت بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە زیاتر بیرمان بۆ ئەوە دەچێت کـەوا بەڵێندەرە خاوەن ئەزموونەکان بەباشتر دەزانـرێن بـۆ ئەنجامـدانی گرێبەنـد لەگەڵیاندا، نەوەك کۆمپانیاکانی کە بـێ ئـەزمونن. ئـەی سـەبارەت بـەو تـۆڕە میدیایانە چی بڵێین کە سروشتی کارەکانیـان بەنـدە بـە پروپاگەنـدە کـردن، وەك رادیۆی دەنگی ئەمریکا- کە هیچ نەبێت گوێگری خۆیان هەیە. هەروەها

دەزگای ڕاگەیاندنی تریش هەن کە لەلایەن حکومەتەوە پاڵپشتیان دەکرێت، وەك BBC و دەزگای تریش، کە تا ڕاددەیەك سەربەخۆن و شانازیش بەوە دەکەن، خاوەن گوێگرو جەماوەرێکی زۆرن.

هەر لە چوارچێوەی هەمان مەسەلەدا، ئایا پێویستە ئەرکی پلان دانان بۆ حکومەتێکی تەواو تازە پێکهێنراو یان نەخشەکێشان بۆ سیستەمی دیموکراسی بخەینە ئەستۆی کۆمپانیا تایبەتەکان؟ ئەو کارمەندانەی IRDC کە چاوم پێیان کەوتبوو، زانیاریەکی ئەوتۆیان نەبوو لەسەر SAIC، هەربۆیەش نابێ گلەییان لێ بکەین چونکە بێ ئاگان لە پێشینە سیخوریەکەی SAICـیەوە. مشتو مڕێکی زۆر هەبوو لەبارەی گرێبەستیەکەی SAIC کە لە ڕواڵەت مەبەست لێوەی پاراستنی تاکەکان بووە، بەلاَم لە ڕێی ئەو ڕۆڵەی کەوا پێنتاگۆن گێڕای بۆ دامەزراندنی IRDC، بۆمان دەرکەوت ئەو گرێبەستیە مەبەستێکی تریشی لە دواوە بووە، ئەویش زیاتر بەهێزکردن و پاڵپشتی کردنی ئامانجەکانی پێنتاگۆن لەسەر حیسابی ئامانج و مەبەستەکانی وەزارەتی دەرەوە. ئەوەش گەمەیەکی مەترسیدارو لە هەمان کاتیشدا گەمژەییە، کە دەزگاکان لەگەڵ یەکتری دەیکەن، ئەوە لە کاتێکدا دوارۆژی وڵاتەکەو پەرەپێدانی دیموکراسیەتیش لە مەترسی دایە.

دەسەلاَتی داگیرکەر چاڵ بۆ خۆی هەڵدەکەنێت گەر بێتوو دیموکراسیەتێکی ڕاستەقینە نێتە دی و بە پێی حەزو ئارەزووی خۆشی بە بیانووی ڕێگە خۆش کردن لە بەردەم بردنەوەی "میانڕەوەکان" یان "لێرازیبووەکان" دەست لە سیستەمەکە وەربدات و دایبڕێژێتەوە. ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی عێراقیەکان چیتر باوەڕ بە ئەمریکا نەکەن لەوەی ڕێگەیان پێ دەدات بۆ خۆیان ئەوەی دەیانەوێت هەڵی بژێرن، مەگەر تەنیا ئەوانە نەبێت کە سوود لەو سیستەمەی ئەمریکاوە دەبینن. هەر ئەوەش بوو

کە بووە هۆی بە هێزبوونی کەسێکی هەڵگەڕاوەی وەك موقتەدا سەدر، کاتێك دژی هەموو ئەو شتانە وەستایەوە کە ئەمریکا لەسەرەتاوە دەیویست بیکات. ئەستەمیشە بتوانین بەرپرسیارێتی هەرەسهێنانەکە بە تەنیا بخەینە ئەستۆی RTI یان SAIC. لە پاش هەموو شتێکیش حکومەتو سوپای ئەمریکی لە بنچینەوە سیستەمی "دەستەبژار کردنەکە"ـەیان پەسەند کرد. بەڵێندەرەکانیش سوودمەندێکی گەورەی پرۆسەکە بوون، بەڵام ناکرێ بە تەواوەتی خۆیان لەو گلەییو رەخنانە بدزنەوە کە لە ئەزموونی سەرنەکەوتووی هێنانی دیموکراسیەت بۆ عێراق لەلایەن ئەمریکاوە، دەگیرێت.

## دوا وتە

لە رۆژی دوو شەمەی رێکەوتی ۲۸ حوزەیرانی ۲۰۰٤، بە ماوەیەکی زۆر بەر لەوەی رۆژ لە پۆتۆماك (*پۆتۆماك Potomac- زاراوەیەکە بەکار دێت بۆ وەسفکردنی ئەو شارانەی کە پایەختی ولاتێکن یان هەرێمێکن، لێرەش نووسەر مەبەستی شاری واشنتۆنە پایتەختی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەورەها ناوی رووبارێکیشە کە بە هەرێمی کۆلۆمبیای ئەمریکیدا دەڕوات، ئەو هەرێمەی شاری واشنتۆنی پایتەختی لێیە: وەرگێڕ*) هەڵبێت، لەو کاتەشی کە بێژەری کەناڵە تەلەفزیۆنەکەی شەوانو خەڵکیش لەخەودا بوون، لە دیوەکەی تری جیهانو لەبەردەم ژمارەیەکی کەمی میوان کە بە تایبەتی بۆ بنکەی سەرەکی هێزەکانی داگیرکەر بانگێشت کرابوون، پۆڵ برێمەر بەڵگەنامەیەکی دەرکرد کە تایبەت بوو بە گواستنەوەی دەسەلات بۆ (شێخ غازی یاوەر و ئەیاد عەلاوی)، ئەو دوو کەسەی دەستنیشان کران بۆ گرتنی جڵەوی دەسەلات لە عێراق. کاتژمێرێك دوای ئەوە، ناوبراو سواری فڕۆکەیەکی هەلیکۆبتەر بوو، بە یەك کاتژمێریش بەرلە بەرکەوتنی یەکەم

تیشکی رۆژ بۆ ئاسمانی پایتەختی ولاتە یەکگرتووەکان، ناوبراو لە رێگەی فڕۆکەیەکی سەربازی ئەمریکیەوە لە رێی گەڕانەوەی بوو بۆ ئەمریکا. ئەنجامدانی ئەو رێورەسمە نهێنیو لەناکاوەش رێگەی بۆ برێمەر خۆشکرد کە لە وادەیەکی رەسمیو لە رێکەوتی ٣٠ حوزەیرانی ٢٠٠٤، نانی نێوەڕۆ لە کۆشکی سپیدا بخوات.

لە کاتی رۆیشتنی برێمەردا، دەزگا راگەیاندنە داوەت کراوەکان بە وێنەیەکی قێزەوەنەوە دەرچوون کە بەم جۆرە وەسفی دەکەن: دوو لە چەکدارەکانی بلاکۆتەر لە دواوەی دەڕۆیشتنو رووی تفەنگەکانیشیان بە هەڕەشە ئامێزەوە ئاڕاستەی تاقمی وێنەگرەکان کردبوو، تا ئەو کاتەی برێمەر سواری فڕۆکەکە بوو دەرگاکەش داخرا. هیچ کام لەو عێراقیانەی کە پێوەی سەرسام بوون گوڵیان نەهێنابوو، هیچ دروشمێکی نووسراویش بە "ئەرکەکە ئەنجامدرا" کەشتی جەنگی نەڕازاندبۆوە، بۆنەکە لەو رۆیشتنە بێ دەنگو زۆر نهێنیە مێژووییەی ئەمریکا دەچوو کاتێک کە سایگۆنی پایتەختی ڤێتنامی جێهێشت. دوای ئەوە بەغدا بە شێوەیەکی مەترسیدار نقوومی بێ دەنگی بوو لە کاتێکدا کە رای گشتیو دەزگاکانی راگەیاندنیش لە چاوەڕوانی دابوون. ئایا ئەوە ئاماژەیە بۆ تەقینەوەی توندوتیژی؟ ئایا بەرهەڵستکارە توندڕەوەکان دەست بەسەر شارە گەورەکانی عێراق دادەگرن؟ نەخێر، بەڵکو هەفتەی یەکەم لە دوای رۆیشتنی برێمەر بەڵگە بوو لەسەر روونەدانی هیچ شتێك لەوەی کەناڵە تەلەفزیۆنیەکان پرسیاریان لە بارەی دەکردو پێوەی نیگەران ببوون.

برێمەر تەنیا کاربەدەست بوو لە نێو دەسەلاتی داگیرکەرو بەڵێندەرەکان کە عێراق جێبێڵێت (سەربازێکی ئەمریکی بە گاڵتەجاڕیەوە بە"دەستەیەك لە بەڕێزە ترسنۆکەکان" ناوی دەبردن) خۆی ئاسوودە کرد لەو دەرچوونە خێرایەی لە نێو ئاژاوەو توندو تیژیدا. ٣٣١ ئەو ئەندازیارە

ئەڵمانیایەی کە لە دواهەفتەی مانگی حوزەیراندا داوای چاککردنەوەی وێستگەی کارەبای دۆرەی لێکرابوو، کۆمەڵێك پارچە مەکینەی بە کۆنەکراوەیی جێهێشتو رۆیی. "بەشیر خەلەف عومەر" بەڕێوەبەری وێستگەکە دەڵێت: "کەس پەیوەندی پێنەکردم، ئەوان بارگەی خۆیان تێك ناو رۆشتن." ٣٣٢ رەنگبێ هەندێکیان زانیویانە کە پۆلیسی عێراقی پشتی پێ نابەسترێتو چەكو تفاقێکی ئەوتۆشی نیە تاکو بەرگریان لێ بکەن. چونکە تەنیا کەمتر لە ٦٠٪ چەك و زەخیرەی داواکراویان پێ گەیشتبوو. لە ٢٥٣٠٠٠ پارچە چەك تەنیا ١٤١٠٠٠ گەیشت، چارەگێکیش لەو برە داواکراوەی ئێلەگی گوللەنەبڕ (لە ١٧٤٠٠٠ تەنیا ٤٠٠٠٠ ئێلەگ). هەروەها تەنیا ٥٪ ژمارەی رادیۆی بێ تەلی داواکراویش (لە ٥٧٠٠٠ رادیۆ تەنیا ٢٥٠٠ رادیۆیان پێ گەیشت)، دیسانەوە تا ئەو کاتەی برێمەر عێراقی جێهێشت، تەنیا یەك لەسەر سێی ماشێنە داواکراوەکانیشیان بۆ هاتبوو (تەنیا ٨٥٠٠ ماشێن لە کۆی ٢٥٠٠٠ ماشێن) ٣٣٣. بۆیە کارمەندە بیانیە ترساوەکان وڵاتەکەیان جێدەهێشتو تەنیا خەڵکی وڵاتەکەش دەبوونە قوربانی ئەو هەلومەرجە ئەمنیە دژوارە.

چەند رۆژێك دوای گێڕانەوەی سەروەری بۆ عێراق، کۆشکی سپی چەند ووردەکاریەکی ترسێنەری دەربارەی پرۆژەکانی ئاوەدانکردنەوە دەرخست، لە کۆی ١٨,٤ ملیار دۆلاری تەرخانکراو بۆ کارە خێراو بەپەلەکانی ئاوەدانکردنەوە، تەنیا ٢٪ ئەو پارەیە خەرج کرابوو. تەنانەت یەك سەنتیش لە بواری چاککردنەوە و بەهێزکردنی خزمەتگوزاری تەندروستی و دابینکردنی ئاوی خواردنەوە خەرج نەکرا، کە بە خزمەتگوزاریە هەرە پێویستو بەپەلەکانی عێراق دەژمێردرێت. ٣٣٤ خوێنەرانی ئەو کتێبە بە نێو گێڕانەوەی کۆمەڵێك باس و بەسەرهاتەکانی بەفیڕۆدان و سوودبینین دادەڕۆن کە لەوانەیە توشی سەرلێشێوان بن و بڵێن: ئەوە چیە روودەدات-ئایا پارەیەکی لەڕادەبەدەر یان پارەیەکی زۆر کەم خەرج کراوە؟

وەلأمدانەوەی ئەو پرسیارە وەکو ئەوە وایە تۆ جیاوازی لە نێوان سێو لەلایەک و هەرمێ و پرتەقاڵیش لەلایەکی ترەوە بکەیت. سێ جۆرە سەرچاوەی سامان و دەرامەت هەبوون کە دەسەلأتی داگیرکەر ڕێگەی بەخۆی دابوو دەستیان تێ بخات; یەکەمیان، بڕی ٨٧ ملیار دۆلاری تەرخان کراو لەلایەن کۆنگرێسەوە بۆ ئیدارەی بۆش لە ئەیلولی ٢٠٠٣ کە دابەش کرایە سەر دوو بەش- ١٨,٤ ملیار دۆلار تەرخان کرا بۆ کارەکانی ئاوەدانکردنەوە، بڕەکەی تریش ٦٥ ملیار دۆلار بۆ پرۆسەکانی سوپا دانرابوو. سێیەم سەرچاوەش بریتی بوو لە پارەو داهاتی بەدەست هاتوو لە ئەنجامی فرۆشتنی نەوتی عێراقی.

هەرچی سەرچاوەی دووەمیش بوو بە خێرایی بۆ بەستنی گرێبەندی لەگەڵ هالیبیرتۆن خەرج کرا. ئێستاش سوپا گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی کە پێویستە بودجە تەرخان کراوەکە بڕی ١٢ ملیاری تری بخرێتە سەر. ئەو بڕانەشی کە ئاماژەیان پێکرا ڕێژەی ٩٠٪ ئەو پارەیە پێك دەهێنن کە بەهۆیەوە ڕەخنەیەکی زۆر لە کۆمپانیاکە گیرا. دواتریش لە ئەنجامی ئەو پشکنین‌و پێداچوونەوانەی کە لەلایەن لێکۆڵەرەوەکانی سوپا ئەنجام دران، کرایە قەرزێك پێویستە دواتر بدرێتەوە. پارەی تەرخانکراو بۆ ئاوەدان کردنەوە لەگەڵ سەرچاوەی یەکەمی داهات کە لەسەرەوە باسی لێوە کرا، بڕێکی زۆر کەمیان لێ خەرج کرابوو، چونکە بۆ ڕێگریکردن لە ساختەیی‌و بە فیڕۆدان، ڕێ وشوێنی توندی چاودێریکردن و پێداچوونەوە دەگیرایەبەر. لەئاکامیشدا پارەی کارەکانی ئاوەدانکردنەوە لەداهاتی فرۆشتنی نەوت تەرخان دەکرا (سەرچاوەی سێیەمی دەرامەتەکە). بەشێکی ئەو پارەیە درایە هالیبێرتۆن لە بەرانبەر چاککردنەوەی ژێرخانی نەوتی‌و هەندێکیشی لەلایەن سەربازەکانەوە وەکو پاداشت بۆ چاککردنەوەی فەرمانگەو نووسینگەکانیان یاخود دروست کردنی یاریگای تۆپی پێ بەدەست دەدرایە

خەڵکی. وتارێکی بڵاوکراوە لە حوزەیرانی ٢٠٠٤ لە نیویۆرك تایمزدا، بەو جۆرە وەسفی کەم تەرخەمی کردارەکانی چاودێری دەکات:

لەبەر شێوازی بڵاوبوونەیان لە عێراقدا، تیمەکە ناوبانگیان دەرکردبوو، بڕی ١٠٠ دۆلاریان وەکو بەخشیشی چاکگردنەوە دەبەخشی، لە جانتا پڕەکانی کە لە ڕێی فڕۆکەی بارکردنەوە لە ژێرزەمینی گەنجینەی فیدراڵی لە ڕۆژهەلاتی ڕۆزەر فۆردی سەر بە ویلایەتی نیو جێرسیەوە هێنرابوون. بڕی پارەی دابەش کراو بەو شێوازە بە لانی کەمەوە دەگەیشتە یەك ملیار دۆلار- بە پێی چەند خەملاندنێکی تر خۆی لە قەرەی ٢ ملیار دۆلاریش دەدا. وەکو چۆن کاربەدەستێکی کارگێڕی باسی پارە خەرج کراوەکان دەکات و دەڵێت: "سەرکردە سەربازیەکان حەزیان لەو پرۆگرامە بوو چونکە دۆستو برادەری بۆ دەکڕین. لە حاڵەتی ئاوادا تۆ ئارەزووی بەکرێگرتنی گشت کەسێك دەکەیت، پارە بخەرە گیرفانیان و وایان لێبکە خۆشیان بووێت. ئێمە بەردەوام پارەی عێراقمان بەو جۆرە خەرج دەکرد." ٣٣٥

بە واتایەکی تر:

١- باج دەرە ئەمریکیەکان پارەیەکی زۆریان لەسەربازەکان خەرج دەکرد، پێنتاگۆنیش پارەکەی دەدایە هالیبێرتۆن تا کارەکەی ئەو بکات، ئینجا لەو کاتەی کە دەیانزانی ئیدارە سەرقاڵی شتی ترە وەسڵێکی تریان بە پارەی خەرج کراو پێشکەش دەکرد (تا ئەو کاتەی دوو لە ئەندامە بوێرەکانی کۆنگرێس داوای ئەنجامەکانی پشکنینو پێداچوونەوە ناوخۆییەکانیان کرد)

٢- لە بەر ئاڵۆزی ڕێساکان، بڕێکی کەمی ئەو پارەیەی باج دەرەکان بۆ کارەکانی ئاوەدانکردنەوە خەرج کران.

٣- بە شێوازێکی نا ئاسایی و بێ هاوتا پارەی عێراقمان لە بن هێنا، چونکە حکومەتی ئەمریکی دەیزانی نە کۆنگرێس و نە نەتەوە یەکگرتووەکانیش رووبەڕووی پرسیاری قورسی ناکەنەوە.

سەرەڕای ئاماژەپێدانم بۆ ئەو هەموو سوودبینین و هەلقۆستنەوەیە، کەچی پرسیاری ئەوەم لێدەکرا، ئایا بۆچی ووردەکاری زیاترم لە بارەی نەوت نەخستۆتە روو. مەگەر نەوت مەبەستی سەرەکی شەڕەکە نەبووبێت؟ هەروەها ووردەکاری لەبارەی ئەو کۆنتراکتانەی کە بێ رکابەرکێ دەدران، رۆڵی "دیك چێنی" لە بەخشینی گرێبەستەکان، فرۆشتنی بە کۆمەڵی دەزگا پیشەسازیەکانی عێراقی کە موڵکی دەوڵەتن بە ناوی بەتایبەتیکردن؟

لە وەڵامی ئەوانەدا دەڵێم، رووداوەکانی ئەو کتێبە تەنیا بە پێی رۆژ و رێکەوت لەوەتەی پرۆسەی ئازادی کردنی عێراقەوە رێك بخە، وەکو چۆن من و رۆژنامەنووسی تریش کردوومانە، ئینجا دەبینیت کە باسی شتەکان کراوە. بۆ گەیشتنیش بە ئەنجامی ئەو باس و خواسانەی کە دەڵێن سیاسەتی دەرەکی و ئایدۆلۆژیا لە پشتەوەی داگیرکردنەکە بوونە، ئەوا پێویست دەکات شیکردنەوە و بە دواداچوونی زیاتر بخوێنیتەوە، لەوەی کە من کردوومە. بەلای منەوە دوو هۆکار لە پشتەوەی بەرپابوونی ئەو شەڕە هەبووە: یەکەمیان، بۆ بردنی سەرنجی رای گشتی بە ئاقارێکی تر، دوور لە هەرەسهێنانی ئیدارەی جۆرج بۆش لە دووبارە بونیادنانەوەی ئەو ژێرخانە دارماوە نێوخۆییانەی وەك (قوتابخانەکان، نەخۆشخانەکان و ئاسایشی کۆمەڵایەتیش). دووەمیش، بۆ بەهێزکردنی پێگەی سەربازی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بێگومان نەوت فاکتەرێك بووە بۆ داگیرکردنەکە، بەڵام ئەو فاکتەرە بەڵگەیەکی بەرێککەوت بووە بۆ پرۆسەی شەڕ. نابێ ئەوەشمان لە یاد بچێت کەوا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەر لە جەنگ کڕیارێکی سەرەکی نەوتی عێراق بوو، ئێستاش دوای شەڕەکە بە هەمان شێوە

سەرەکیترین کڕیاری نەوتەکەیە. هەرچۆنێك بێت مافی سوودبینین لەو نەوتە چ بدرێتە روسیا یان فەرەنسا یاخود ئەمریکا، ئەوا پێویست بە بیر لێکردنەوەیەکی زۆری پێشوەختە دەکات، لە رێی ئەو کتێبەش هەوڵی ئەوەم داوە تەنیا مامەڵە لەگەڵ راستیەکان و ئەو شتانەشی کە لەسەر زەوی روویان داوە بکەم. ئەو راستیەش هەیە کەوا کۆنترۆڵکردنی بیرە نەوتیەکان لە دەست هالیبێرتۆندا نیە و هیچ ئیمتیازاتێکیشی لەو نەوتەدا نیە. بە کورتی کۆمپانیاکە، کۆمپانیایێکی خزمەتگوزاری نەوتیە، کارەکەشی بریتیە لە دابینکردنی شارەزایی بۆ کۆمپانیا نەوتیەکانی کە ئەو جۆرە ئیمتیازاتانەیان هەیە. بەلاّم گومان و نیگەرانیەکان زیاتر لەبارەی گرێبەستیەکانی نێوان کۆمپانیای ناوبراو و سوپایە لە عێراقدا. کە بەهای ئەو گرێبەستیانە دە ئەوەندەی گرێبەستیە نەوتیەکانێتی.

لەو کاتەشی رەچاوی ئەو کۆنتراکتانە دەکرا کەوا بێ کێبڕکێ دەستەبەر دەبوون، ئەوا زۆر لەوکۆنتراکتانە (وەك کۆنتراکتەکەی ئاوەدانکردنەوەی تایبەت بە بەکتل) لە رکابەرکێیەکی زۆر سنووردار بەدەست دێن، بێجگە لە کۆنتراکتەکانی تایبەت بە کوژاندنەوەی بیرە نەوتیە گڕگرتووەکانو هەروەها گرێبەستیەکانی تایبەت بە تۆڕی دەزگاکانی راگەیاندنیش، کە هەردووکیان بێ رکابەرکێ بەخشران. ئایا رکابەرکێی بەدەست هێنانی ئەو گرێبەستیانە لەسەر بنەمای رکابەرکێیەکی کراوە بووە؟ ئایا هەریەك لە هالیبێرتۆن و SAIC بە توانایی خۆیان گرێبەستیەکانیان بەدەست هێناوە؟ شارەزاییەکی کەمی هەبوو لە گرێبەستیەکەی تۆڕی راگەیاندنی عێراقیدا، بەلاّم هالیبێرتۆن یەکێکە لەو کۆمپانیانەی کە خاوەنی ئەزموونێکی زۆرەو توانای دابینکردنی پێداویستیەکانی سوپای هەیە، کەچی قۆرخکردنی بۆ گرێبەستیەکانی سوپا وەکو نەریتێك وایە. سەرەڕای ئەو راستیەشی کەوا زۆر لە عێراقیەکان شارەزاییان هەبوو لە چێشت لێنانو شۆفێری، بەلاّم هەرگیز

ئەو کارانەیان پێ نەدەدرا، چونکە ترس لە خەڵکی ئەو وڵاتە هەبووە. هەروەها بە پێی پێوەری دانراو لەلایەن واشنتۆنەوە، کۆمپانیا عێراقیەکان مەرجی تەواوی رکابەرکێیەکانی بەدەست هێنانی ئەو گرێبەستانەیان تێدا بەدی نەدەهات. بەلام سەیریش لەوەدا بوو کە کۆمپانیا ئەمریکیەکان لەلایەکی ترەوە گرێبەستیان لەگەڵ کۆمپانیا عێراقیەکان دەکرد، بۆ ئەنجامدانی کارە ئاست نزمەکان و بە تێچوونێکی کەمیش، ئەوە لە کاتێکدا کە وەسڵی بەهاداری زۆر تێچوو دەنێردرایە بەردەم بەڕێوەبەرە جیبەجێکارەکان لە واشنتۆنی پایتەختدا.

ئایا دەسەڵاتی داگیرکەر لە هەڵبژاردنی کۆمپانیاکاندا بە هەڵەدا چوبوو؟ دیاربوو SAIC هیچ شارەزاییەکی نەبوو لە بونیادنانی- نیشتمان، هەروەها کۆمپانیای "ڤانێل"ـیش سەرکەتوو نەبوو لە دروست کردنی سوپا، راهێنەرەکانی سەر بە کۆمپانیای "دایان کۆرپ"ـیش دڵخۆش بوون لەوەی کە دەستیان هەبوو لە زێدەکردنی تورەیی عێراقیەکان، بێ ئەوەی بە خۆشیان بزانن ئەوا یارمەتی بەرهەڵستکارەکانیان دەدا. ئەزموونی Bearing Pointـیش لە پرۆسەی بەتایبەتیکردندا کارەسات بوو، هەروەها جێبەجێکردنی RTIـیش لە شێوازی پێك هێنانی ئەنجوومەنی شارەکاندا پەیامێك بوو بە عێراقیەکانی دەگوت بەوەی هەرگیز ئەمریکا گرنگی نادات بە تواناسازکردنتان، بەڵکو ئیش دەکات بۆ پێك هێنانی ئەنجوومەنێکی گوێڕایەڵ، بە جۆرێك کە پشت بە بەخششی ئەمریکا ببەستێت. هەرەسهێنانی بەکتل لە چاککردنەوەی ژێرخان لە ماوەی ساڵێکدا، یارمەتیدەر نەبوو بۆ هێورکردنەوەی ئەو عێراقیانەی کەوا لە هەمان کاتدا گوێبیستی قسەوباس دەبوون سەبارەت بە کردارەکانی ئەشکەنجەدانو کوشتن لەلایەن سەربازە ئەمریکیو مەدەنیە نەناسراوەکانیش لە بەندیخانەی ئەبوغرێبو شوێنی تریشدا. ئەوە لە کاتێکدا هەزارەها کەس چاویان

بڕیبووە ئەوەی دەسەبری کارێك بکەن لەگەڵ هالیبێرتۆن، لە هەمان کاتیشدا خەڵکێکی زۆر لەو باوەڕەدا بوون کە کۆمپانیاکە نەوتی عێراق دەدزێت.

ئایا رۆژێك دێت تاکو بزانین هەریەك لە "فرانك داڵ و جانێت بەلانتاین و دیك چێنی" دەستیان هەبووە لە بەخشینی ئەو گرێبەستیە قازانج بەخشانە لە عێراقدا؟ ئایا دەتوانین بگەینە ئەو راستیەی کە بۆچی گرێبەستیەکانی CACI لە "سییرا ڤێستا - ویلایەتی ئەریزۆنا" ئیمزا کران لە بری ئیمزاکردنیان لە واشنتۆن یان بەغدا، هەروەها لە وەزارەتی ناوخۆوەش دەرچووبوون لە بری ئەوەی لە پێنتاگۆنەوە دەربچن؟ ئایا باج دەرە ئەمریکیەکان و هاوڵاتیە عێراقیەکانیش خزمەتی باشتریان کراوە، ئێمەش ئەرکەکەی خۆمان بەجێ گەیاندووە؟ رکابەرکێی ئازادو دادپەروەرانەش ئەنجام دراوە، یان کۆمپانیایێکی تر جیا لەوانەی باسکران گرێبەستی پێدرا؟ ئایا زۆربەی داهاتی نەوتی عێراقیمان لە بەکارخستنی راستەوخۆی دەستی کار و کۆمپانیای عێراقی خەرج کردووە؟ رەنگبێ توانیبێتمان بەشێکی تورەیی‌و بێزاری کەڵەکەبووی ملیۆنەها بێکار لە شارەکانی بەغداو کەرکوك‌و بەسرە برەوێنینەوە. ئەو تورەییەی کە مەترسی هەیە بەسەر سڕینەوەی هەموو ئەو کارانەی کە تا ئێستا بە ئەنجام گەیەنراون.

ئەرکی ئاوەدانکردنەوەی عێراق لە ئەستۆی کێ دایە؟ پێم وایە وەڵامی ئەو پرسیارە ئاسانە، هەرچەندەشی کە جێبەجێکردنی لە رووی پراکتیکیەوە سانا نیە. پێویستە عیراقیەکان خۆیان بەرپرسیارێتی پرۆسەکە بگرنە ئەستۆ. هەروەها پێویستە گرێبەستی لەگەڵ کۆمپانیا عێراقیەکاندا بکرێت و کرێکارە عێراقیەکانیش لە پێشەوەی ئەوانی تر بن بۆ دەسەبەرکردنی کار. ئایا ئەو کارە مانای ئەوەیە کە کۆمپانیا بیانیەکان لە پرۆسەکە دوور بخرێنەوە؟ نەخێر، هەرگیز نا، بە تایبەتیش گەر بێتوو

لێزانیو شارەزاییان لە بوارێکدا هەبێت کە لەسەر ئاستی نێو خۆییدا دەسەبەر نەبێ. چونکە عێراق بەردەوام پشتی بە شارەزا بیانیەکان بەستووە لە بوارەکانی بیناکردن و سەرپەرشتیکردنی چاککردنەوەی وێستگەکانی کارەبا، گومانیشی تێدا نیە کەوا ئارەزوومەندن بۆ گرێبەستیکردن لەگەڵ هالیبێرتۆندا بۆ یارمەتی دانیان لە بەکارهێنانی ئامێرە ئاڵۆزەکانی لێدانی بیرە نەوتیەکان، وەکو چۆن هەر کۆمپانیایێکی نەوتی لە جیهاندا دەیکات. بەڵام بڕیاردان لەسەر ئەو مەسەلانە پێویستە لەلای خودی عێراقیەکانەوە بێت، نەوەك ئەمریکیەکان، دەبێ لەبەغدا بڕیار بدرێت نەوەك لە واشنتۆن، هەروەها دەبێ تا بکرێت پرۆسەکە کراوە و شەفاف بێت و پارەدانەکەش دەبێت گونجاو بێت لەگەڵ جۆر و چۆنیەتی بە ئەنجام گەیاندنی کارەکان و لە کاتی خۆشیاندا بن.

لە ژێر یاساو رێسای لەم جۆرە، خەرج کردنی پارەی باج دەرەکان بەجێتر دەبن و هەروەها کۆمپانیا زوو دەوڵەمەند بووەکانیش، خۆیان لە قەرەی کارێك نادەن کە نەتوانن بە ئەنجامی بگەێنن، لەلایەکی تریشەوە خزمەتگوزاریەکانی وەك تەندروستی و فێرکردن دەبێ لەلایەن دەزگا نێودەوڵەتیە ناسوودمەندەکانەوە فەراهەم بکرێت و بەدواداچوونی بەردەوامیشیان بۆ بکرێت، هەروەها پێویستە کۆنتراکتەکانی هێنانەدی دیموکراسیەت رەتبکرێنەوە گەر هاتوو مەبەست لێیانەوە هەوڵدان بوو بۆ دەستێوەردانو دەسکاریکردنی سەروەری خەڵکی.

ئەوەش رووبەڕووی قورسترین پرسیارمان دەکاتەوە: لە عێراق کێ دەبێ ئەو بڕیارانە بدات؟ ئایا حکومەتە دەستەبژێرکراوەکە، لەگەڵ راوێژکارە ئەمریکاییە نادیارەکانیان یان حکومەتێکی هەڵبژێردراو دیموکراسی راستەقینە؟

کاتێکیش من خەریکی نووسینی ئەو دوا ووشانەم لە کۆتایی تەمموزی

٢٠٠٤، پانزە مانگ دوای تەواو بوونی داگیرکەریەکە، ئەوەم بە مێشك دادێت کەوا، سیستەمی دەنگدان ناکەوێتە لیستی شتە گرنگەکانی ئەجێندای ئەمریکاو ئێستاش ئەو مەسەلەیە جێی بایەخدانی ئەمریکا نیە. لەوەش زیاتر متمانەکردن بە حکومەت رۆژ لە دوای رۆژ کەمتر دەبێتەوەو توندوتیژی لە هەموو لایەکەوە پەرە دەسێنێت- سەربازە ئەمریکیەکان دووبارە هێرش دەکەنەوە سەر فەللوجە، خەڵکی دەرفێنرێت، کوشتن‌و بۆمبی خۆکوژیش لە زیادبوون دایە (لە کۆی هەژدە پارێزگار دووانیان تەنیا لە تەمووزی ٢٠٠٤ کوژراون)- کە پێویستە گرنگیەکی زۆر بەو لایەنە بدرێت. ئینجا دوای ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی شەرعی‌و پاك‌و کشانەوەی سەربازەکان، ئایا عێراقیەکان توانای هەڵبژاردنی حکومەتێکی دروستیان دەبێت؟ ئایا شەڕی خوێناوی بەرپا دەبێت؟ ئایا دەنگ بە کۆنە بەعسیەکان‌و پیاوەکانی سەدام حوسێن دەدرێت یان بە ئیسلامیە توند ڕەوەکان؟ کەس نازانێت. سەبارەت بە مەسەلەی دیموکراسیش، گەر بێتوو لەسەر شێوازی ئەمریکی بێت، ئەوا دەنگی هاوڵاتیانی عێراقێکی سەروەرو خاوەن دەسەڵات گوێی لێ دەگیرێت.

# سەرنجەکان

١. چاوپێکەوتن و سەرنجەکانی نووسەر، ٩ نیسانی ٢٠٠٤.

٢. ریتشارد لێزین جۆنس و جیلّ کاپوزۆ، "کاربەدەستانی ئەمریکی سەرکەوتوو نەبوون لە پاراستنی مەدەنیەکان لەسەربڕین، بە پێی وتەی خێزانێك." نیویۆرك تایمز، ١٣ ئایاری ٢٠٠٤.

٣. پۆلّ برێمەر، لە وتەیەکی دا بۆ ئەنجوومەنی پارێزگای بەغدا، ٢٤ ئاداری ٢٠٠٤، کە لەسەر وێبسایتی www.iraqcoalition.org/transcript/٢٠٠٤٠٣٢٤_bremer_١٠٠.htmlدا بلاّو کرابۆوە.

٤. جۆناسان وایزمانو ئاریانا ئیونجەنگ تشا، "Rebuilding Aid Unspent. Tapped to Pay Expenses" واشنتۆن پۆست، ٣٠ نیسانی ٢٠٠٤.

٥. Ibid.

٦. مات کێلّی" کەمتر لە ٢٥٠٠٠ عێراقی لە کردارەکانی ئاوەدانکردنەوەی کە خەرجیەکەی لە ئەستۆی ئەمریکادایە،" ئاسیۆشیەتد پرێس، ١٨ ئایاری ٢٠٠٤.

٧. جیم گارامۆن، "هاوپەیمانەکانی هانی گەشەکردنی کەرتی تایبەت دەدەن لە عێراق،" خزمەتگوزاری بلاّوکراوەکانی هێزەکانی ئەمریکی، ١٨ شوباتی ٢٠٠٤.

٨. "ژمارە زۆرە بێکارەکان لە عێراق،" CBS.news.com، ١٦

تشرینی یەکەم ٢٠٠٣.

٩. Kelly. op. cit.

١٠. ئێوا جاسویتش، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەرەوە، ١٣ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١١. دەیڤد باکۆن، "ئەمریکا کاربەدەستانی یەکێتیەکان دەسگیر دەکات،" خزمەتگوزاری هەواڵەکان پاسیفیك، ١٠کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٢. راوسڵ گۆڵد، "The Temps of War:Blue- Collar Workers Ship Out For Iraq" وۆڵ ستریت جۆرناڵ پرێس، ١٤ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٣. هەواڵەکانی NBC، ١٢، کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣. "بەڵێندەرەکان خواردنی پیس دەدەنە سەربازەکانو لە ناندینی پیسیش" دەزگای فرانس پرێس، ١٤ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٤. Ibid.

١٥. نیڵ کینگ، "Haliberton Hits Snafu on Building in Kuwait،" وۆڵ ستریت جۆرناڵ، ٢ شوباتی ٢٠٠٣.

١٦. Gold. op. cit.

١٧. مێلیسا نۆرکۆرس، لە ئیمایلێکی دا بۆ نووسەر، ٩ شوباتی ٢٠٠٤.

١٨. دەیڤد رۆد، "هەلقۆستنەوە لە عێراق، بە گوتەی کرێکارە هیندیەکان،" نیویۆرك تایمز، ٧ ئایاری ٢٠٠٤.

١٩. نیك گریم، "کۆمپانیای کویزلاند، کۆنتراکتی قازاج بەخش لە عێراق لەدەست دەدات" The World Today، ٢١ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٠. ماریان ویلکنسۆن، "گەندەڵی ئاشکرا دەبێت، دوای ئەوەی کۆمپانیایێك کۆنرتاکتی لە عێراق بەدەست نەهێنا" Sedney

"Morning Herald" ۲۱ ئایاری ۲۰۰٤.

۲۱. گەواهیدانی هێنری بانتنیگ، "سیاسیەتی سیناتۆرە دیموکراتەکان لە لێژنەی چاودێریکردنی گوێگرتنی گرێبەستیەکانی ئاوەدانکردنەوەی عێراق" ۱۳ شوبات ۲۰۰٤.

۲۲. Ibid.

۲۳. دەیڤد ئیڤانۆڤیتش، "جەخت کردنەو لەسەر لێپێچینەوە لەگەڵ هالیبێرتۆن دەربارەی تێچوونی پەشتەماڵ" Houston Chronical، ۱٤-۲۳ شوباتی ۲۰۰٤.

۲٤. Buntong. op. cit

۲٥. رۆبەرت میکائیل وێست، ٦ حوزەیرانی ۲۰۰٤، لە وێب سایتی لێژنەیەکی سەر بە لێژنەی کەمایەتیەکان بۆ چاکسازی حکومەت، www.house.gov/reform/min/inves_admin_contracts.htm.

۲٦. راسڵ گۆڵد، "هالیبێرتۆن بەرەو کۆسپە گەورەکان لە عێراق" وۆڵ ستریت جۆرناڵ"، ۲۸ نیسانی ۲۰۰٤.

۲۷. Ibid.

۲۸. دەیڤد ویلسۆن، راگەیاند، ۱۳ حوزەیرانی ۲۰۰٤، لە وێب سایتی لێژنەیەکی سەر بە لێژنەی کەمایەتیەکان بۆ چاکسازی حکومەت، www.house.gov/reform/min/inves_admin_contracts.htm.

۲۹. سێس برۆنستۆن، "لۆری بێ بار بە ناوچە مەترسیدارەکانی عێراق دەڕۆن" King Ridder، ۲۱ ئایاری ۲۰۰٤.

۳۰. جێفری رۆدینگن، ئەفسانەی هالیبێرتۆن، (فۆرت لاودێرداڵ: Write Stuff Press، ۱۹۹٦)

۳۱. لیندە گیلان، "براون ئەند روت، مندالە زێرینەیە کێشەدارەکەی

هالیبێرتۆن"، ٢٠٠٤ zh]hvn ٤ Houston ChronicalK.

٣٢. ئۆلیڤەر بێرکمان، "کۆمپانیاکەی چێنی ملیۆنەها دۆلاری وەکو بەرتیل داوەتە کاربەدەستان لە نەیجیریا" گاردیان، ٩ ئایاری ٢٠٠٣.

٣٣. Rodengen. op. cit. p ٧٢

٣٤. رۆبەرت کارۆ، ساڵەکانی لیندۆن جۆنسۆن: ڕێگا بەرەو دەسەلآت، نییۆرك، ئەلفرێد نۆپف، ١٩٨٢)

٣٥. دان بریۆدی، ئەجێندای هالیبێرتۆن، (نیویۆرك: وایلی، ٢٠٠٤) لا. ١٥٦.

٣٦. رایمۆند کلیمپین، هیوستن بیزنس جۆرناڵ، ١٣ ئەیلوی ١٩٨٢: لا. ١٣٣.

٣٧. ئەلکامین، دەرنەکەوتنی رەگ‌و ریشەی دیموکراتەکان لە بەرچاوی هالیبێرتۆن"، واشنتۆن پۆست، ٥ ئاداری ٢٠٠٤.

٣٨. بیل هاتۆنگ و فرێدا بێریگان، " Is what`s good for Haliberton for Bong and Haliberton Good for America?" پەیمانگای سیاسەتەکانی نێودەوڵەتی، شوباتی ٢٠٠٤.

٣٩. Pentagon Biography of Richard B.Cheney posted at www.defenselink.mil/specials/secdef_histories/bi.os/cheney.htm

٤٠. جەین مایەر، "Contract Sport" نیویۆرکەر، ١٠ شوباتی ٢٠٠٤.

٤١. "خۆپیشاندانی سۆماڵیە لادراوەکان لەسەرکار لەلایەن کۆمپانیاێکی ئەمریکی" رۆیتەرز، ٥ تشرینی ١٩٩٤.

٤٢. Richard B. Cheney`s resume posted at wwwwhitehouse.ogv/vicepresendent/;knut Royce and Nathaniel HellerK "Cheney Led Halliburton

To Feast at Federal TroughK "Augest ٢. ٢٠٠١. posted on the center for public Integrity Web site www.publici.org/dtaweb/report.asp?ReportIDat

٤٣. رەنگە چێنی تا ئێستا پەیوەندی لەگەڵ هالیبێرتۆندا هەبێت.CNN، ٢٥ ئەیلولی ٢٠٠٣، هەروەها جێگری سەرۆك دیك چێنیو هاوسەرەکەی، داهاتی ساڵی ٢٠٠٢یان ئاشکرا دەکەن، نووسینگەی جێگری سەرۆك، ١٣ نیسانی ٢٠٠٤.

٤٤. مری ویلیامز واڵش، "کەمکردنەوەی بەخشینەکانی حکومەت دوای رێکەوتنەکەی هالیبێرتۆن"، نیویۆرك تایمز، ١٠ ئەیلولی ٢٠٠٢.

٤٥. تیم زۆسێرت، چاوپێکەوتن لەگەڵ دیك چێنی، Meet the Press، NBC، ١٤ ئەیلولی ٢٠٠٣.

٤٦. لێژنەی کارە پیشەسازیە سیاسیەکان، "پرۆژەی ٢٠٠٠" "ئێمە لێرەوە بەرەو کوێ بچین؟" و "پرۆژەی گەشاوە"، لە وێب سایتی www.bipac.org/home.asp

٤٧. هالیبێرتۆن، "Former Four-Star General Flag Officer Admiral`Joe`lopez joins Haliberton Business Unit"، راگەیاندنی رۆژنامەوانی، ٢٠ حوزەیرانی ١٩٩٩.

٤٨. مایك نۆڵ، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەرەوە، ئایاری ٢٠٠٢.

٤٩. بۆب ویستین، "کەمپی خێمەکان لەسەرتاسەری کوێت دادەمەزرێ"، خزمەتگوزاری هەواڵەکانی هێزەکانی سەربازی، ٢٥ شوباتی ٢٠٠٣.

٥٠. دان باوم، "National Builders for Hire" گۆڤاری نیو یۆرك تایمز، ٢٢ حوزەیرانی ٢٠٠٣.

٥١. Whistine. op.cit.

٥٢. سەردانی نووسەر بۆ ئەدەنەو ئەیلا جین یاکلی، "فرۆکەوانە ئەمریکیەکان"

٥٣. مەیجۆر تۆنی کەمپەر، چاوپێکەوتن لەلایەن ساشا لیلی لە کۆرپ وتش، کانوونی دووەمی ٢٠٠٣.

٥٤. دەیڤد ئیڤانۆڤیتش، "کۆسپی زۆر لە بەردەم کێڵگە نەوتیەکانی عێراق"، هیوستن کرۆنیکل، ٢٩ نیسانی ٢٠٠٣.

٥٥. Baum.op.cit

٥٦. پیتەر ئێس گودمان، "عێراق: لە پیشەسازی نەوت، ئازارو بێکاری"، واشنتۆن پۆست، ٣٠ نیسانی ٢٠٠٣.

٥٧. دۆن ڤان ناتای کوڕ،، "دانی پارەیەکی زۆر بۆ هالیبێرتۆن، بۆ سووتەمەنی لە عێراق"، نیو یۆرك تیمز، ١٠ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

٥٨. تشیپ کیومێنز، " کاربەدەستە ئەمریکیەکانو ئەگەری ئاراستەکردنی بەڵێندەرە کوێتیەکان"، وۆڵ ستریت جۆرناڵ، ١٥ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

٥٩. نیل کینگی کوڕ، "هالیبێرتۆن بە کارمەندەکانی پێنتاگۆن دەڵێت کاردانەوەی توند بنوێنن لەمەڕ پارەدارکردنی پرۆژەکان لە عێراق"، وۆڵ ستریت جۆرناڵ، ٢٣ کانوونی دووەم ٢٠٠٤.

٦٠. تی کریستیان میلەر، "باسکردنی هەڵەکانی گرێبەستیەکان لە عێراق"، لۆس ئەنجیلۆس تایمز، ١١ ئاداری ٢٠٠٤.

٦١. "لە ٢٠٠٢ پێنتاگۆن لەمەڕ بەڵێندەرەکان ئاگادار کرایەوە،" ئاسیۆشیەتید پرێس، ٧ ئایاری ٢٠٠٤.

٦٢. ئێریك رۆزینبێرگ، "سەرەڕای ئاگادارکردنەوەکانیش، KBR هەر گرێبەستی پێدرا،" خزمەتگوزاری هەواڵەکانی هێرست.

٦٣. Gold. op.cit.

٦٤. راوسڵ گۆڵد و کریستۆفەر کووپەر، "پێنتاگۆن تاوانی چەك دەخاتە پاڵ هالیبێرتۆن،" وۆڵ ستریت جۆرناڵ، ٢٣ کانوونی دووەمی ٢٠٠٤.

٦٥. گرێگ جەیف و نیلْ کینگی کوڕ.، "ژەنەڕاڵێکی ئەمریکی ڕەخنە لە هالیبێرتۆن دەگرێت،" وۆلْ ستریت جۆرنالْ، ١٥ ئاداری ٢٠٠٤.

٦٦. سوو پلێمینگ، "ئەمریکا لێکۆڵینەوەی زیاتر دەکات لە خەرجیەکانی هالیبێرتۆن،" ڕۆیتەرز، ١٧ ئایاری ٢٠٠٤.

٦٧. ماری دی یۆنگ، ڕاگەیاندن، ٦ کانوونی دووەمی ٢٠٠٤، بلاْوکراوە لە وێب سایتی کەمایەتیەکانی چاکسازی حکومەت، www.house.gov/reform/min/inves_admin_contracts.htm.

٦٨. Mayer. op. cit.

٦٩. جاکی سپینەرو ماری پات فلاهێرتی، "عێراق: پێداچوونەوەی پلانی ئاوەدانکردنەوە،" واشنتۆن پۆست، ٣١ ئاداری ٢٠٠٤.

٧٠. بلاْوکراوە لە وێب سایتی: swz.salary.com

٧١. Hartung and Berrigan. op.cit.

٧٢. یەعروب جاسم، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ١٤ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

٧٣. جێف بێرگەرنووسینگەی ڕاگەیاندنی بەکتل، ئیمایل بۆ نووسەر، ١٠ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤.

٧٤. دۆگلاس جێل، " پێنتاگۆن بەربەست لە بەردەم سێ ولاْت بۆ گرێبەستیەکانی عێراق،" نیویۆرك تایمز، ١٠ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

٧٥. دەیڤد بەیکەر، "بەکتل لە ژێر ئابلۆقە دایە: تووڕە بوونی عیراقیەکان لە تێکدان بەرجەستە دەبێت، هەولْەکانی ئاوەدانکردنەوەی هێواش،" سان فرانسیسکۆ کرۆنیکل، ٢١ ئەیلول ٢٠٠٣.

٧٦. Ibid

٧٧. USAID. "Local USAID Awards Iraq Infrastructure II Contract"، ڕاگەیاندنی ڕۆژنامەوانی، ٦ کانوونی دووەم ٢٠٠٤ لەگەڵ ١٧ نیسانی ٢٠٠٣.

٧٨. ریتشارد ئۆپڵی کوڕ لەگەڵ دیانا هێنریکس، "بەکتل پەیوەندی لە واشنتۆن هەیە، لەگەڵ/بۆ عێراقیش،" نیویۆرك تایمز ١٧ نیسان ٢٠٠٣.

٧٩. بلاوکراوە لە وێب سایتی بەکتل، www.bechtel.com/default_about.htm

٨٠. دەیڤد بەیکر، "ئەمریکا: داهاتی بەکتل لە ٢٠٠٣دا، بۆ یەکەمجار لەرادەبەدەرە،" سان فرانسیسکۆ کرۆنیکڵ، ٢٠ نیسان ٢٠٠٤.

٨١. دان بوام، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، تەمموزی ٢٠٠٤.

٨٢. جۆرج شوڵتز، "دەس بەکاربە. مەترسیەکە لە ناکاوە: سەدام حوسێن پێویستە لابدرێت،" واشنتۆن پۆست، ٦ ئەیلول ٢٠٠٢.

٨٣. جیم ڤالێت لەگەڵ ستیف کرێتزمان و دافنی وایشەم، "دیدێکی سادە"، پەیمانگای توێژینەوە سیاسیەکان، ئاداری ٢٠٠٣.

٨٤. بلاوکراوە لە وێب سایتی OPIC لە ;www.opic.gov/staff/exec/BIO-Connelly.htm "بانکی ExIm ٢٠٠٣ یەکەم دانیشتنی کۆمیتەی راوێژکاری،" راگەیاندنی رۆژنامەوانی، ٢٥ ئاداری ٢٠٠٣؛ لەگەڵ ئەندرێ ڤێرلۆی و دانیال پۆلیتیی، "جەخت کردنەوە لەسەر هۆکارەکانی کەرتی پیشەسازی، پەیوەندی راوێژکاری لەگەڵ بەڵێندەرەکانی بەرگری،" سەنتەری سەلامەتی گشتی، ٢٩ ئاداری ٢٠٠٣.

٨٥. ستیڤ لیبلانگ، " ناتسیۆس: رۆژێکی نوێ بۆ دەسکەوتی گەورە." ئاسیۆشیەتیت پرێس، ١٢ نیسانی ٢٠٠٠.

٨٦. جۆلێت بێك، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، نیسانی ٢٠٠٣.

٨٧. جیمی لانگمان، "شەڕی بەکتل لە دژی هەزارە پیسەکانی پۆلیڤیا،" سان فرانسیسکۆ کرۆنیکڵ، ٢شوباتی ٢٠٠٢.

٨٨. بلاوکراوە لە وێب سایتی بۆستن گلۆب:

www.boston.com/globe/metro/bigdig/

٨٩. رۆجەر موودی، "گۆلیڤەر، ماین ۆتش: لەگەڵ دۆن مەی، سەرۆکی ئێرس کۆرپی کالیفۆرنیا، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ئایاری ٢٠٠٠.

٩٠. ئەڤیڤا ئیمهۆف، "The Big. Ugly Australian Goes to Ok Tedi"، مەلتی ناشینالْ مۆنیتەر، ئاداری ١٩٩٦.

٩١. سەنتەری سیاسەتە هەستیارەکان، "ئاوەدانکردنەوەی عێراق-بەڵێندەرەکان،" ٢٨ نیسانی ٢٠٠٣، بلاْوکراوە لە www.opensecrets.org/news/rebuilding_iraq/index.asp

٩٢. تێد مۆریس، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ١١ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

٩٣. دەیڤد بەیکۆن، "ئوم قەسر: لەسەرکەوتنێکی نیشتمانی بۆ دەسکەوتی شەڕ" کۆرپ ۆتش، ١٥ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

٩٤. Baker. op.cit.

٩٥. Baker. op.cit

٩٦. Baker. op.cit

٩٧. رۆد نۆردلاند و مایکڵ هێرش، "ئەمریکا: چاڵی ٨٧ ملیار دۆلار"، نیوز ویك، ٢٧ تشرینی یەکەم ٢٠٠٣.

٩٨. کۆلین روات، "سزاکان چۆن ئازاری عێراق دەدەن" پرۆژەی زانیاریو راپۆرتەکانی رۆژهەلاْتی ناوەڕاست، لەلایەن مونتەدای سیاسەتەکانی جیهانی، ٢ ئابی ٢٠٠١.

٩٩. موحسن حەسەن، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ٧ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٠٠. لاری کاپلۆ، "ئەمریکا: رەخنە لە بەکتل دەگیرێت بە هۆی پرۆژەی قوتابخانەکان لە عێراق،" پالم بیتش پۆست – خزمەتگوزاری

هەواڵی کۆکس، ١٤ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٠١. Nordland and Hirsh. p.cit.

١٠٢. کەریم ئەلجەوهەری، "فرۆشتنی سەرکەوتن بە عەرەبەکان" هەفتەنامە ئەلئەهرام، ٢٠-٢٦ تشرینی دووەمی ٢٠٠٣.

١٠٣. فرانسیس کاناڤان و جۆناسان مارشاڵ، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، نیسان و ئایاری ٢٠٠٤.

١٠٤. سەعد محمد، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، کانوونی یەکەم ٢٠٠٤.

١٠٥. وەرگێڕ، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ١٨ نیسانی ٢٠٠٤.

١٠٦. "بەڕێوەبردنی وشکی بەکتل" پەبلیك سیتیزن، نیسانی ٢٠٠٤.

١٠٧. Ibid

١٠٨. Canavan interview. Op.cit.

١٠٩. جاکی سپینەر، "پرۆسەی پەروەردە لە عێراق" واشنتۆن پۆست، ٢١ نیسانی ٢٠٠٣.

١١٠. جاکی سپینەر، "دەرکەوتنی گومان لەبارەی گرێبەستەکانی کرێیەتف ئاسۆسیەیشن" واشنتۆن پۆست، ١٣ حوزەیرانی ٢٠٠٣.

١١١. سەنتەری سەلامەتی گشتی، "سەربوردەی کریەیتف ئاسۆسیەیش" دەسکەوتە چاوەڕواننەکراوەکانی شەڕ، بلاَوکراوەتەوە لە www.publici.org/wow/bio.aspx

١١٢. جاستن هیوگلەر، "مردن بە هۆی کەم تەرخەمی: هەلومەرجی نەخۆشخانەکانی منداڵان لە عێراقدا،" ئیندیپێندنت، ٢١ شوباتی ٢٠٠٤، لەگەڵ جێفری گێتڵمان، "ئاشووبو شەڕ نەخۆشخانەکانی عێراقیان وێران کردووە"، نیویۆرك تایمز، ١٤ شوباتی ٢٠٠٤.

١١٣. دکتۆر حەقی ئەلرەزووقی، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ١٩ نیسانی ٢٠٠٤.

١١٤. Gettlmen. op.cit

١١٥. پۆڵ مارتن، "ئەمریکا بە نیازە رێژەی مردنی منداڵە عێراقیەکان نزمکاتەوە"، واشنتۆن تایمز، ٢١ حوزەیرانی ٢٠٠٣.

١١٦. عەمار ئەلسەفار، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ٧ نیسانی ٢٠٠٤.

١١٧. Gettleman. op. cit.

١١٨. دەیڤد بەیکەر، "کۆمپانیای SF گرێبەستی دەبەخشێت لە عێراق" سان فرانسیسکۆ کرۆنیکڵ، ١٢ ئاداری ٢٠٠٤.

١١٩. بڵاوکراوە لە وێب سایتی www.abtassoc.com

١٢٠. بەرێوەبەری نەخۆشخانە، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ١٤ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٢١. USAID، "یەکێتی پەرستارانی عێراقی بەخششی ئەمریکیان پێ دەگات"، راگەیاندنی رۆژنامەوانی، ٢١ تەمووزی ٢٠٠٣ لەگەڵ USAID، "یارمەتی حکومەتی ئەمریکی بۆ کەرتی خزمەتگوزاری تەندروستی"، راگەیاندنی رۆژنامەوانی، ٢٨ حوزەیرانی ٢٠٠٣.

١٢٢. سەنتەری سەلامەتی گشتی، "سەربووردەی دەزگای Abt" دەسکەوتەکانی شەر، بڵاوکراوە لە: www.publicintegrity.org/wow/bio.aspx

١٢٣. Saffar interview. Op. cit

١٢٤. یەعروب ئەلشیرەیدا، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ١٤ نیسانی ٢٠٠٤.

١٢٥. حەسەن راوی، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ١٤ نیسانی ٢٠٠٤.

١٢٦. دکتۆر قورەیش ئەلقەیسەر، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ١٥ نیسانی ٢٠٠٤.

١٢٧. هەیسەم حەدادین، "بانکی بازرگانی عێراقی ٢,٤ ملیار دۆلاری پێ دەگات وەکو گەرەنتی هەناردەکان"، رۆیتەرز، ٢٤ کانوونی دووەم ٢٠٠٤.

١٢٨. میتش جیسێریتش، "ئیمپراتۆری کاره بانکیەکان"، کۆرپ وۆتش، ٤ شوباتی ٢٠٠٤، بلاّوکراوە لە:corpwatch.org/article.php

١٢٩. کریسپیان بالمەر، " Rome Accord on Iraqi Loans Set to Help Trade " رۆیتەرز، ٥ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٣٠. بلاّوکراوە لە وێب سایتی سەنتەری سەلامەتی گشتی لە: www.public-i.org/bop٢٠٠٤/candidate.aspx

١٣١. گرێگ گارسیا، " J.P Morgan. Bank One Announce Board Slate." رۆیتەرز، ٢ ئایاری ٢٠٠٣.

١٣٢. Jesrich. op.cit.

١٣٣. کۆمپانیاکانی بیمە پەیرەوەی لە سیاسەتی کۆیلایەتی دەکەن: جۆرەها دۆکیۆمێنتی تایبەت بە کۆمپانیا مۆدێرنەکان بۆ کۆیلایەتی ئەنتیبێلێۆم، جەیمس کۆکس، یو ئێس تودەی، ٢١ شوباتی ٢٠٠٢.

١٣٤. بەڕێوەبەرایەتی ئەرشیف و تۆمارەکانی نەتەوەیی ئەمریکی، ئاشکراکردنی هەزاران دۆکیومێنتی هەوالگری پەیوەست بە تاوانەکانی نازیەکان، ١٣ ئایاری ٢٠٠٤.

١٣٥. کولومانی ئیت ئال، راگەیاندنێك لەلایەن کۆهێن، مایستان، هاوسفێلد و تۆل، ١٢ تشرینی دووەمی ٢٠٠٢.

١٣٦. زانکۆی کالیفۆرنیا، "بانکەکانو کۆمپانیا یاساییەکان گرنگیەکی زۆریان هەبوو لە ئەنجامدانی ساختەکاریەکان ئەمنی لە ئینرۆن،" راگەیاندنی رۆژنامەوانی، ٨ نیسانی ٢٠٠٢.

١٣٧. ساندیا دیمێلۆ، "کارگەکانی IFC لە رکابەرکێی لە عێراقدا لە حوزەیران،" خەلیج تایمز، ١٤ ئادای ٢٠٠٤.

١٣٨. ئەدریان گۆتۆو کلایتۆن هێرست، "دەسکەوتەکانی بارۆنەکانی بەغدا،" ئیندیپێندت، ٨ شوباتی ٢٠٠٤.

١٣٩. لاورا رۆزان، "دۆستە ناوۆیەکان: بەلێندەرە ئەمریکیەکان لە عێراق یارمەتی دارایی ئەلقاعیدە دەکەن لە عێراق،" نەیشن، ٢٥ تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٤٠. دەیڤد بەیکەر، "رێگا کورتەکەی عێراق پاڵەوانێتی بەکتلە: لاڕێیەکە یەکەم پرۆژەی تەواوکراوە لە شارۆچکەی وۆر-تۆرن،" سان فرانسیسکۆ کرۆنیکل، ٢٢ تەمموزی ٢٠٠٣.

١٤١. چاودێری داهاتی عێراق، " کۆنترۆڵکردنی ئاسمانی عێراق: نهێنیەکانی راگرتنی فرۆشتنی هێڵی ئاسمان،" پەیمانگای کۆمەڵگای کراوە، ئاداری ٢٠٠٤.

١٤٢. بلاوکراوە لە وێب سایتی کوبە: www.kubba-group.com

١٤٣. Gatton and Hirst. op.cit.

١٤٤. رۆلا خەلەف، "پاڵپشتیکردنێکی ریشەیی نۆرینگە نەشتەرگەریەکانی عێراق، ئاڕاستەکردنی دەنگدان،" فاینەنشیەڵ تایمز"، ٢٠ ئایاری ٢٠٠٤.

١٤٥. مان بەهادور گەرەنگ، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ٨ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٤٦. مانیرام گەرەنگ، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ٢ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٤٧. موحەممەد ئەلحوسەنی، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ٢ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٤٨. پاسەوانە ئەمنیەکان، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ٢ نیسانی ٢٠٠٤.

١٤٩. بینین لەلایەن نووسەر، ١٤ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٥٠. کۆلین فریمان، "کوژرانی پاسەوانێکی ئەمنی بەریتانی لە

عێراق،" سکۆتسمان، ٢٩ ئاداری ٢٠٠٤

١٥١. کەمی کار وا لەسەربازە دێرینەکان دەکات بۆ وەکو چەتە لە عێراق کاربکەن،" هیندۆ، ٦ نیسانی ٢٠٠٤.

١٥٢. "ئەرکی ژیانی ریتاندرا،" سەندەی پیپڵ، ١٤ ئەیلولی ٢٠٠٣.

١٥٣. کریستیان جێنینگز، "هێزە تایبەتیەکان دەست لەکار دەکێشنەوە بۆ سوودمەندبوون لە عێراق،" سکۆتسمان، ٢١ شوباتی ٢٠٠٤.

١٥٤. ئێریك شمیت، "دانانی پلان بۆ سیاسەت لە عێراق،" نیویۆرك تایمز، ٩ نیسانی ٢٠٠٣.

١٥٥. هۆمە نیومان، چاوپێکەون لەلایەن نوسەر، ٧ نیسانی ٢٠٠٣.

١٥٦. تشاك ویلکینز، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ٧ نیسانی ٢٠٠٣.

١٥٧. دەسەڵاتی کاتەکی هاوپەیمانەکان، وێب سایتی دەستەبژێرکردنی دەزگای جێبەجێکردنی گفتوگۆکان، ١٧ نیسانی ٢٠٠٣. بڵاوکراوە لە:
iraqcoalition.org/economy/PMO/excutive_Agency_Discussions.htm

١٥٨. مارك فاین مان، "بەتایبەتکردنی سوپا لەسەر شێوازی هارمس،" لۆس ئەنجلس تایم، ٢٤ کانوونی دووەمی ٢٠٠٣.

١٥٩. دان بوام، "ئەو چەکە بۆ کرێیە،" وایەرد، شوباتی ٢٠٠٣.

١٦٠. کۆمپانیای زانستەکانی کۆمپیوتەر، "کۆمپانیای زانستەکانی کۆمپیوتەر تەواوکردنی دەسهاتەکانی دایان کۆرپ،" راگەیاندنی رۆژنامەوانی، ٧ ئاداری ٢٠٠٣.

١٦١. Baum. op. cit

١٦٢. Baum. op. cit

١٦٣. کێڵی پاتریشا ئۆمێلا، "ئابڕوو چوونی دایان کۆرپ،" ئینسایت، ١٤ کانوونی دووەمی ٢٠٠٢.

١٦٤. تاکەر کارلسۆن، "چەکە بەکرێگیراوەکان" ئیسکوایەر، ئاداری

.٢٠٠٤

١٦٥. Ibid

١٦٦. پاوڵ دایکس، "گێژەڵۆکەی بیابان: چۆن ئیدانەکردنی تیرۆری ئولستەری سکوادی لە عێراق پیشەیەکی ئەمنی دەست کەوتووە؟" بەلفاست تەلەگراف، ٥ شوباتی ٢٠٠٤.

١٦٧. Carlson. op.cit.

١٦٨. رۆی وێنزڵ، "دوو لە وێنتشیستەکان تەوژمی ئاژاوەی عێراق دەبینن،" ویتشیتا ئیگل، ١٥نیسانی ٢٠٠٤.

١٦٩. وەلامێکی ئیمایلی دەربارەی بەڵێندەرێکی تایبەتی سوپا، لیستی خزمەتکردن کە لەلایەن دەزگای ئۆپێراسیۆنەکانی ئاشتی نێودەوڵەتی.

١٧٠. دەسار ئەلخەشاب، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ٨ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٧١. مامەند کەسنەزانی، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ٢ نیسانی ٢٠٠٤.

١٧٢. ئارۆن گلانتز، "گەشانەوەی چەتەیی لە عێراق، گرژی لە ناوەو لە دەرەوەی وڵات دروست دەکات،" کۆرپ وۆتش، ٢٣ ئاداری ٢٠٠٤. کە لە وێب سایتی کۆرپ وۆتش لەبەردەست دایە: www.corpwatch.org/article.php

١٧٣. WACAM ئەرکی دۆزینەوەی راستی بۆ کەرتی رۆژئاوای واسا لە هەرێمی رۆژئاوای غانا لە ١٩٩٩، بلاوکراوەتەوە لە وێب سایتی WACAM: www.nodirtygold/sansu_ghana.cfm.

١٧٤. گرەیم هۆسکین، ئیلایز جاکۆبس و ترایسی ل گۆڵدستۆن، "کوژرانی پیاوێکی پریتۆری لە عێراق،" هەواڵەکانی پریتۆریا، ٢٩ کانوونی دووەمی ٢٠٠٤، لەگەڵ بێوریگارد ترۆمپ، "چەکی ئەفریقیای

باشووری بەکرێگیراو بۆ عێراق،" سەندای تایمز، ٤ شوباتی ٢٠٠٤.

١٧٥. جولیان رادی مێر، "بریندار بوونی ڤلاکپلاس هانتشمان لە عێراق،" ٢١ ئاداری ٢٠٠٤.

١٧٦. جولیان رادی مێر، "قوربانیەکی عێراقی کە بکوژێکی نهێنی سەر بە ئەپارتایت بوو،" سەندای تایمز، ١٨ نیسانی ٢٠٠٤.

١٧٧. " Lucrative Pay Lures Cream of SA Cops to Iraq،" سەندای ئیندیپێندت، ٨ شوباتی ٢٠٠٤.

١٧٨. نات رۆیس، "دامەزراندنی کۆمپانیا لە رێی پەیوەندی،" نیوز دەی، ١٥ شوباتی ٢٠٠٤.

١٧٩. مات موور، "حاڵەتی هەڵگەڕانەوە دوای کوشتنی دوو ئەمریکی لەسەر دەستی پۆلیس،" ئاسیۆشیەتد پرێس، ١١ ئاداری ٢٠٠٤.

١٨٠. سەنتەری راگەیاندنی هێزەکانی هاوپەیمانەکان، " Fourth Infantry Division Soldiers Repal Automatic Weapons Attack،" راگەیاندنی رۆژنامەوانی، ٨ شوباتی ٢٠٠٤.

١٨١. ئاریانا ئیونج جەنگ تشا، "سەربازەکانی سوپای تازەی عێراقی جێدێڵن،" واشنتۆن پۆست، ١٣ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٨٢. Ibid

١٨٣. "ڤینێڵ سعودیەکان دەخاتە سەر لیستی خزمەتی سەربازەکان،" بیزنیس ویک، ٢٤ شوباتی ١٩٧٥.

١٨٤. کیم وێڵنسۆن، نیکۆلاس پرۆفێت و لیۆد نۆرمان، "عەرەبستانی سعودی: ئەو چەکە بۆ کرێیە،" نیوز ویک، ٢٤ شوباتی ١٩٧٥.

١٨٥. جۆن بێرنز، "راپۆرتی رێکەوتن دەربارەی گەشتی برێمەر بۆ موسڵ، "نیویۆرك تایمز، ١ نیسانی ٢٠٠٤، لەگەڵ جەیمس داو، "کۆمپانیای ئەمنی دەچێتە هێڵی پێشەوە،" نیویۆرك تایمز، ٢ نیسانی ٢٠٠٤.

١٨٦. کریستین شارن بێرگ و مایك دۆرنینگ، "توندو تیژی لە عێراق دەبێتە هۆی گەشانەوەی کار،" تشیکاگۆ تربیون، ٢ نیسانی ٢٠٠٤، لەگەڵ باری یۆومان، "سەربازەکانی سمانێکی باش،" مازەر جۆنز، ئایار/ حوزەیرانی ٢٠٠٣.

١٨٧. جەیمز سۆنگ، "مردنی مەدەنیەك، کارەسات و هەڵگەڕانەوەی لێدەکەوێتەوە لە هاوای،" ئاسیۆشیەتد پرێس، ٣ نیسانی ٢٠٠٤.

١٨٨. رۆد نۆردنلاند، "راپەڕینی عێراق،" نیوز ویك (تەنیا لە وێب سایت)، ١٢ نیسانی ٢٠٠٤. بلاوکراوە لە وێب سایتی: .msnbc.msn.com/id/٤٧١٠١٧٦

١٨٩. جۆناسان فرانکلین، "بەڵێندەری ئەمریکی بۆ بەکارخستنی چەکدار لە تشیلی،" گاردیان، ٥ ئاداری ٢٠٠٤.

١٩٠. دانا پریست، "پاسەوانی تایبەتی بەرگری هێرشی سەر بنکەی سەرەکی ئەمریکا دەکات،" واشنتۆن پۆست، ٦ نیسانی ٢٠٠٤.

١٩١. ئێدوارد ۆنگ، "میلیشیا عێراقیەکان بەرگری فشارەکانی ئەمریکا دەکەن لە هەڵوەشاندنەوە،" نیویۆرك تایمز، ٩ شوباتی ٢٠٠٤.

١٩٢. نیکۆلاس پاڵهێم، "گروپەکانی رەوەندە پێشوەکانی رکابەر، رووبەڕوی حاڵەتی ئەمنی دەبنەوە لە عێراق،"فاینەنشیاڵ تایمز، ١٢ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

١٩٣. Wong. op.cit

١٩٤. دانا پریست و ماری پات فلاهێرتی، "کۆمپانیا ئەمنیەکان گەورەترین سوپا لە جیهاندا پێك دێنن،" واشنتۆن پۆست، ٨ نیسانی ٢٠٠٤.

١٩٥. جۆن هوپەرو نیك پاتۆن واڵش، "دەرکەوتنی وێنەیەکی ترسێنەر لە فلیمێکی ڤیدیۆیی کوشتنی بارمتەیەکی ئیتاڵی" گاردیان، ١٥

نیسانی ٢٠٠٤.

١٩٦. "کۆمپانیـایێکی رۆمـانی دوای هێرشـکردنه سـەری لـه عێـراق دەکشێتەوە،" رۆیتەرز، ٢١ نیسانی ٢٠٠٤.

١٩٧. مـەیجۆر گـاری تۆڵمـان، چـاوپێکەوتن لەلایـەن نووسـەر، ٧ حوزەیرانی ٢٠٠٤.

١٩٨. مولازمی کۆلۆنێل، ئالان براون، چاوپێکەوتن لەلایـەن نووسـەر، ٧ حوزەیرانی ٢٠٠٤.

١٩٩. بـــلاّو کـــراوه لــــه وێــــب ســــایتی GAO: www.gao.gov/decision/docket/(file number:B-٢٩٤٢٣٢,٠٠١)

٢٠٠. پیتـەر سـینگەر، "بیناکـەرەوەکانی ولاّتو رکابـەری کـەمتر لـه عێراق،" نیویۆرك تایمز، ١٥ حوزەیران ٢٠٠٤.

٢٠١. دۆگ برۆکس، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ٣ حوزەیرانی ٢٠٠٤.

٢٠٢. تـیم سپایـسەر، ئـەن یونۆسـۆدۆکس سـۆلجەر، (ڤێرمۆنـت: چوارگۆشەی ترافالگار،٢٠٠٠).

٢٠٣. مـاری لـویس ئۆکالاگـان، ئێنێمـیس ویـزن، پـاپوا گینیـای تـازە، ئوسـتورالیا و ساندلاین کرایـسیس: ئینـساید سـتۆری، (سـیدنی: دەبـڵ دەی ١٩٩٩)

٢٠٤. دەیڤد ئیزنبێرگ، چاوپێکەوتن لەلایەن نووەر، ئایاری ٢٠٠٤.

٢٠٥. جۆن داوفێتری، "کەمکردنەوەی دارایی سوپا لەبەر پـەیمانگاکانی هــەوالگری؟ worldnetday.com، ٣٠ کــانوونی دووەمــی ٢٠٠٢. بلاّوکراوە لە:worldnet-daily.com/news/article.asp

٢٠٦. مێــژووی کۆمپانیــای CACI لەســەر وێــب ســایتەکەی: www.caci.com/about/history/timeline.htm

٢٠٧. CACI. "CACI کـۆنتراکتی ئـەرکی پاڵپـشتیکردنی لەگـەڵ

سەرکردایەتی هێزی ئاسمانی بەدەست هێنا"، راگەیاندنی رۆژنامەوانی، ٢٣ کانوونی دووەم ١٩٩٧.

٢٠٨. CACI At A Glance."caci Investor Update. February ٢٠٠٤

٢٠٩. "فەرمانبەرە بەرزەکان و بەڕێوەبەرەکانی CACI"، بلاوکراوە لە وێب سایتی CACI: www.caci.com/about/management.shtml

٢١٠. بنکەی زانیاریەکانی CACI. بلاوکراوە لە وێب سایتی CACI: www.cacirecruiting.caci.com/jobposting.nsf

٢١١. سکۆت شەین، "لێکۆڵەرەوەکان،" بالتیمۆر سن، ٧ ئایاری ٢٠٠٤.

٢١٢. تیتان، "تیتان بەشێکی گرێبەستیەکی بە بەهای ٢ ملیار دۆلار بردەوە بۆ تەکنەلۆژیاو پەیوەندیەکان، راگەیاندنی رۆژنامەوانی، ١٧ئەیلولی ٢٠٠٢.

٢١٣. تیتان، "سوپای ئەمریکیو سیستەمی کۆمپانیاکانی تیتان راگەیاندنێکی ئامادەکاری بۆ کیتنێکی پێشبینی کراو، کە تەواو دوای ٣٦٥ رۆژ لە وەرگرتنی گرێبەستیەکە گەێنرا،" راگەیاندنی رۆژنامەوانی، ١٢ حوزەیرانی ٢٠٠٢.

٢١٤. تیتان، "تیتان کۆنتراکتێك بە بەهای ١٨ ملیۆن دۆلار بۆ سەنتەری سیستەمی ئەلیکترۆنی هێزی ئاسمانی AWACS"، راگەیاندنی رۆژنامەوانی، ١٤ کانوونی دووەمی ٢٠٠٣.

٢١٥. تیتان، "تیتان کۆنتراکتێك بە بەهای ١٨ ملیۆن دۆلار بۆ گەمەی جەنگی دەریاوانی دەسەبەر دەکات،" راگەیاندنی رۆژنامەوانی، ١٤ کانوونی دووەمی ٢٠٠٣

٢١٦. رۆناڵد دی وایت، "بۆ تیتان، مردن لەبەر دەرگایە،" لۆس

ئـەنجلۆس تـایمز، ١٩ نیـسانی ٢٠٠٤ گرەەپـی یـاهوی ئـەفغانیات، ١١ حـوزەیرانی ٢٠٠٢، بلاّوکرایـەوە لـە:
groups.yahoo.com/group/afghanyat/message/٣٠٧
٣، لەگەڵ بلاّوکردنەوەی لە ویّب سایتی بارزان، رۆژنامەیەکی کوردی لە: www..barzan.com/upcoming_events٣٥.html

٢١٧. Afghanyat. op.cit

٢١٨. White. op.cit

٢١٩. "ئـەمریکا لـەدوای کوردەکـانی ناشـفێل دەگـەڕێت،" ئاسیۆشـەیتد پرێس، ١٢ کانوونی یەکەم ٢٠٠٣.

٢٢٠. White. op.cit

٢٢١. ماسیۆ هەی براون، "گرفتەکانی حاڵەتی ووردەکاری مـەدەنی بـۆ زیـادبوونی گومانـەکانی سـیخوڕی سـەربازی، وەکـو ئـەنجامێك بـۆ داپۆشـینی بەڵێنـدەرەکان،" ئۆرلانـدۆ سێنتینالّ، ١٢ تـشرینی یەکـەمی ٢٠٠٣.

٢٢٢. کاسرین پفلێگەر شاردەر، "CAI بەدوای بەڵێندەر دەگـەڕێت بـۆ لێکۆڵینەوە،" ئاسیۆشیەتد پرێس، ١٢ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٢٣. کۆلین فریمان، "عێراق: ناوچەی کەنداوی مەدەنی لـە عێـراق لـە ناو دەچێت،" سان فرانسیسکۆ کرۆنیکل، ١١ تشرینی دووەمی ٢٠٠٣.

٢٢٤. بـرادلی جـەی فـیکس، "کویّـت: کـوژرانی پیـاوێکی پـۆوەی، برینـداربوونی سـان دیگـانێکیش،" نـۆرس کـاونتی تـایمز، ٢٢ کـانوونی دووەمی ٢٠٠٣.

٢٢٥. تۆنی کاپاتشیۆ، " راگرتنی پێدانەکانی تیتان دوای گومان لەسـەر خەرجیەکانی لە عێراق،" Bloomberg.com ١٢ ئاداری ٢٠٠٤.

٢٢٦. چاوپێکەوتن لەگەڵ سەرچاوەکە لەلایەن نووسەر، ٦ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٢٧. ئاندی پاسزتۆرو جۆناسان کارپ، "پشکنینی پێدانە بیانیەکان بۆ

تیتان،" وۆڵ ستریت جۆرناڵ، ٢٢ ئاداری ٢٠٠٤.

٢٢٨. "شیکەرەوەکانی وۆڵ ستریت پێداچوونەوەی پەسەندکردنی ڕێکەوتنی یەکگرتنەوەی تیتان و لۆکهید دەکەن،"insidedefense.com، ٨ نیسانی ٢٠٠٤.

٢٢٩. ڕێنێ مێرل، "ئەمریکا لێکۆڵینەوە دەکات لە بەڵێندەری کۆمپانیای تیتان: قسەلۆکەکان سەبارەت بە بەرتیل ڕێکەوتەکە هەڵبوەشێنرێتەوە لەگەڵ لۆکهید،" واشنتۆن پۆست، ٦ ئاداری ٢٠٠٤.

٢٣٠. Pasztor and karp. op.cit

٢٣١. شەین هاریس، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣.

٢٣٢. شەین هاریس، "گرێبەستی تەندروستی عەقڵی پێنتاگۆن ڕەنگبێ لەلایەن فرۆشیارەکانەوە نووسرابێتەوە،" کارمەندێکی حکومی، ٣٠ تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣.

٢٣٣. مەیجەر ژەنەڕاڵ ئەنتۆنیۆ ئێم تاگوبا، "بەندی ٦-١٥ لێکۆڵینەوە لە ٨٠٠مین لیوای پۆلیس،" وەزارەتی بەرگری، شوباتی ٢٠٠٤. بڵاوکراوە لە: www.corpwatch.org/upload/document/taguba.pdf

٢٣٤. دۆگلاس جیلّ و ئێریك شمیت، "هەراسان و تاکتیکی تری فورسی پەیوەست بە هەواڵگری سەربازی،" نیویۆرك تایمز، ٢٢ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٣٥. جۆین برینگلی، "مەدەنییە ئەمریکییەکان لە ئەبوغرێبدا کاردەکەن، گومان لەسەر ڕۆڵیان لە پێشێلکارییەکان،" نیویۆرك تایمز، ٢٢ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٣٦. جولیان بۆرگەر، "ئەو چێشت لێنەرو شۆفێرانەی وەك لێکۆڵەرەوە کاردەکەن،" گاردیان، ٧ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٣٧. دەیڤد لی، "کێ سەرکردایەتی سەربازە تایبەتیەکان دەکات؟"

گاردیان، ١٧ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٣٨. Jehl and shmitt. op.cit

٢٣٩. Brinkly. op.cit، رۆبەرت تانەر،"مەدەنییەکان لە ئابڕووچوونی بەندیخانەکە مەسەلەکان دەدەخەن،" ئاسیۆشیەتد پرێس، ٢٢ ئایاری ٢٠٠٤، لەگەڵ مات کیلی، "وەرگێڕێکی مەدەنی ل ئەبوغرێب دەرکرا،" ئاسیۆشیەتد پرێس، ٢٣ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٤٠. جۆیل برینکلی، "لێکۆلینەوە لەگەڵ وەرگێڕێک لەلایەن سوپاوە سەبارەت بە پێشێلکاری،" نیویۆرک تایمز، ١٢ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٤١. ویلیام لاوسن، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، ١ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٤٢. CACI، "وەلامی CACI بۆ قسەلۆکەکانی میدیا سەبارەت بە کارمەندەکانی لە عێراق و سەبارەت بە بەرژەوەندی گروپە داراییەکانیش،" راگەیاندنی رۆژنامەوانی، ٥ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٤٣. ئادەم لیپتاك، "کێ ئەزموونی مەدەنیە ئەمریکیەکان دەکات؟ هیچ کەس لە عێراق، "نیویۆرک تایمز، ٢٦ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٤٤. سکۆت شەین، "رەنگبێ هەندێك لە بەڵێندەرە ئەمریکیەکانی بەندیخانەکان خۆیان لە تۆمەت لابدەن،" بالتیمۆر سەن، ٢٤ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٤٥. جۆیل برینکلی، "٢٠٠٠٠٠ کارمەند لە چاوەڕوانی مۆڵەتن بۆ کارکردن بۆ سوپا،" نیویۆرك تایمز، ١٢ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٤٦. کێن سیلڤەرستین، سەربازە تایبەتەکان، (نیویۆرك: ڤێرسۆ، ٢٠٠٠)

٢٤٧. لۆلیتا بالدۆر، "سیناتۆرەکان بەدوای لێکۆڵینەوەن لە کۆمپانیا تایبەتەکانی ئەمنی لە عێراق،" ئاسیۆشیەتد پرێس، ٢٩ نیسانی ٢٠٠٤.

٢٤٨. دۆگلاس جێل و جەین پرلێز، "دانانی ئەمریکا بۆ رەوەندەکان

لە پۆستە گرنگەکان،" نیویۆرك تایمز، ٢٦ نیسانی ٢٠٠٣.

٢٤٩. وەزارەتی بەرگری ئەمریکی، "راگەیاندنی دۆد، بۆ دیارترین بەڵێندەرەکان بۆ ساڵی دارایی ٢٠٠٤، راگەیاندنی رۆژنامەوانی ژمارە: ٠٩٨-٠٤، ١١ شوباتی ٢٠٠٤.

٢٥٠. پاوڵ کەیلا، "لە کۆمپانیای سیخوڕەکان،" بیزنس ٢,٠، ئایاری ٢٠٠٣.

٢٥١. SAIC"،SAIC لە پلەی ٣٠٠ـەمین دێت لە نێو خاوەن بەرزترین داهاتەکانی کار،" بڵاوکراوەیە لە: www.saic.com/cover-archive/٥٠٠.html لەگەڵ راپۆرتی سالانەی SAIC، ٢٠٠٣، www.saic.com/news/annaul.html

٢٥٢. kaihla. op. cit

٢٥٣. kaihla. op. cit

٢٥٤. بەکتل، "SAIC گردبوونەوە دەکات بۆ بردنەوەی گرێبەستی DoE،" راگەیاندنی رۆژنامەوانی، ١٤ تشرینی دووەمی ٢٠٠٠، سکۆت شەین، "ئەمریکا SAIC داناوە بۆ ئەرکە گرنگەکان،" بالتیمۆر سەن، ٢٦ تشرینی دووەمی ٢٠٠٣، لەگەڵ بۆنی عەزەب، "ئەوان بۆچی ئاشکرا نین؟ ئەندامێکی بۆردی کۆمپانیاکە، ئەیلول/تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢.

٢٥٥. Shane. op. cit

٢٥٦. زەینەب عبدالحمید، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

٢٥٧. برۆس ڤی بایگێلۆ، "راپۆرتێک رۆڵی SAIC ئاشکرا دەکات لە گرێبەستیەکانی عێراق،" سان دیاگۆ یونیەن تریبیۆن، ٢٥ ئاداری ٢٠٠٤.

٢٥٨. جینین هێربست، "SAIC لە چاودێریکردنی بۆ ئۆلۆمپیادی ئەسینا،" واشنتۆن بزنس جۆرناڵ، ٢٢ ئایاری ٢٠٠٣.

٢٥٩. SAIC، "ئاسایشی نەتەوەیی. کۆنترۆڵکردن/ پێشەوایەتی،" بڵاوکراوە لە: www.saic.com/natsec/dominance.html.

٢٦٠. کاترین داون هاوەر و جیم لۆب، "ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست: بینەو بەردەی میدیاکان لەمەڕ گرێبەستیەکانی سوپا،" خزمەتگوزاری ئینتەر پرێس، ١٦ ئابی ٢٠٠٣.

٢٦١. دۆن نۆرس، "عێراق: هەرەسهێنانی پرۆژە، هەواڵی چۆنیەتی خراپ بوونی شتەکان،" تەلەفزیۆنی هەفتە، ١٥ کانوونی دووەمی ٢٠٠٣.

٢٦٢. کاسلین ماکاول، "تۆڕی ڕاگەیاندنی عێراقی،" بەغدا بولتین، ٢١ تەمووزی ٢٠٠٣.

٢٦٣. Ibid

٢٦٤. علائ فایق، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر، کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.

٢٦٥. Bigelow. op.cit

٢٦٦. واڵتەر پینکۆس، "کۆمپانیایەکی ئەمریکی بۆ بەڕێوەبردنی تەلەفزیۆنی عێراقی، کۆمپانیای هاریس. هەروەها بۆ وەگەڕخستنی ڕۆژنامەی نیشتمانی،" واشنتۆن پۆست، ١٢ کانوونی دووەمی ٢٠٠٤.

٢٦٧. Ibid

٢٦٨. نانسی سنۆ، "ئەلحورە ئەل کێ؟ ئێمە ئازادین، ئەوا نا" ئۆدوێرس PR Daily، ٩ ئاداری ٢٠٠٤.

٢٦٩. Ibid

٢٧٠. دۆگلاس جێل، "ئەمریکا پشتگیری گەڕانەوەی ڕەوەندەکانی دەکرد بۆ دووبارە دروستکردنەوەی نیشتمان، نیویۆرك تایمز، ٤ ئایاری ٢٠٠٤.

٢٧١. ئەندامی IRDC، چاوپێکەوتن لەلایەن نووسەر کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣ و نیسانی ٢٠٠٤.

